ناوی کتێب: عەرووزی کوردی
دانانی: نوری فارس حەمەخان
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٢٨٥
دەرهێنانی هونەری: حاجی دلاوەر
بەرگ: ئاراس ئەکرەم
پیت لێدان: تریسکە ئەحمەد حەمید
هەڵەگری: دانەر
سەرپەرشتیی کاری چاپخانە: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٤
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (١١٧)ی ساڵی ٢٠٠٤ی دراوەتێ

ئەی شاعیری کورد!

بزانە:

١- گرنگ ئەوە نییە کە عەرووز بزانیت.

٢- گرنگ ئەوەیە کە بزانی چۆن عەرووز لە شیعری کوردیدا پیادە دەکرێ و شیعری کوردی بەپێی عەرووز دادەڕێژرێ.

## تێبینییەک

١- یاسایەکی ئوصولی دەڵێ: (هەرشیکردنەوە و ڕا جیایی و ڕا دەربڕین و ڕوونکردنەوەی هۆی ناونان و فەرەزبیە عەقڵییەک، هەروا شتی تری لەم بابەتە، کە لەناو کتێبانا زۆر زۆرە، بەتایبەت لەناو شەرحەکانا، هەر شتێ لەمانە کە نەبێ بەهۆی دروستبوونی بابەتێکی فیقهی و عەمەل و کاری لەسەر دانەمەزرێ، ئەوە لە ئوصولی فیقە نییە، باس لێکردنی لە دانراوە ئوصولییەکاندا، بۆ بۆنە و زیادە سوودی ترە، کە گەلێ جار دەبن بەهۆی فامی تەواوی بابەتەکە).

جا لە ڕاستیدا ئەمە لە گشت زانست و هونەرێکا هەر وایە، تەنانەت لە زانستە غەیرە ئەدەبییەکانیشدا ئەمە هەیە. لە زانستی عەرووزیشدا، کە قسە لەم جۆرە لایەنە لاوەکییانە دەکرێ لەبەر هەمان هۆ و بایستە. کەواتە: سوودی شتی وا، لە پلەی یەکەما بۆ پسپۆڕانی ئەم زانستەیە، تا بتوانن لە کاکڵەی مەبەستەکە تێبگەن و بەرەو پێشتر بیبەن، دەنا سوودێکی ئەوتۆی بۆ هەستیاران نییە.

ئەوەندە هەیە زۆرینەی دانەران لە هەموو بابەتێکا، ئەو کەسانەن کە حەزیان لە بابەتەکە هەیە بەسروشت، واتە: کێشناس، لە سەرەتاوە ئەشقی هۆنراو ڕۆنان، پاڵی پێوە دەنێ، بۆ فێربوونی کێش و سەروا و زانستەکەیان.

٢- بەڵام بەندە زۆر خۆم بەچۆنێتیی سیستەمی شیعر ڕۆنانی گەلانی تری جیهانەوە خەریک ناکەم، چونکە شتی وا گەرچی بێ کەڵک نییە، بەڵام سەر لە هەستیاری تازە نەفەس تێکدەدا. مەبەستی سەرەکی منیش دوو شتی جەوهەرییە:

١- فێرکردنی هەستیارانی کورد و خەمخۆرانی ئەدەب و وێژە و مێژووی کورد، کە چۆن چۆنی لە ئەرکەکانیانا هانا بۆ کێشناسی ببەن.

٢- عەرووز هونەرێکی زۆر سەخت و گرانە، هاکا لەبەر کزی بازاڕی ئەدەبی، عەرووززان قڕیان تێکەوت. جا ئەگەر کتێبێکی عومدە لەم بابەتە هەبێ، زوو یا درەنگ ئەم زانستە برەو و فرۆخت پەیدا دەکاتەوە، چونکە شتی چاک وەک زێڕی ساخی نایاب وایە، هەزاران ساڵ لەژێر خاکا بێ، هەر کاتێ هاتەوە مەیدان لە یەکەم ڕۆژی جوانتر دەبێ و دێرینییەکەی بەهای گرانتر دەکا.

٣- لە هەندێ شوێنا دووبارەوە بوون هەیە، ئەمە وایە، بەڵام بێ سوود نابێ، چونکە

مەبەست کار ئاسانکردنە بۆ خوێنەران، کە ئەوەندە نەگەڕێن بۆ بابەتەکان، چونکە دوور نییە کە ئەم پەڕاوە لە چەند بەرگێکا چاپ بکرێ، دەی تاوتووی ئەم بەرگ و ئەو بەرگیش زۆر خۆش و باش نییە.

دانەر

بِسْمِ اللّهِ الَّرحْمنِ الَّرحيم
٢٠٠٠/١٢/٢٣

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خودای گەورە و میهرەبان، صەلات و سەلام و درووودی بۆندار، بباریێ بەهەزار هەزار، بۆ سەر گیانی پێغەمبەری خۆشەویست و نازدار، هەروا بۆ سەر گیانی هاوەڵان و هاوسەران و کەسوکاری و پەیڕەوانی و هەموو بەندەیەکی باشی خودا لە زەمین و ئاسمان، پاش ئەمە عەرزم ئەمەیە:

مەبەست لەم پەڕاوە ئەمەیە، کە کوردی خۆیشمان، سوود و بەهرە لەم زانستە گرنگە بەئاسانی وەربگرێ، بەتایبەتی شاعیرە لاوەکانمان، کە بەئاسانی ناتوانن سوود لە سەرچاوە عەرەبی و فارسی و تورکییەکانی ئەم زانستە سەختە وەربگرن، مەبەستم ئەوە نییە کە بەس یاسای پەسەندی هەڵبژاردە باس بکەم، وەک عەرووززانە پێشینەکان وایان دەکرد، بەڵکو مەبەستی سەرەکیم خزمەتی ئەدەبیاتی کوردییە، فرەوانکردنی بازنەی شیعری کوردییە، لەم ڕوانگەیەوەیە، کە هەتا دەست بدا نموونە بەشیعری شاکاری شاعیرە کوردەکان دەهێنمەوە.

## عەرووزی کوردی

ئەمڕۆ - لە سایەی خودای گەورەوە - بزاڤی ڕۆشنبیری کوردی لە گەشەدایە. ئەو کوردانەی کە دەستیان قەڵەم دەگرێ و، هەستی پیرۆزی نەتەوایەتییان تیادا ماوە، هەڵمەتێکی گەورەیان سازداوە، بەمەبەستی پێشخستنی زمان و ئەدەب و وێژەی کوردی، هەر نووسەرەی بەپێی توانای سنوورداری خۆی، خەریکی خزمەتە. بەندەیش لەم بوارەدا حەزم لە خزمەتی بێ منەتە، سا بەڵکو لە پەناوە بەبێ ورووژاندنی کەسێ، بەهێمنی خزمەتێکی جوان پێشکەش بەنامەخانەی ئاوەدانی کوردی بکەم. تەنیا ئاواتیشم لەم لایەنەوە ئەوەیە کە خودای گەورە ڕەنجەڕۆم نەکا و یاریدەم بدا و بەرەحمەتی خۆی ئەم کتێبەم بۆ پەخش بکاتەوە و سوودی پێ بگەیەنێ بەعەلاقەمەندان و بیکا بەمایەی ناوی جوان و خێر و خۆشی هەردوو جیهانمان. ئامین.

باش وایە مرۆڤ لە چیدا شارەزایی هەبێ لەو بوارەدا خەریکی خزمەت بێ، تا خزمەتەکەی بێ گەرد بێ، بەتایبەتی بوارێ کە پەیوەندی بەدین و دنیاوە هەبێ، وەک کێشزانی کە پەیوەندییەکی زۆری بەنەظمی قورئانی پیرۆزەوە هەیە، چونکە لە ڕێگەی

عەرووزەوە دەزانرێ کە قورئان شیعر نییە و قسەی شاعیر نییە، دەی سەلماندنی ئەم ڕاستییە مەبەستێکی گرنگی ئایینییە.

وەکی تریش هەموو دەزانین کە شیعر برپڕاگەی وێژە و ئەدەبیاتە، وە ئەدەبیاتیش - بەپەخشان و بەهۆنراوەیەوە - دوو چاوی ڕۆشنی هەموو گەلێکن. جا لەم ڕوانگەیەوە بەندە ئەم خاڵانە دەخەمە بەرچاوی دڵسۆزان و دۆستانی زمانی شیرینی کوردی، هەتا لە گرنگی و بایەخی زانستی کێش و کێشزانی بەباشی حاڵی ببین، هەتا بایەخی تەواوی پێ بدرێ، وە دوای ئەو قسە پووچەڵە نەکەون کە دەڵێ: (گوایە سەردەمی کێش و سەروا بەسەرچوو):

١- ئەمەی ئەمڕۆ پێی دەگوترێ: شیعر، زۆربەی لە بزرکانی دەروێش دەکا، نەک لە شیعری ڕاستەقینە. ڕەنگبێ پەخشانێکی هونەری بێ لە چەشنی مەقاماتی حەریری و مەقاماتی هەمەدانی، بەڵام وا جوان و ڕەنگین نا، چونکە ئەوان هەر هیچ نەبێ سەجع و ڕەوانبێژییەکی جوانیان وا تیادا.

٢- ئەدەبی کۆنی کوردی، چ شیعری، چ پەخشانی، بەڕێنووسی فارسی کۆن نووسراوە، بەڵام وەک فارسی گرنگی پێ نەدراوە، هەتا کۆنتڕۆڵی شێوەی ڕاستەقینەی وشە بکرێ.

٣- کاتێ کەسانی ناپسپۆڕ بەڕێنووسی نوێ نووسیویانەتەوە بەهەڵە نووسیویانەتەوە، ئیتر بەبێ شومار هەڵەی زمانەوانی و ڕێزمانی و ڕێنووسی زۆر، لەناو دەقە کۆنە کوردییەکاندا دروست بووە، وە هەتا ئێستەیش لەم ڕووەوە، ئەم جۆرە هەڵانە هەر لە زۆربوونن. ئەم لایەنەیە کە پاڵی بەمامۆستا محەمەدی مەلا عەبدولکەریمەوە ناوە کە پەراوێکی گەورە سەبارەت بەساخکردنەوەی دیوانی حاجی قادری کۆیی دابنێ.

٤- خۆرهەڵاتناسەکان زۆر لە شیعری کۆنیان لە ڕێگەی زانستی کێشەوە ساخ کردۆتەوە، چونکە وشە لە شیعردا هەڵە قەبووڵ ناکات، کەواتە زۆر لەو بەناو نوسخانەی کە لە پەراوێزی دیوانە کوردییەکاندا، لە لایەنی چاپکارانی ناشارەزاوە تۆمار کراون و بەپێچەوانەی دەستوورەکانی کێشزانین، هەموویان بێ بایەخ و پووچەڵن، چونکە پێوەری کێش بەزێنن.

٥- وەکی تریش شیعر جەوهەری ئەدەبە، گیانی ئەمری کەلتووری نەتەوایەتییە، دیوانی هەموو گەلێکە، ئاوێنەی پلەی ڕۆشنبیری هەموو نەتەوەیەکە، تۆمارگەی ڕابووردوویەتی، نوێنەری پلەی ڕۆشنبیری هەموو سەردەمێکیتی.

٦- بەڵام ئەم جۆرە شیعرە نەمرە، دەبێ بەواتەی وشە شیعر بێ، نەوەک گەڕەلاوژێ و پیت ڕیزکردن و هاتوهاوار و بەس. ڕاستە شاعیری بەهرەیە، نەک پیشە و خۆپیاهەڵواسین، ڕاستە کە لێوی شاعیری بەسروشت شاعیر مەقەستە، بەڵام شیعری ڕاستەقینە، بەبێ ئەم عونصورانە دروست نابێ:

آ- جوانیی واتا، بەرزیی مەبەست، ئەندێشەی قووڵ.

ب- ناسکی وشەکانی، نازداری بێژەکانی، ڕەوانی ڕستەکانی.

ج- دەی جۆشدانی ئەم دوو خاڵە پێکەوە، وەک جۆشدانی گیان لەگەڵ لەشدا، یا وەک بەرگی جوان لەبەر بووکی جواندا، ئا ئەمە ئیشی کێشە، ئەمە کاری عەرووزە.

٧- بەعەرووز دەگوترێ: (قُیودُ زِینَة) لە ڕاستیدا خۆشی وایە، لە گشت زمانێکا شیعری قەبە قەبەی زەبەلاح دەبینی، بەهۆی دەبدەبەی کێشەکەیەوە، لە تۆ وایە لوتکەی قەندیلە، کەچی کە ڕووتی دەکەیتەوە لە کێشەکەی، دەڵێی بووکەڵە دارینەی ڕەقوتەقی ڕووتەوە کراوە!

کەسێ بەسەرنجەوە تەماشای موعەللەقاتی سەبعە و دیوانی نالی و مەحوی و حەریق و سەعدی و حافظ و شەوقی و جەواهیری و کەڵە شاعیرەکانی تر بکا، ئەم ڕاستییەی بۆ ڕوون دەبێتەوە: گەرچی ئەم شاکارانە پڕن لە هونەر و داهێنان و واتای جوان جوان و، هەستی ناسک و ئەدەبی بێ مانەند، وە بەدانایانە و وەستایانە خەیاڵ لەگەڵ ڕووداودا ئامێتە کراوە، بەشێوەیێ هەست دەهەژێنن و دڵ دەلاوێنن، بەڵام لە هەمان کاتا کەم و بێشێ، شیعری بێ ناوکیشیان وا تیادا، کە تەنیا دەبدەبەی کێشەکەیان کردوونی بەشیعری نەمری تەلیسماوی، واتە: هەڵبەستن، شیعر نین، بەڵام عەرووز و ئاواز و مۆسیقای پڕ تاموچێژی کێشەکەیان کاڵای ڕازاوەی شیعری لەبەر کردوون!

٨- لە ڕاستیدا هەروەک چۆن نووسەری چاک، ئەدیبی گەورە، بەبێ شارەزا بوون لە زانستەکانی نەحو و صەرف (وشەسازی) و ڕەوانبێژی و زمانەوانی و ڕێزمان و ڕێنووس... تاد، نابێ بەنووسەری داهێنەر، شاعیریش بەبێ فێربوونی زانستی کێش و سەروا نابێ بەشاعیری تەواو!

٩- عەرووز هونەرێکی زۆر گرانە، فێربوونی مێشک دەکاتەوە، زاخاوی هۆش و مێشک دەداتەوە، خۆی لە خۆیدا مرۆڤ هۆشیار دەکاتەوە، کورت و پوخت: عەرووز گوێی مۆسیقی شاعیرە. بەلای شاعیرانەوە ئەم بڕیارە دروستە:

## نابی بەشـــاعـــیـــر تا بەرەوانی
## زانستی کێشی هەڵبەست نەزانی!

١٠- لە ڕاستیدا پیادەکردنی عەرووز، لە کوردی و فارسی و تورکیدا، دەقاودەق وەک عـەرەبی، شـتـی وا لە سـەددا نەوەدی کـاری نەکـردە نیـیـە، بەڵکو دەبێ بەتەرهیم و چاولێـخـشـان و بەبەکـارهێنانی زۆر زۆری ناچارییـەکـانی کـێش و ئەم جـۆرە هەوڵ و تەقەلایانە، شیعری کوردی و فارسی و شیعری گەلە موسوڵمانەکانی تر، بخرێنە قاڵبی عەرووزی عەرەبییەوە، بگرە جاروبار بەزۆرەملێش ئەمە ئەنجام دراوە. کەواتە ئەو گوتەیە ڕاستە کە دەڵێ: عەرووزی عەرەبی بەکوتومتی، لە شیعری کوردیدا ئەستەمە پیادە بکرێ.

جـا وا پاش ئەم ڕوونکردنەوەیە دەڵێم: گـەرچی من لەم بوارەدا، نە پێـشـەنگم و نە پـسـپۆڕی تەواو، وەلێ لەمـێـژەوە کـۆمـەڵێ زانیـاری چاکم کـۆکـردۆتەوە، زۆربەیان زادەی بەراووردی خۆمن، بەڵام بەبێ گومان سەرچاوەی ساخکردنەوەکانم لە دەقی شیعری شاعیرە گەورەکان وەرگیراون، لەگەڵ هەندێ ڕوونکردنەوەی نووسەرە نوێکان.

بایەخێکی تەواوم بەو لایەنە داوە، کە شاعیرە گەورە پێشینەکانمان چۆن چۆنی عەرووزی شیعـری عـەرەبییـان لە شیـعـرە کـوردییەکانی دیوانەکانی خۆیاندا پیادە کردووە، وە زۆر بەباشی ڕوونم کردۆتەوە کە تەفعیلە - واتە: پێ - لە شیعری کوردیدا چۆن دروست دەبێ، وە جیاوازی لە نێوانی سەبەبی کوردی و سەبەبی عەرەبیدا، مەثەلا، چییە، وە زۆر لایەنی تری تایبەت بەزمانی خۆمانم وا ڕوون کـردۆتەوە، کە شـاعـیـرە لاوەکانمان، کـە هەتا دێ، بەحوکمی ڕۆژگار، پتر دوور دەکەونەوە لە سەرچاوەی ڕەسەنی عەرووزی، زۆر بەئاسـانی و ڕەوانی لەبەر نەخشە و خشـتـەی زاراو و بەحرەکان، زۆر بەئاسـانی بتوانن جوانترین چامەی کێشداری سـتوونی دابنێن و ترسی لەنگی و لار و خوارییـان نەبێ، هەروەک چۆن کـەسێ زۆر بەئاسانی دەتوانێ بەکۆمپیتەر ئاڵۆزترین هاوکێشەی بیرکاری حەل بکا ئاوا.

خـاڵێ هەیە حەز دەکەم لەم پێشـەکـیـیـەمدا ئامـاژەی بۆ بکەم، لە سـایەی خـوداوە، من بەندەیەکی بێ فێـڵم، لە پەخشی زانسـتدا حەسـوود و بەخـیـل نیم، هەتا ئێـسـتـا چەندین کەس، لە شاعیران و دارسین، لەم بوارەدا سـوود و بەهرەیان لێ وەرگرتووم، بگرە گەلێ لە دەفتەرە شڕ و ڕەشنووس و تەحقیـقاتم لەسەر هەندێ دیوان، ون بوون و ڕەشە ڕاهاتوون، جا ئەگەر کەسێ شتێ لەم بابەتەی لە من وەرگرتبێ بەدووری نازانم، گرنگ ئەوەیە شتەکە بۆ ئەدەبی نەتەوەکـەمـان سـوودی هەبێ، ئیـتـر بەهۆی منەوە بێ، یا بەهۆی ئەوەوە بێ، هیچ لە

مەسەلەکە ناگۆڕێ. منیش وەک بەهەشتیی مەلای گەورەی کۆیە دەڵێم:

**هەتا دەمــرم لە بۆ کــوردان دەناڵم**

**عــیلاجیــان چۆن بکەم هاوار بەمــاڵم**

نوری فارس حەمەخان حەسەن

سلێمانی/ مامۆستایان/ کوردستان

## (ناچارییەکانی شیعر = الضَّرُوراتُ الشِّعْرِيَّةُ)

واتە: ئەو جۆرە یاسا و دەستوورانەی کە شاعیران، تەنها لە کاتی ناچاری و بێ دەرفەتیدا، هانایان بۆ دەبەن و بەکاریان دەهێنن. ناچارییەکانی کێش زۆر زۆرن، هەیانە بەس تایبەتە بەزمانی عەرەبییەوە، هەیشیانە لە زمانەکانی ئەو گەلانەی عەرووزی عەرەبی بەکار دەهێنن، ڕوودەدەن، ئێمە لێرەدا زۆربەیان بەنموونەی لەباری تەعلیمی ڕوون دەکەینەوە، بەپێی دەرفەت نموونەی عەرەبی و کوردی دەهێنینەوە، چونکە عەرەبییەکە سەرچاوەیە بۆ کوردییەکە، لە حاڵی وادا شاعیر خۆی ئاگای لە هەردوو حاڵەتەکە بێ، باشتر لە حاڵەکە حاڵی دەبێ، بەتایبەتی بۆ کەسێ لە شیعرە عەرەبییەکانی شاعیرە کوردەکانی خۆمان بکۆڵێتەوە، بەبێ زانینی بەشی عەرووزی عەرەبی، لێکۆڵینەوەکەی - وەک زۆربەی لێکۆڵینەوەکانی ئێستا - ناتەواو دەبێ.

بۆیەیش ناچارییەکانم وەپێش خست، چونکە لە ڕاستیدا شیعری کوردی بەهۆی سروشتی زمانەکەیەوە پڕە لە بەکارهێنانی ناچاری، گەرچی شتی وا لە عەرەبیدا ناپەسەندە و، شیعری عەرەبی هەتا دوور بێ لە ضەرورەتی شیعری پەسەندترە، بەڵام لە کوردی و فارسی و تورکیدا، بەکارهێنانی ناچاری بووە بەڕێسایەکی دامەزراو، ستەمە پیادەکردنی عەرووز لەم زمانانەدا، بەبێ ئەو ناچارییە.

### (ناچارییە کێشییەکان بەزۆری سێ جۆرن)

**یەکەم**: لێ پترکردن. **دووەم**: لێ کەمکردن. **سێیەم**: گۆڕانکاری تر.

جا وا هەریەکەیان لە بەشی خۆیدا دەنووسین، بەڵام گەلێ جار ئەگەر شتەکە پێچەوانەی یەکتر بوون، ئەوا لە یەک شوێنیان هەردووکیان دەنووسین و لە جێگەی تریان ئاماژە بۆ ئەوێ دەکەین کە لێی تۆمار کراوە، وەک منصرف و غەیرە منصرف.

**جۆری یەکەم: لێ زیادکردن (ضرورات الزيادة):**

١- وشەی مەقصوور، وەک (غِنَی، هَوَی، وَرَی، ثَری، شەیدا، هەودا) دروستە لەبەر ناچاری کێشی، درێژ بکرێتەوە، واتە: ئەلفە مەقصورەکەی بکرێ بەئەلفی مەمدوودە، بەوێنە (غِنی) بکرێ بە(غِنَاء) بەمەیش لە عەرەبیدا دەگوترێ: (مَدُّ المقصور). وەک (وافیر):

(سَيُغْنِينِي الَّذِي أغْنَاكَ عَنّي          فَلاَ فَقْرُ يَدُومُ وَلا غنَاءُ)

چونکە کێشی ئەم دێرە دەبێ ئاوا بێ: (مَفَاعِيلُنْ + مَفَاعِيلُنْ + فَعُولُنْ × مَفَاعِيلُنْ + مُفَاعَلَتُنْ + فَعُولُنْ). جا ئەگەر هەمزەکەی کۆتایی (غنَاء)وی بۆ زیاد نەکرێ کێشەکە کورت دێنێ لەباتی (فَعُولُنْ) دەبێ بە(فَعُو ب -) ئەویش لەم زەربەدا نادروستە. لە کوردیدا وەک بەهەشتی ئایەتوڵڵای مەردۆخ (شەیدا) و (بینا)ی کردووە بە(شەیدائی) و (بینائی) لە کاتی نیسبەتدا لەم دێڕ (بەیت)ەدا:

لەم خەوگای چەرخا من شەیدائی

چاوێکم کردە و لە بۆ بینائی

مەبەست لە مەقصوور لەم شوێنەدا ئەلفی مەقسوورە و بزوێنی درێژی ئەلفە لە کۆتایی وشەدا. گەلێ جار ئەم جۆرە ناچارییە کێشەی لە یەکچوون دروست دەکا و، ئیلتباس لە واتادا دەبێ، وەک (البِلَى = رزان) ببێ بە(البَلاَء = بەلا).

٢- وشەی مەمدوود، وەک (بُكَاء، دعاء، فضاء، ئەسماء، بەلاء، کەربەلاء) دروستە بۆ ناچاری لەبەر ڕاستکردنەوەی کێش، کورت بکرێتەوە و هەمزەکەی بکرتێ، بەوێنە بوکاء بکرێ بە بوکا، یا کەربەلاء بکرێ بە کەربەلا، بەمە لە عەرەبیدا دەگوترێ (قَصْرُ الممدود). نموونەی ئەمە لە عەرەبیدا وەک وشەی (بکا) لە (بکاهَا)دا، کەوا لە کۆتایی نیوە دێڕی یەکەمی ئەم شیعرەدا:

بَكَتْ عَيْنِي وَحَقَّ لَهَا بُكاهَا

وَمَا يُغْنِي البُكَاءُ وَلاَ العَوِيلُ

چونکە ئەم دێڕە هەڵبەستە لە بەحری وافیرە، کێشەکەی ئاوایە:

(مُفَاعَلَتُنْ + مُفَاعلتن + فعولن) دوو جار. جا کە تەقطیعی دەکەین - واتە: پارچە پارچە و پارە پارەی دەکەین - ئاوا دەردەچێ:

بَكَتْ عَيْنِي = مفاعيلن + وَحُقْقَلَهَا = مفاعَلَتُنْ + بُكَاهَا = فَعُولُنْ.

ئەمەیش زۆر تەواوە، بەڵام ئەگەر هەمزەی (بکاء) فڕە نەدەین دەبێ بە(بُكائُهَا) لەسەر کێشی (مَفَاعلُنْ ب - ب -) ئەوسا شیعرەکە لەنگ دەبوو، چونکە لە دەریای وافیردا شتی وا نییە. ئەم دێڕەی تر، هەردوو جۆرەکەی وا تیادا، (فضاء) کراوە بە(فضا) و (هُدَى)یش کراوە بە(هُدَاء) وەک دەریش دەکەوێ مەرج نییە درێژکردنەوە و

کـورتـکردنـەوەکـە هەر لە عـەرووز و زەربی دێڕدا بن، بەڵکو دروسـتـە لە هەمـوو پێ (تەفعیلە)کاندا ڕوو بدەن، ئەبوتەممام لە پەسنی محەمەدی کوڕی خالیددا دەڵێ (کامل):

وَرِثَ النَّدى وَحَوَى النُّهى وَبَنَى الْعُلاَ

وَجَلاَ الدُّجَى وَرَمَى الفَضَا بِهداء

کورتکردنەوە لە کـوردیدا هەر زۆر زۆرە، بگرە لە پەخشـانیشـدا ئەلفی مەمدوودە کورت دەکرێتەوە، دەگوترێ: چوومەتە کەربەلا، کاک عەولا و کاک بەها بران، بەهەشتی مەحوی دەفەرمووێ:

تورکی من کوشتارخانەی عاشقانی دی، وتی:

من (برنجی بریزید) ئێرە (ایکنجی **کربلا**)

ئەم دێڕە لە بەحری ڕەمەلە، پیتی کۆتایی لەم چامەیەدا پیتە بزوێنی ئەلفە، کە بەدوا لامێکی بزواوی سەردار (مفتوح)دا دێ، جا ئەگەر شاعیر هەمزەی کۆتایی کەربەلاء نەکرتێنێ، یەکێتیی سەروا لە چامەکەدا تێکدەچێ، کە ئەمانەن: (بەلاّ، مەلا، موبتەلا، بەلاّ، الصَّلاَ، أَوَّلاَ، حەلوەلا) لە ناو ئەم ڕیزە (لالا)یەدا (لاء)ی دوایی کەربەلاء نامۆ دەبوو، شتی وایش دەبوو بەنەنگی سەروا. بڕوانە: (م/٢٧/١٠ - آ) واتە: بڕوانە: دیوانی مەحوی، لاپەڕە بیست و حەوت، چامەی ژمارە دەی پیتی ئەلف، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەریس و محەمەدی مەلا کەریم. بڕوانە دیوانی بەهەشتیی نالی پیتی ئەلف.

لە درێژکردنەوەی ئەلفی کورتدا وا باشە سەرەتای وشەکە پیتی سەردار بێ، دەنا شاعیر خـۆی بەناچاری بزوێنەکـەی دەگـۆڕێ بۆ سـەر، وەک (البِلَی) بەژێری بێ، لە کـاتی درێژکردنەوەدا، شاعیر لە شیعردا کردوویە بە(البَلاَء) بەسەری بێ.

مەبەست لە مەمدوود لەم جێگەیەدا، وشەیەکە دوا پیتی هەمزە بێ و پێشی هەمزەکە ئەلف بێ، وەک (یاء - یا، جاء - جا، اعتلاء - اعتلا، رجاء - رجا، شعراء - شعرا).

هێشتا لە سەرەتای کتێبەکەوەین، هەتا بەڕوونی و ئاسانی و جوانی یاساکان شی بکەینەوە جێگەی خۆیەتی، تا فێرخوازە تازە نەفەسەکان گوێیان ڕابێ بەزاراوەکانەوە، دەنا بەرە بەرە عیبارەتی کورت و پوخت و سوودمەند، پەسەند دەکەین.

(**تێبینی**) بڕگەی کورت بەهێما ئاوا دەنووسین (حەمە ب ب) بڕگەی درێژ، کە وەک

سەبەبی سووکی عەرەبی بێ بەهێما ئاوا دەنووسین (باتا - -).

٣- پیتی بێ گیراوی، گیراویدار دەکرێ (تشدید غیرِ المشدَّد) یا (تثقیل المخفف) واتە: قورسکردنی پیتی سووک، کە خۆی یەک پیت بێ، بکرێ بەدوو پیت و یەکەمیان دەغم بکرێ لە دووەمیاندا، لەبەر ڕاستکردنەوەی کێش، لە سەروا و عەرووزدا وەک (رەجەز):

بِبَازِلٍ وَجْنَاءَ أوْ **عَيْهَلّ** كَأنَّ مَهْوَاهَا عَلَى **الكَلْكَلّ**
مَوْقِعُ كَفَّيْ رَاهِبٍ يُصَلِّي

لە (عَيْهَل) و (كلكل) لامێکی وەستاو پتر کراوە و دەغم کراوە لە لامەکەی خۆیدا و بوون بە(عَيْهَلٍّ - - ب) و (كَلْكلٍّ - - ب) هەمیشە لە شیعری موطلّەقدا پیتی بزواوی کۆتایی تێر دەکرێ و پیتێ لە چەشنی بزوێنەکەی لێ دروست دەبێ، جا لەسەر ئەم بنیاتە کێشی ئەم شیعرە ئاوای لێ دێ:

بِنَازِلِنْ = مَفاعلن + وَجْنَاءَ أوْ = مُسْتَفْعِلُنْ + عَيْهَلِّي = مَفْعُولُنْ
كَأنْنَمَهْ = مَفَاعِلُنْ + وَاهَاعَلَلْ = مستفعلن + كَلْكلّلِيْ = مفعولُنْ

ئیتر ئاوا بەم شێوەیە کێشی دێڕەکە ڕاست دەردەچێ.

لە حەشوی بەیتا وەک ئەوەی میمی (دَمَكَ) کە خۆی سووکە، قورس کراوە و لەنگیی کێشەکەی پێ ڕاست کراوەتەوە (بسيط):

أَهَانَ **دَمَّكَ** فِرْغاً بَعْدَ عِزَّتِه
يا عمرُو بغيُكَ إصْرَاراً عَلَى الحَسَدِ

لەم دێڕەدا (دَمَكَ ب ب ب) کراوە بە(دَمْمَكَ - ب ن). لە هەندێ شیعردا شاعیر (جَدبا، أُخْصَبَا، قَصَبَا)ی - بەبێی سووک - کردووە بە(جَدَبًّا، أُخْصَبًّا، قَصبًّا) بەبێی قورس.

لە کوردیدا وەک ئەم دێڕەی مەحوی - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - (هەزەج):

حەیاتم صەرفی عیشقت کرد بە(**ئوممید**)ی (فَمَنْ يَعْمَلْ)
بەهیجرت کوشتم و نەتکردەوە فیکری (وَمَنْ يَعْمَلْ).

خۆی (ئومێد)ە، لەبەر ڕاستکردنەوەی کێش کراوە بە(ئوممید) یا وەک ئەم هەڵبەستەی

بەهەشتیی حەریق، کە (شەکر) کراوە بە(شەککەر) (رەمەل):

بولبولی دەوری گوڵ و (تووتی **یی**) **شەککەر** شکەنم

قومری یی سەروی خەرامان و تەزەروویی چەمەنم

لەبەر ئەوەی کە (ئومێد) و (شەککەر) ناچاری کێشین و هەر بۆ شاعیر دروستە کە بەکاریان بهێنێ، شێخی خاڵ و مامۆستا هەژار لە فەرهەنگی خاڵ و هەمبانە بۆرینەدا تۆماریان نەکردوون، خۆ ئەگەر شتی وا لە فەرهەنگا تۆمار بکرێ، دەشێ ئاماژە بۆ بەکارهێنەری بکرێ و، وەک وشەی فەرهەنگی لە قەڵەم نەدرێن.

٤- سووککردنی پیتی گیراویدار (تخفیف المُشَدَّد) بەتایبەتی لە سەروا و لە بەرابەریدا، بەڵام لە حەشوی دێڕدا ناپەسەندە، ئەمەیش بەدوو شێوە دەبێ، یەکەم پیتە بزواوەکە فڕێ بدرێ و، پیتە وەستاوەکەی پێشی بمێنێ، وەک (یَشْتَدُّ--ن) بکرێ بە(یَشْتَدْ - -) وەک (سەمم) ببێ بە(سەم) ئەم جۆرەیان بەزۆری لە قافیە و سەرواکاندا ڕوو دەدا، بەڵام کەمە کەمە لە (پێ - تەفعیلە)کانی تریشدا ڕوو دەدات، لە سەروادا وەک (موتەقارەب):

فَلاَ وَأَبِيكِ ابْنَةَ العَامِرِيَّ (م) لاَ يَدَّعِي القَوْمُ أنِّي أفِرْ

ئەم دێڕە موتەقارەبە، بەپێی زەربەکەی بریتییە لە (فعولن + فعولن + فعولن + فَعَلْ × ٢. دوو جار). جا دەبینین شاعیر بۆ ڕاستکردنەوەی کێش (أفِرّ ب - ب)ی کردووە بە(أفِرْ ب -). لە کۆتایی نیوەی یەکەمیشدا، لەگەڵ سەروادا وەک (رەجەز):

فَارْفَعْ بِضَمٍّ وَانْصِبَنْ فَتْحاً وَجُرْ كَسْراً كَذِكْرُ اللهِ عَبْدَهُ يَسُرْ

لە غەیری عەرووز و زەربا، واتە: لە حەشوا، وەک یێی (مِنَ النبيْ ب - ب -) لە پێی دووەمی نیوە دێڕی یەکەمی ئەم شیعرەی جەزەریدا، کە لە (ذات الشفا)دا دەفەرمووێ:

أَلَمْ يَكُنْ مِنَ النَّبِيْ بِمَنْزِلَهْ هَارُوْنَ مِنْ مُوسى كَمَا قَدْ قَالَ لَهْ

چونکە ناچاری کێش لەم شوێنەدا، وا دەخوازێ کە یێی (النَّبيْ) سووک بێ، نەوەک قورس. نوونی جەمعی موئەننەثی سالم و یێی نیسبەی قورس و (ثُمَّ) و (منّي) و (عنّي) و ئەم جۆرە شتانە، گەلێ جار بۆ ناچاری سووک دەکرێن.

جۆری دووەم: پیتە وەستاوەکە فڕەبدرێ و، پیتە بزواوەکە بمێنێ، وەک (عَنِي) و (مَنِي) لەم شیعرەدا، ئەگەر بڵێین محذوف پیتی ئەصلییە (رەمەل):

أَيُّهَا السَّائِلُ عَنْهُمْ وَعَنِي    لَسْتُ مِنْ قَيسٍ وَلاَ قَيْسُ مِنِي

لەم دێڕەدا عەرووز و زەرب دەبێ لەسەر (فَعِلُنْ ب ب -) بن، دەی (وَعَنِي) و (سُمني) هەردووکیـان بەنوونی ژێرداری سـووک، ڕێک دەکـاتە (فَـعِلُنْ ب ب -) بەڵام ئەگـەر نوونەکەیان قورس بێ، کێشی عەرووز و زەربی دێڕەکە تێکدەچێ. یا وەک ئەم دێڕە: (ڕەجەز):

وَاسْتَعْمِلَنْهَا مُخْبِراً كَعَشَرَهْ    أَوْ مِائَةٍ كَكَمْ رِجَالٍ، أَوْ مَرَهْ

ئەوەتا بۆ ڕاستکردنەوەی کێش (مَرَّة --) کراوە بە(مَرَه ب -). لە غەیری عەرووز و زەربا، وەک بەهەشـتـیی نـالی دەفـەرمـووێ (هەزەجی ئەخـرەبی هەشـتی = هزج أخـرب مثمّن):

زولفەینی بەخەم مار و بەحەلقەن وەکو عەقرەب

شیعری **لەف** و نەشرن، چ موشەووەش، چ مورەتتەب

نالی - ڕەحـمـەتی خودای لێ بێ - لەم دێڕەدا (مشـوّش) و (مـورەتتەب)ی بەقـورسی بەکـارهێناوە، وەک خۆیان، بەڵام (لَفّ - ب)ی بەسـووککراوی بەکـارهێناوە ئاوا (لَفُ ب ب). بڕوانە: (۲ ۱۰، ۲۵۸ - النسبة).

٥- کردنی غەیرە مونصـەریف بەمونصەریف، واتە تەنوین دانان بۆ غەیرە مونصـەریف لە هەرسێ حاڵی سەروبۆر و ژێردا و، ژێردارکردنی دوا پیـتی وشەی غـەیرە مـونصـەریف بەبێ تەنوین. لە عەرووز و زەرب و حەشوی دێڕدا شتی وا هەیە، وەک (ڕەجەز):

قُلْ عُمَرٌ، وَلاَ تَقُلْ أَمِيرُ    فَإِنَّنِي الْآنَ امْرُءٌ مَأْمُورُ

ئەوەتا لێـرەدا (عـمـر ب ب ب) کـە غـەیرە مـونصـەریفـە، کـراوە بەمـونصـەریف و بووە بە(عُـمَـرُنْ ب ب -). بەوێنە (عـطشـان) دەکـرێ بە(عطشـانُنْ ---) و (زینب - ب ب) دەکرێ بە(زینبن - ب -). ژێردارکردنی بەبێ تەنوین، وەک (طویل):

لِخَوْلَةَ أَطْلاَلٌ بِبَرْقَةِ ثَهْمَدِ    تَلُوحُ كَبَاقِي الْوَشْمِ فِي ظَاهِرِ الْيَدِ

پیـتی ڕەوی لەم مـوعـەللەقـەی طەرەفـەدا، لە هەمـوو دێڕەکـاندا، دالی ژێردارە، جـا لەبەر یەکـێتـیی سـەروا لە هەمـوو چامەکەدا (ثـهـمـد)ی غـەیرە مونصـەریف لەبەر وزن الفـعل و عەلەمیـیەت و تەئنیث، ژێری پێ بەخشـراوە و ژێرەکەیش اشبـاع کراوە و بووە بەیێ، ئەمە تایبـەتە بەشـیـعری عـەرەبییـەوە. لە کوردیدا شـتی وا بەدەق سـتـەمـە، گـەرچی نالی -

ڕەحمەتی خودای لێ بێ - لە چامە تێکەڵەکەیدا، شتی وایک ردووە، وەکو (فرمیسكٍ) و (كَرمٍ) بڕوانە (هێڵکاری/ البیت).

٦- کردنی مونصەریف بەغەیرە مونصەریف، وەک (ڕەجەز):

أُنَيسَةُ رُباحُ مَعْ ثَوْبانا    يَسَارُ مَعْ رَافِعَ مَعْ شَقْرانَا

یا وەک (مرداس) لەم دێڕەدا (متقارەب):

وَمَاكانَ بَدرُ وَلاَ حَابِسٌ يفُوقَانِ مِرْدَاسَ في الْمجْمَعِ

خۆی (رُباحٌ، يَسَارٌ، رافِعٍ، مِرْدَاساً) بوون مونەووەن بوون لەبەرکێش بێ تەنوین کراون.

٧- تەنوین دانان بۆ مونادای مەبنی لەسەر ضەمە، وەک (بەسیط):

لَيْتَ التَحَيَّةَ كانَتْ لي فأشْكُرَهَا    مَكَانَ يا جَملُ حِيِيتَ يا رَجُلُ

٨- بەشێوەیەکی گشتی تەنویندانان بۆ شتێ کە لە پەخشاندا قەبووڵی تەنوین نەکات، وەک (ڕەجەز):

سَنَة أَرْبَعْ عَشَرةٍ وَسْط رَجَبْ    فَتْحُ دِمَشْقَ بَعْدَ حَصْرٍ وَتَعَبْ

چونکە لێرەدا (أرْبَعَ عَشَرَةَ) کە عەددەدە مەبنییە لەسەر فەتحەی جوزئەین، بەڵام لەبەر ڕاستکردنەوەی کێش، جوزئی یەکەمی مامەڵەی کاتی ئێستی بۆ کراوە و جوزئی دووەمیشی تەنویندار کراوە ئاوا (سَنَتَأرْ = فَعِلَتُنْ + بَعَشْرَتِنْ = مستفعلن + وَسْطرَجَبْ = مفتعلن)[1]

یا وەک (وافیر):

سلامُ اللهِ (يا مَطرٌ) عَلَيْهَا    وَلَيْسَ عليْكَ يا مَطَرُ السَّلامُ

(مەطەر) خۆی منادای مفرەدی معرفەیە مبنییە لەسەر ضەمە، هەقی (يامَطَرُ) وە.

٩- کردنی هەمزەی وەصڵ بەهەمزەی قەطع (قطع همزة الوصل) وەک (طەویل):

إذَا جاوَزَ الاثْنينِ سِرٌ فإنهُ بِنَثٍّ و تكْثيرِ الحديثِ قَمِينُ

(١) وەک لە پێشەوە ئاماژەمان بۆی کرد، ئێمە دەربەستی ئەو لایەنە نین، کە دەبێ نموونەکان شیعری هەڵبەستی ڕەسەنی کۆن بن، مەبەستی سەرەکی ئێمە ئەوەیە کە شاعیرەکان چۆن چۆنی ئەم ناچارییەیانەیان بەکار هێناوە، هەتا ئێمەیش بەهرە لە ئەزموونی ئەوان وەربگرین، چونکە خۆ ئێمە نموونەکان بۆ چەسپاندن و ساخکردنەوەی ئەم یاسایانە ناهێنینەوە، بەڵکو و بۆ ڕاهێنان و مەشقکردنە و بەس. -دانەر-

لەم دێڕەدا ئەلفی (اثنین) کە هەمزەی وەصڵە و لە دەرجا دەکرێ، کراوە بەهەمزەی قەطع و ماوەتەوە و لە تەقطیع و پارە پارەکردنی دێڕەکەدا ڕۆڵ دەبینێ و بێ ڕۆڵ نییە، هەمزەی وەصڵ لە کوردیدا، لە ناودا زۆرتر دەبێ بەهەمزەی قەطع وەک (موضاریع):

بۆ ضەبطی موڵکی دڵ بەسە لەو لێوە یەک قسە

شاهم، بەسەوقی لەشکری غەمزە، چ ئیحتیاج

وەک ئەم وشانەی تر (ئیلتجا، ئیبتدا، اجتماع، انتصار، افترا، التباس) یا وەک ئەم نیوە دێڕە: (فَفَارَ أَلْمَاءُ وإرتَوىَ الَملاَ - رەجەز).

١٠- کرتاندنی هەمزەی قەطع و مامەڵە لەگەڵ کردنی وەک هەمزەی وەصڵ، وەک (رەجەز): (إِنْ لَمْ أُقَاتِلْ فَالْبَسوني بُرْقُعَا)

خۆی (فَأَلْبَسُوني ب-ب--)یە کراوە بە(فَأَلْبَسُونِي -ب--) گەرچی هەمزەی قەطع و هەمزەی وەصل تایبەتن بەزمانی عەرەبییەوە، بەڵام لە کوردیدا شێوە و نموونەیان هەیە و شاعیران بەزۆری لەم دوو دەستوورە سەرچاوەیان هەڵگرتووە، حەریق- ڕەحمەتی خودای لێ بێ - هەمزەی (سەر ئەفگەندەی) لەم دێڕەدا کرتاندووە، کە دەڵێ (هەزەج):

تا کەی لە طەوافی حەرەمی قیبلەیی ئەبرۆت

وەک پەرچەمی پێشانی سەر ئەفگەندە و خوارم

چونکە دەخوێنرێتەوە (سەرەفگەندەو + خوارم). مەحوی بەهەشتیش هەر لەم بابەتە دەفەرموێ (هەزەج/م/ ٢٧٨/ ١٠ هێ):

دەوای ئەم نەفسە مەلموونەت دەوێ، هەر دەردە وەک جیوە

کە هاتی کوشتن، ئەو ڕۆحی مەحفە، ئەم جەوهەری زیوە!

= دەوای ئەم نەف بْ--- مَفَاعیلن + سەمەلعوونەت ب--- مفاعیلن + دەوێ هەردەر ب --- مفاعیلن + دەوەک جیوا ب--- مفاعیلن × کە هاتی کوش ب--- مفاعیلن × تێن ئەورۆ ب--- مفاعیلن+ حی مەحضەم جەو ن--- مفاعیلن + هەری زیوا ب---)

دیسان مەحوی دەفەرموێ (موتەقارەب):

بەس ئەمڕۆ بڵێ من سبەی وا دەکەم

هەموو (وا دەکەم) تەسبەی وا نەدەم

لەم دێڕەدا (بەس ئەمڕۆ) وا دەخوێنرێتەوە (بەسەمڕو= ب-- فَعُولُنْ).

(تێبینی) دروستە بەزۆری هەمزەی وەصل، لەسەرەتای نیوەی دووەمەوە بکرێ بەقەطع (کامل):

ولاَ يُبادِرُ في الشتاءِ وَلِيدُنا     القِدْرُ يُنزِلُها بغيْرِ جِعَالِ

١١- پیتەکانی بەرەڵاکردن (احرف الاطلاق) بریتیین لە: ئەلف و واو و یێ، زۆربەی کات دوا پیتی سەروا، بەپێی بزوێنەکەی دەکشێ و درێژ دەکرێ و ئیشباع دەکرێ، هەتا لە چەشنی خۆی پیتێکی عیللە پەیدا دەبێ، واو و ویێ لەم چەشنە، لە ڕێنووسی ئاساییدا، لە خەتدا، نانووسرێن، بەڵام لە لەفظا، لە زارا دەردەخرێن، وەک ئەلف زۆرتر دەنووسرێ، وەک (مُضَرا، فَيُقْتَلاَ، الطَّائفا)، لە شیعری مەثنەویدا و زۆرینەی کات، لە کاتی تەصریعدا، بەوێنەی پیتی ئیطلاق، لە کۆتایی نیوەی یەکەمیش زیاد دەکرێ، وەک دالی (تهمد)ی و (الید) لە شیعری دووەمی ژمارە پێنجدا، جاری وا دەبێ پیتی ئیطلاق دەکەوێتە نێوانی (مضاف ومضاف الیە)ییەوە، واوی ئیطلاق وەک (رەجەز):

وَغَيْرُ ذي ثَلاَثَةٍ مَقِيسُمَصْدَرِهِ، كَقُدُّسَ التقديسُ

لەم دێڕەدا سینی (مقیس)ی موضاف لەگەڵ سینی (تقديسُ)ودا تێر دەکرێن، بۆ ڕاستکردنەوەی کێش، تا دەبن بە(مقیسو) و (تقدیسو).

ئەلفی ئیطلاقی نێوان مضاف و مضاف الیە وەک (رەجەز):

وَدَخلَ البيتَ الحَرامَ عاماالفتْحِ لَمَّا أنْ رأى الأصْنَاماً

چونکە (عاما الفتْحِ) مضاف و مضاف الیەین، ئەلفی عاما ئەلفی ئیطلاقە، هەتا کێش ڕاست ببێتەوە و هەردوو نیوە دێڕەکەیش بەرابەر و هاوسەروا بن، ناوا (عاما الاصناما) (بڕوانە: دووەم وەصڵ= سیلە).

لە کوردیدا وەک فانی - ڕەحمەتی خوای لێ بێ- دەڵێ(رەجەز):

ئەی بەختی نووستوو! نووستن خەتایە     ئەم نووستنەی تۆ بۆ من بەڵایە

١٢- بزوێن جارو بار، لەناو پێیەکانی حەشو (ناوەخن)دا، تێر دەکرێ، هەتا پیتێکی عیللەی لە چەشنی خۆی لێ دروست دەبێ، لە خەتدا نانووسرێ، لەگۆ (لەفظ: زار)دا ئاشکرا دەکرێ، دروستە لە خەتیشدا لەمەڕ مەبەستێ بنووسرێ، ئەم جۆرە نموونەی زۆرە، نموونەی ئەلف، لەناو وشەدا، وەک (يَنْبَعُ-ب ب) بکرێ بە(ینباع) عەنتەرە لە

معللەقەکەیدا دەڵێ (کامل):

يَنباعُ مِنْ ذِفْرَى غَضُوبٍ جَسْرَةٍ    زَيّافَةٍ مِثْلَ الفَنيقِ المُكدَمِ

نموونەی واو، وەک (الشعر) لەم شیعرەی شەوقیدا- ڕەحمەتی خوای لێ بێ- کە دەڵێ:

مِرْحى مرحى يَحيْا الفَنُ    يحيا الشعْرُ (و) يحيا اللَّحْنُ

نموونەی یێ وەک (الدراهِمُ) و (الصَّیارف) لەم هەڵبەستەدا کراون بە(الدّراهیم) و(الصَّياريف) هۆنەر (شاعیر) دەڵێ (بەسیط):

تَنْفي يَدَاها الحَصَى في كُلِّ هاجِرَةٍ    نَفْيَ الدَرَاهِيمِ تَنْقادُ الصياريف

هەر لەم بابەتەیە ئەم شیعرەی جەزەری کە لە پەسنی پێغەمەردا- دروودی خودای لەسەر بێ- دەفەرموێ (ڕەجەز):

وَيَبْسُطُ (و) وَيَسْتَضيفُ إن يُضَفْ

يُكَرِّمُ أهلَ الفَضْلِ مَع أهلِ الشَّرَفْ

(ويبسط) دەخوێنرێتەوە (وَيَبْسُطُو= مفاعلن ب-ب-) لە شیعردا ئەم جۆرە وشانە (اَنْظُرُ، أنا، تَذْكُرِينَ، العقَربُ، درهم، أنْجِل) ئاوا خوێندراونەتەوە:

(أنْظورُ، أنا، تذكُرينا، العَقْرَابُ، دِرْهام، انجلی).

ئەمە لە شیعری کوردیدا هەر زۆر زۆرە، گەلێ جار بزوێنی (ی)ی کورت، یان (و)ی کورت، یان (ە) پیتە بزوێنی کورت، یان پیتی لینی (واو) و (یێ) درێژ دەکرێنەوە، هەتا لەمانە بەپێی شوێن و پێویست پیتێکی عیللەی لەبار بەو جێگەیە پەیدا دەبێ بەهەشتی مەحوی دەفەرموێ (هەزەج):

کە دڵ (دەتوێتەوە) بۆ تۆ، دەکەی ئەو ڕۆژە تۆ بڕوا

کە خۆ دەرخەی، وەکوو خۆر، دڵ وەکوو شەونم لە خۆ بڕوا

بۆ ئەوەی ئەم هەڵبەستە هەشت جار (مفاعِلُنْ ب---) دەرچێ، دەبێ وشەی (دەتوێتەوە) ئاوا بخوێنرێتەوە (دەتویتوا) واتە: بەتێی وەستاو، لەگەڵ درێژکردنەوەی کورتە بزوێنی (ە)ی کۆتایی (دەتوێتەوە) تا لە چەشنی خۆی کەسرە پیتێ پەیدا دەبێ، کە ئەلفە! بێخودیش- ڕەحمەتی خودای لێ بێ- دەفەرمووێ (هەزەج):

لە کونجی گوڵخەنی غەمدا، بەیادی قامەتی تۆیە

هەمیشە قومریی خۆشخوانی سەروی باغی جەنناتم

ئەوەتا لەم هۆنراوەدا یێی ئیضافە لە حەوت شوێندا و یێی صیفەت لە وشەی (قومریی)دا درێژ کراونەتەوە و، لە پیتە بزوێن دەرچوون و لەگەڵ پیتە بێ دەنگەکەی پێشیاندا بوون بەبڕگەی درێژ، هەروا کورتە بزوێنی (ە)ی کۆتایی (تۆبە) و (هەمیشە) درێژ کراونەتەوە.

نالی- ڕەحمەتی- دەفەرموێ (ڕەمەل):

شێری نەڕ، ئاهوویی بەڕ، گورگی سەفەر، قەمچی نەچێژ

قسەمان لە (ی)ی کۆتایی (ئاهووی) بەڕە، کە ئامرازی ئیضافەیە و پیتی لینە، چونکە خۆی وەستاوە و پیتی پێشی بۆرە، لە بنەڕەتدا (ئاهُوْیْ) بووە، جا لەبەر ناچاریی جووڵەدار کراوە بەژێر و بەس، ئەمە لە چەشنی بزوێندارکردنی بێ بزوێنە، بەڵام پەیوەندی بەئێرەیشەوە هەیە. (بڕوانە:١٩).

بەشێوەیەکی گشتی، لە کاتی ناچاریدا ئەم وشانەی دواوە ئاوا تێر دەکرێن، چ لە حەشو دابن چ لە عەرووز و سەروا دابن:

أ- هێی ڕاناوی تاکی نێری کەسی سێیەم، (لَهُ- لَهُو- فِیه، فیهی، عَنْهُ، عنهو، بِه- بهی، رَبَّهُ- رَبُّهُو، بِعَبْدِه- بعبدهی).

ب- کافی ڕاناوی تاکی کەسی دووەم: (لَكَ- لَكَا، لكِ، لَكِی، غُلامُكَ- غُلامُكا، زَوجِكِ- زوجکی، أنا ب بَ= فع ب بِ: أنا بَ- = فعا بَ-)

ج- ڕاناوی (هُمْ- هُمُو، بِكُلهم- بِكِلِّهمی، هُمُ،

د- ڕاناوی (كُمْ- كُمُو، كُمی، كُمُ،

هـ- (تسألونَ- تسألونَا- هوَ- هوا، هيَ- هيَا

وەک (طویل):

أخاكا أخاكا، إنَّ مَنْ لا أخا لَهُ    كَساعٍ الی الهَیْجا بِغیْرِ سِلاحِ

یا وەک (ڕەجەز):

ذكْرا كموا نورٌ علی نورٍ علی    نُورِ النُجومِ والبُدُورِ قَدْ عَلاَ

یا وەک (بەسیط):

علی حَبیبكَ خیْرِ الخلْق كُلهمي

و- ئێستیان بەزەنە لەسەر دەکرێ ئاوا (لَهُ ب ب لَهْ -، ب ب بهْ-لكَ، لَك ب ب لَكْ-، عَلَمهُ ب ب ب عَلَمَهْ ب ب-، قَومُكَ، قومُك- ب ب قَوْمُكْ --، هُوَ بَ ب هُوْ، هِيَ ب بَ هِيْ- أنَا ب بَ أنا ب-، وهوَ- وهو- ب) بڕوانە: (١٩)

١٣- گەلێ جار پیتی لینی واو و یێ، یا یێی بەشی وشە و، یێی ئیضافە و، یێی صفە یا یێی ڕاناو بزوێندار دەکرێن، یا دەکرتێن، یا دەکرێن بەدوو پیت، لەسەر ئەم شێوەیە:

أ- واوی عەطف، کە حەرفی لین بێ و پیتی پێشی سەری هەبێ و خۆی بێ بزوێن بێ، جوولەدار دەکرێ بە بۆر و ڕۆڵی تاقە پیتێکی بزواو دەبینێ و بەس، وەک (سینە و فنجان) لەم شیعرەی ڕەحمەتی حەریقا (ڕەمەل):

مەجمەعە (سینەوو) فنجانە مەم و شەربەتە دەم

خەلعەتی یارەکە زانیویە غەریبی وەتەنم

چونکە ئاوا پارە پارە دەکرێ: مەجمەعەسی = فاعِلاتُنْ + نەووفنجا = فَعِلاتُنْ + نەمەم و شەر = فَعِلاتُنْ + بە تەدەم= فَعِلُنْ ب ب-)

لەم کاتەدا بازێ جار، بەپێی پێویست، پاش جوولەدارکردنی، جوولەکەیشی تێردەکرێ، هەتا پیتێکی لە چەشنی بزوێنەکەی کە بۆرە لێ پەیدا دەبێ، وەک (زەندە و مەرخ) لەم دێڕەی نالی بەهەشتیدا (ڕەمەل):

ئیلتیقای پۆلا و ئاسن، هەر نیزاعە و گیرودار

جەمعی ماء و نار و، زەند و (زەندە و وو مەرخ) و عەفار

ئەگەر لە پێشیەوە یێ بێ جوولەی پیتی پێشی ژێردار بوو، دروستە یێکەی پێشی بۆردار بکرێ و لەگەڵ واوە عەطفەکەدا، برگەیەکی درێژ دروست بکەن، وەک (مەثنەوی و لوببی) لەم شیعرەی نالیدا (ڕەمەل):

(نالیا ئەم غەزەلەت تازە بەتازە وتووە

بەدووصەد (مەثنەوی) یو (لوببی لوباب)ی نادەم

لەم کاتەدا دروستە بکرێ بە یێ و م بۆردار بکرێ و ڕۆڵی برگەیەکی کورتی یەک پیتی ببینێ، وەک (شادی و زولفت) لەم دێڕەی حەریقی ڕەحمەتیدا (هەزەجی ئەخرەب):

بۆ جەمعی غەم و شادی نەبوو ڕۆژی موحەڕڕەم

ڕووت بەرگی گوڵی شادی (یو) زوڵفت شەوی ماتەم

هەندێ جـار ئەم جـۆرەیش هەر بەدوو واو دەنووسـرێ، وەک حـەریق (رە) دەفـەرمـوێ (هەزەجی ئەخرەب):

چت داوە لە ڕوو ترشی و و سرکەی دەمی ئەغیار

قەندی لە بـ(ت) شیرین بەدەمی تاڵی خومـارم

ئەگەر پیتی پێشی ئەلف بوو، واوەکە بزوێنەر دەکرێ و بزوێنەکەیشی تێر دەکرێ، تا دەبێ بەدوو واو، یەکەم بزواو و دووەم وەستاو، وەک (سـاقـاو مـوژە) لەم هۆنراوەی نالی بەهەشتیدا (هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەحزووف):

بۆ تۆزێ رەهت دیدە سەقا و و موژە جارووب

ترسام کە لە پێت چێت

ب- واوی(هُوَ) دروستە بکرتێ، وەک(طەویل):

فَبَیْنَا (هُ) یَشْرِی رَحْلَهُ قَالَ قَائِلٌلِمَنْ جَمَلٌ رِخْو المُلَاطِ نَجِیبُ؟

ج- یێی(هيَ)یش دروستە بکرتێ: رەجەز:

هَلْ تَعْرِفُ الدَّارُ عَلی تِبْرَاکَا دَارُ لِسُعْدَی إِذْ (هـ) مِنْ هَوَاکَا

د- یێ بەشی وشەو، هەر وا یێی ڕاناو و یێ نیسبەت و هەروا یێ ئیزافە و صیفەت، دەق وەک واو، دروستە ڕۆڵی بڕگەیەکی کورت، یا درێژ ببینن، وەک (ناری) ڕەحمەتی خوای لێ بێ- دەفەرموێ (هەزەج):

وەک روودی بەری (دوو رووە)یە، چەشمەیی چاوم

وەک سۆزی دڵی شێخە، کزەی جەرگی براوم

خۆی (چەشمەی چاوم)ەیە، بە(ی)ی ئیزافە، لێرەدا جووڵەدار کراوە و بەس.

نالیش دەڵێ (رەمەل):

پەچەیی پەرچەمیی و، پرچی سیا

هەر دەڵێی مانگەشەوە کوڵمی تیا

لێرەدا (ی)ی ئیزافە کراوە بە بڕگەیەکی درێژ: (پەچەیی ب ب -)

یا دەڵێ (هەزەج):

بایێ لە طەرەف قیبلەمەوە دێت و وەزانە

یابۆیی هەناسەی دەمی غونچەی لەرەزانە

حەریقیش- ڕەحمەتی لێ بێ- دەڵێ(ڕەمەل):

بولبولی دەوری گوڵ و تووتی **یی** شەککەر شکەنم

قومری **یی** سەروی خەرامان و تەزە روویی چەمەنم

(ی)ی (تووتی **یی** شەککەر)ییی سیفەتە، ئەم دێڕە ئاوا پارە پارە دەکرێ:

بُلْبُلي دَوْ= فاعـلاتُنْ - ب -- + ريگُلُوتُو= فاعـلاتُنْ - ب --)+ تيشَكْكَرْ= فَعلاَتُن ب ب -- + شَكَنَمْ= فَـعلُنْ ب ب -)× قُـمْـرِيْيَـرْ= فـاعـلاَتُنْ - ب -- + وِيَخـراَمَـا= فاعلاتن + نُتَزَارُ ىْ= فعلاتن ب ب -- + چَمَنم فَعِلُنْ ب ب -).

ئەسیری- ڕەحمەتی خوای لێ بێ- دەفەرموێ: (ڕەمەڵ):

وا لە سەر دەریا**یی** داگر بەرز ئەبن

ئەفڕن و پەرواز ئەکەن هەروەک هەڵـۆن

کەشـــــتی پۆڵا**یی** زرێواری زەلام

چەند نهۆمە، وەک قەڵای کرداری خۆن

(ی)ی صـیـفـە لە (دەریای داگردا) و لە (پۆڵایی زرێوار)دا، لە یەکـەمـدا لە کـێـشـدا جێگەی یەک پیتی بزواو دەبینێ و بەس، بەڵام لە دووهەمدا، لە کێشدا یەکسانە بە(فا-) لە(فاعلاتن -ب--)دا.

ڕەحمەتیش ئەحمەد هەردی، دەڵێ (هەزەجی ئەخرەب):

شەو مێزی شەرابی کە ئەڕازایەوە بۆ کۆڕ

ڕووناکی ئەبەخشی لە شەوا، ویسکیی **ی** سەرمۆر

یێ لە(ویسکی سـەرمـۆردا) چ بلـێین بەشی وشـەیە، وە چ بلـێین هی سـیـفـەتە، ڕۆڵی بڕگەیەکی کورت دەبینێ لە (فعولن)دا.

زۆربەی شـاعـیـران بەهرەیان لەم یاسـایە بەزۆری وەرگرتـووە. وەک ئەم وشـانە کە لە دیوانە کوردییەکاندا هاتوون:

١- (دەسگریی و دەسکوژی، حـەلقـەیی دەر مـا، ئەی واعـیـظ.. هـاتوویی بـەسـەرمـا، شاهەنشـەهی یو طەوقی، شـیـرین یـو، لە تاڵ یو، دانەیی سـمـاق، کووچەو و سـواق، لایێ هەموو شکۆفەوو، سایەوو بەرگن- دیوانی نالی).

٢- (سوورەیی یوسف، سەروو چنارم، لە گەرماوو لە سەرما، چیهرەیی بەدی، کۆییی خوبانم، ئامادەیی جەنگن، ئەگریجەو و کاکۆڵ- حەریق).

١٤- زیادکردنی هێی ئێست (هاء السكته) وەک (رەجەز):

وَهَاجَرَ النبيُّ للمدينَهْوَعُمُرْهُ ثَلاَثُ مَعْ خَمسِينَهْ

ئەوەتا لە دوای پیتی ڕەوییەوە، کە نوونی (خمسين)یە، لەم دێڕەدا، هێ یەکی زەنەدار زیادکراوە بۆ ئێست لەسەر کردن،هەتا (مەدینه)و (خەمسینه) هاوسەروای تەواو بن. یا وەک(غلاميَه ْ) و (لتعصيَهْ) بۆ بەرابەری(قسطنطنيَهْ). (بڕوانە: ٤٢)

١٥- هێ ی ئێست، جاری وا هەیە تەنوینی تەرەننومی پێیەوە دەلکێ، ئەوجا دوو پیتی زەنەدار، واتە: وەستاو (ساكن)، بەیەکتر دەگەن، کە بەبارودۆخی وا لە عەرەبیدا دەگوترێ: ئیلتیقای ساکینەین و، یاساو ڕێسای تایبەتی خۆی هەیە، جا لەبەرئەوە وەستاوی یەکەم کە هێی ئێستەکەیە، بزوێنی ژێری پێ دەدرێ، تەنوینی تەرەننوم وتەنوینی غالی لەخەت و لە بێژە(لەفظ)دا،، دەنووسرێن، وەک(رەجەز):

وَأُمُّهُ آمِنَةُ مِنْ وَهْبِ مِنْ عَبْدِ مَنَافٍ زَهْرَةٍ كِلاَبِهِنْ

ئیبنولحاج - ڕەحمەتی خوای لێ بێ- لە زاتوشیفادا لە ڕاڤەکردنی ئەم دێڕەدا دەفەرموێ: (هێ ی - کلاَبِهِنْ - هێ ی ئێستە، بۆ ناچاری کێشی هێنراوە، لەپاشدا تەنوینی تەرەننومی پێوەلکاوە، وە دوو پیتی وەستاو بەیەکتر گەیشتوون، ئەوەیش دروست نییە، لەبەرئەوە هێ یەکە بزوێنی ژێری پێ بەخشراوە).

ئەبوعەلای موعەرریش ڕەحمەتی لێ بێ- دەڵێ (مجتث):

وَمَا أُظُنُّ الْمَنَايا تَخطُو كَوَاكِبَ جَرْبَه

بڕوانە: چی پیتێ دەبێ بەرەوەی (د - هێ، ز - تەنوین).

١٦- زیادکردنی لامی ئیبتیدا، لەسەر موبتەدای دواکەوتوو و شتی تری لەم بابەتە، وەک (كامل):

خالي لأنْتَ وَمَنْ جَرِيرٌ خَالُهُيَنَلِ السَّماءَ وَيُكرِمَ الأَخْوَالا

١٧- پترکردنی واوی عەطف،وەک (طەویل)

فَلَمّا أجزنَا سَاحَةَ الْحَيِّ وَانْتَحى بِنَابَطْنُ خَبْتٍ ذِي قَفَافٍ عقنقل

١٨- پترکردنی فێی عەطف (طەویل):

يَموُتُ أُناسُ أوْ يَشيبُ فَتَاهُمُو     وَيحدُثُ نَاسُ والصغيرُ فيكبُرُ

یا وەک (کامل):

فَلنَهْشَل قومي ولي في نَهشَلٍ     نَسَبُ لَعَمْرُ أبيكَ غَيْرُ غَلاَبِ

١٩- پیتی بێ بزوێن بزوێندار دەکرێ، یا بەپێچەوانەوە، وەک لە حشودا، یان لە عەرووز و زەربا (اَلحُلُم - ب ب ب) بکرێ بە(الحلْم -- ب) و (النَّهَرُ - ب ب ب) بکرێ بە(اَلْنَهْــــرُ --ن) و (وَهِيَ ب ب ب) بکرێ بە(وَهْيَ - ب) و (وَهُوَ ب ب ب) بکرێ بە(وَهْوَ - ن) و (مَعَ ب ب) بکرێ بە(مَعْ -) و (فَهُوَ ب ب ب) بکرێ بە(فَهْوَ - ب) یا (فَهِيَ ب ب ب) بکرێ بە(فَهْيَ - ب). (بڕوانە: ١٢ - و).

بێ بزوێنکردن وەک ئەبوعەلای موعەڕی - ڕەحمەتی لێ بێ - جیمی (رَجُل ب ب ب)ی بێ بزوێن کردووە ئاوا (رَجْل - ب) لەم دێڕەدا (بەسیط):

وَقَدْ يُقَال عِثَارُ الرِّجلِ إنْ عَثَرَتْ     وَلاَ يُقَالُ عِثَارُ الرجْلِ إنْ عَثَرا

یا وەک (کامل):

فَالدُّرُّ (وَهْوَ) أجَلُّ شَيْءٍ يُقْتَنى     مَاحَطَّ قيمَتَهُ هَوَانُ الغَائِصِ

بزوێندارکردن، وەک بزوێندارکردنی هێی (الزَّهْرَا ---) و کردنی بە(الزَّهَرَا - ب ب -) لەم دێڕەدا (بەسیط):

تَبْقَى صَنَائِعُهُمْ في الأرضِ بَعْدَهُمُ     وَالْغيْثُ إنْ سَارَ أَبْقَى بَعْدَه الزَّهَرا

بزوێندارکردن لە سەروادا زۆرە، وەک ڕاناوی (هم) و (کم) و ئاخری فیعلی ئەمری صەحیح، بەپێی خواستی جێگە بزوێندار دەکرێن، بەبۆر، یا بەژێر، لە غەیری (هم) و (کم)دا، دروستە پیتی دوایی بەسەریش بزوێندار بکرێ، وەک (فَاعْلَمْ --) لەم دێڕەدا کراوە بە(فَاعْلَمَا - ب -):

وَحَذْفُ يا المنقوصِ ذِي التنوينِ مَا     لَمْ يُنْصَبَ اولى مِنْ ثُبُوتٍ، فَاعْلَمَا

لە سەروادا بێ بزوێن کە بزوێندار کرا بەپێی سەروای پێشی تێریش دەکرێ، بەوێنە (فَاعْلَمْ) لەم شیعرەدا بۆیە کراوە بە(فاعلما) چونکە نیوەی دێڕی یەکەمی ئەم شیعرە (ما)یە. فیعلی ئەمری (أقْدِمْ --) لەم شیعرەی عەنتەرەدا بۆیە کراوە بە(أقْدِمي - ب -) چونکە پیتی ڕەوی لە سەراسەری چامەکەدا میمی ژێرداری موشبەع بەیێ، عەنتەرە دەڵێ (کامل):

وَلَقَدْ شَفَى نَفْسِي وَأَذْهَبَ سُقْمَهَا * قِيلُ الفَوَارِسِ وَيْكَ عَنْتَرَ أَقْدِمِي

چونكه ئەم وشانە لە پێشییەوە بوون بەسەروا، کە زۆریان خۆیان لە بنەڕەتدا نەبزواون و نەژێردارن، بەڵام لەبەر یەکێتی سەروا بزوێندارکراون بەژێر، وەک: (لَمْ يكلَمِ --ب-، الأعلمِ، عَرَمْرَمِ، بالعِظلَمِ، وَاعْلَمِي، حُرِ أرثَمِ، بالدّمِ...) ئەمە لە کوردیدا زۆر زۆرە، لەبەر ئەوە هەتا پتر ڕوونی بکەینەوە کەمە، بگرە لە زۆر جێگەدا هۆزان خۆی سەربەستیی کاری تەواوی هەیە، بەپێی جێگە و شوێن قورسی دەخاتە سەر پیتێ و کێشی پێیەکە دەگۆڕێ. وەکو لەم دێڕەدا بێی (ڕوو بکەینە) بێ بزوێن کراوە، إقتباس لە مەحوی (هەزەج):

بەجێ نایێ کە ئادابی وەفاداری لە شارا

هەقە ئێمەش وەکو مەجنوون هەموو ڕوو بْکەینە سارا

یا وەک تێی وەستاوی (وتم و--) لەم هەڵبەستەی مەحویدا (ڕەمەل):

سائیلی ئەو بەردەردم، وتْم و، وتی:

تۆ گەدای، ئەم نەخوەتی شاهانە بۆچ

یا وەک (ئاشنَایی) لەم هۆنراوەی تریدا (موضاریع):

(مەحوی) عەبەث بەدیدەیی بیمار (ت) مائیلە

ناگیرێ ئاشنَایی لەگەڵ مەستی نامیزاج

یا وەک نالی (دوو-)ی لە (دوو چاوم ---)دا کردووە بە(دو ب) لەم دێڕەدا (هەزەجی شەشی مەحزووف):

عەزیزم ڕۆحی شیرینم (دوچاوم)    دەوای زامی دڵ و جەرگی براوم

وەک کردنی (ئافتاب - -) بە(ئافَتاب - ب -ْ) لەم دێڕەی مەحویدا (ڕەمەل):

ماهی من ڕۆژێ لە ڕوو لادا نیقابْ

شەو مەگەر هەڵبێ لەسەرمان ئافَتابْ

یا وەک چەندین نموونەی تر کە لە پێشەوە لەم دوو بابەتە ڕۆیشتن، یا لە دواوە دێن، لە ژمارە نوێکاندا.

٢٠- گۆڕینی بزوێنێ بەبزوێنێکی تر، وەک (ڕەجەز):

وَأَبْدَلُوا حَرَكَةً مِنْ حَرَكَة * كقولهم: (أُمّاً لا مّ بَرَكَة).

لە ڕاستیدا نۆزدە و بیست لە جۆری سێیەمین، کە جۆری گۆڕانکارییە، بەڵام لە کاتی

ئیشباع و تەحریکی دواپیت لە دێڕدا، دەچنەوە سەر جۆری لێ زیادکردن، لەبەر ئەوە لەم بەشەدا نووسراون.

٢١- زیادکردنی (فێ) بۆ وشەئارایی (تەزیینی لەفظی) وەک (رەجەز):

وَنُونَ مجموعٍ وَمَا بِهِ التَحَقْ    فَافْتَحْ وَقلَّ مَنْ بِكَسْرِهِ نَطَقْ

٢٢- چوونی (أل -) بۆ سەر:

آ- فیعلی موضاریع وەک (طەویل):

وَلَيْسَ اليَرى لِلْخلِّ مِثلُ ألذي يَرى * لَهُ الخلُ أهْلاً أنْ يُعَدَّ خَليلاً

ئەوەتا (ال) چووەتە سەر (یری)ی فیعلی موضاریع و بووە بە(الیری).

ب- ظەرف، وەک (ألْ مَعَ) لەم شیعرەدا (رەجەز):

مَنْ لاَ يَزَالُ شاكِراً على ألْمَعَهْ فَهْوَ * حَرٍ بِعيشَةٍ ذاتِ سِعَةِ

ج- بۆ سەر ڕستەی ناوی (جوملەی ئیسمییە) وەک (وافر):

مِنَ القَوْمِ (الَرسُولُ) اللهِ مِنْهُمْ

هُمُو أهْلُ الحُكُومَةِ مِنْ قُصَيٍّ

ئەم سێ جۆرەیان ئەم ئەلە موصوولە بەمەعنی (الذی)یە، یا (التی)یە، یا بەمەعنا (مَنْ)ی مەوصوولەیە، کە بۆ تاک و دوان و کۆ دەبێ، چ نێرینە بن، چ مێیینە.

د- بۆ سەر عەلەم (ناو) وەک (رەجەز):

بَاعَدَ أمَّ العَمْرِو عَنْ أسيرِهَا * حُرَّاسُ أبْوَابٍ عَلَى قُصُورِهَا

هـ- بۆ سەر عەلەمی جینس، وەک (کامیل):

وَلَقَدْ جَنَيْتُكَ أكْمؤاً وَعَسَا قِلاً

وَلَقَدْ نَهَيْتُكَ عَنْ بَناتِ ألأوبَرِ

(بَنات أوبَرِ) ناوە بۆ جۆرە قارچکێ، ئەلی حەرفی چووەتە سەر.

و- دەچێتە سەر تەمیز، کە مەرجی تەمیز ئەوەیە نەکیرە بێ، وەک (رەجەز):

وَ لاضْطِرَارٍ: كَبَناتِ ألأوبَرِ * كذا (وَطِبْتَ النفسَ يا مَيْسُ) السَّرِي

خۆی (وَطِبْتَ نَفْساً) بووە.

٢٣- زیادکردنی نوونی ویقایه، لەدوا ئیسمی فاعیلەوه، وەک (بەسیط):

أَلاَ فَتىً مِنْ بني ذِبْيانَ يَحْمِلُني * ولَيْسَ (حَامِلُني) إلاَّ ابْنُ حَمَّالِ.

جێگەی نوونی ویقایه لە فیعلدا، لە بەینی پیتی ئاخری فعل و یێی موتەکەللیم دایە و بەس.

٢٤- زیادکردنی نوونی تەوکید، لە پاش ئیسمی فاعیلەوه، وەک (رەجەز):

أَرَئَيتَ إنْ جِئتَ به أملُوداً * مُرَجَّلاً وَيَلْبَسُ البُرُوداَ

(أَقَائِلُنَّ) أَحْضِرُو الشُّهُوداَ

٢٥- زیادکردنی نوونی تەوکید لە شەرطدا، وەک (کامل):

مَنْ نَثْقَفَنْ مِنْهُمْ (فَلَيْسَ) بآيبِ * أبَداً وَقَتْلَ بَنِي قُتَيْبَةَ شَافِي

٢٦- زیادکردنی نوونی تەوکید لەسەر فیعلی مەنفی بەئەداتی جەزم، وەک (رەجەز):

وَعَابِدٍ بِعِلْمِهِ لَمْ (يَعْمَلَنْ) معذَّبٌ مِنْ قَبْلِ عُبَّادِ الوَثَنْ

٢٧- زیادکردنی نوونی تەوکید لەسەر فیعلی مەنفی بەما و لای غەیرە جازمە، وەک (رەجەز):

وكاَنَ لاَ (يُقَابُلنٌّ) آحَداَ بِما لَهُ يَكْرَهُ وَقْتاً أبَداَ

یا وەک (کامل):

وَهُمُ الرِجَالُ، وكل ذلك مِنْهُمُ يَحْزَنَّ في رَحْبٍ وَفي مُتَضَيَّقِ

٢٨- بەشاذیش لەسەر فیعلی موضاریعی موثبەت زیاد دەکرێ، وەک (رەجەز):

وَإنْ يَكُنْ يَركَبُ لاَ يَدَعُ مَنْ يَكُونُ مَاشٍ مَعَهُ أَوْ يُحْمَلَنْ

٢٩- زیادکردنی (إلاّ) لەدوا (مازال)ە واخواتیەوه، وەک (بەسیت):

مازالَ مُذْ وَجَفَتْ في كُلِ هَاجِرَةٍ بِالأَشْعَثِ الْوَرْدِ (إلاَّ) وَهُوَ مَهْمُومُ

٣٠- زیادکردنی (تێ) لە (ثُمَّ)ەی حەرفی عەطف، وەک (کامیل):

وَلَقَدْ أمرُّ عَلَى اللَّئِيمِ يَسُبُّنِي فَمَضَيْتُ (ثُمَّتَ) قُلْتُ: مَا يَعْنِينِي

٣١- زیادکردنی (تێ) لەسەر (رُبَّ)ەی حەرفی جەر، وەک (وافیر):

فَقُلْتُ لَهَا أَصَبْتَ حَصَاةَ قَلْبِي وَ(رُبَّتَ) رَمْيَةٍ مِنْ غَيرِ رَامِي

٣٢- زیادکردنی (بیّ)ی حەرفی جەڕ لەسەر:

آ- فاعیل: وەک (وافیر):

أَلَمْ يَأتيكَ وَٱلْأنْباءُ تَنْمي    بِمَا لاَقَتْ سَرَاةُ بَني تَمِيمِ

ب- مەفعوول، وەک (ڕەجەز):

نَحْنُ بَنُو جَعْدَةَ أرْبَابِ الفَلَجْ    نَضْرِبُ بِالسَّيفِ وَنَرجُو بِالفَرَجْ

٣٣- زیادکردنی کافی حەرفی جەڕ، وەک (ڕەجەز):

لَوَاحِقُ ٱلْأقْرابِ فِيهَا كَالْمَقَقْ

٣٤- إدخالی حەرف لەسەر حەرف، وەک (طەویل):

فَأصْبَحْنَ لاَ يَسْألْنَهُ (عَنْ) بِمَا بِهِ    أصَعَّدَ في عُلُوِّ ٱلْهَوَى أمْ تَصَوَّبَا

٣٥- زیادکردنی (أنْ) وەک (طەویل):

فَقَالَتْ أكُلَّ النَّاسِ أصْبَحْتَ مَانِحاً
لِسانَكَ كَيمَا (أنْ) تَغُرَّ وَ تَخدَعَا

٣٦- زیادکردنی (کان) لە غەیری ئەو شوێنانەدا کە دروستە لە پەخشانا زیاد بکرێ، وەک (وافیر):

سَرَاةُ بَني أبي بَكْرٍ تَسامى
عَلَى (كَانَ) ٱلْمُسَوَّمَةِ الْعِرَابِ

٣٧- زیادکردنی (أصْبَحَ) وەک (سەریع):

عد و عَيْنَيْكَ وَشَانيهما    أصْبَحَ مَشْغُولُ بِمَشْغُولِ

٣٨- زیادکردنی (أمْسى) وەک (طەویل):

أعَاذِلَ قُولِي مَا هَوَيْتِ فَأوِّبِي    كَثيراً أرى (أمْسى) لَدَيْكَ ذُنُوبِي

٣٩- زیادکردنی (إنْ)ی مەکسوورە، وەک (تەویل):

وَرَجَّ ٱلْفَتَى لِلْخَيْرِ ما إنْ رَأيْتَهُ    عَلَى السِّنِّ خَيراً لاَ يَزَالُ يَزِيدُ

٤٠- زیادکردنی (مَا) لە کۆتایی شیعرەوە، وەک (ڕەجەز):

وَمَا عَلَيْكَ أنْ تَقُولَ كُلَّمَا    سَبَّحْتَ أوْ صَلَّيْتَ يا اللّهُمَّ مَا

٤١- زیادکردنی پیتێ، یا چەند پیتێ، لە یەکەوە هەتا پێنج، لە سەرەتای بەیتەوە، کە

بەر تەقطیع نەكەوێ، پێی دەگوترێ (خەزم):

آ- یەک پیت (تەویل):

وَ إذا أنْتَ جَازَيْتَ أمْرأ السُّوْء فعْلَهُ
أتَيْتَ مِنَ ألاخْلاَقِ مَا أنْتَ رَاضِيا

ب- دوو پیت (كامیل):

يَـا مَطَرَ بْنَ نَاجِيَة بْـنِ ذرْوَةَ إنَّنِي
أجْـفَى وَتُغْلَقُ دُونِي ألابْــوَابُ

ج- سێ پیت (هەزەج):

نَحْنُ قَتَلْنَا سَيِّدَ الخَزْ دَجِ سَــعْدَ بْنَ عُبَادَهْ
رَمَيْنَــــاهُ بِســـــهْمٍ فَـلَمْ يُخْطِ فُــؤادَهْ

د- چوار پیت (هەزەج):

أشْدُدْ حَيَازِيمَكَ لِلْمَوْتِ فَأنَّ ألْمَــوْتَ لاَقِيكْ
وَلاَ تَجْزَعْ مِنَ ألْمَــوْتِ إذَا حَــلَّ بِنَادِيــكْ

هـ- خەزم پێنج پیتی و شەش پیتیشی هەیە، دەڵێن: لە دوو پیت پتر بێ شاذە، وە تا پیتە زیادەكان زۆرتر بن خەزمەكە ناشیرینترە. شەش پیتی وەک (وافیر):

وَإلاَّفَتَعَالُوا نَجْتَلِدْ بِمُهَنَّداتٍ نَفَضُّ بِهَا ألْحَوَاجِبَ وَالشُّؤُنَا

و- جارجارەیش پیت پترکردن لەسەرەتای نیوەی دووەمی بەیتیشەوە دەبێ. وەک (رەمەل):

كُلَّمَا رَابَكَ مِنِيّ رَائِبُ وَيَعْلَمُ ألْجَاهِلُ مِني مَاعلِمْ

ز- جارجارەیش هەم لە سەرەتای صەدر و هەم لە سەرەتای عەجزەوە دەبێ وەک (مەدید):

هَلْ تَذكُرُونَ إذْ نُقَاتِـلُكُمْ
إذْ لاَ يَضُرُّ مُعْدماَ عَدَمُهْ

ح- جارجارەیش، بەشاذ، پیت زیادكردن، واتە: خەزم، لە حەشوی هۆنراویشدا دەبێ، وەک:

١- دوو پیت، له حەشوی نیوەی دووەما (کامیل):

يَا نَفْسُ أكْلاً وَاضْطِجَا   عاً يَا نَفْسُ لَسْتِ بِخَالدَةِ

٢- وشەیەکی تەواو، وەک (قرشيا) لەم هەڵبەستەدا:

كَيْفَ رَأيْتَ زمرا   أأقطا أمْ تمرا   أمْ **قرشيا** صَارِماً هزبوا

ئەم زیادانە تەقطیع ناکرێن، واتە: لە کاتی تەقطیعی شیعرەکەدا ناکێشرێن، بۆ نموونە ئەم شیعرە کە لە سەرەتای نیوەی یەکەما (**وَإنْ**) خەزمە و لە سەرەتای نیوەی دووەمیدا (**مِنْ**) خەزمە، ئاوا پارە پارە و تەقطیع دەکرێ (طەویل):

**وَإنْ** تَعَدَّيتُ طَوْرِي كُنْتُ أوَّلَ هَـــالك

**مِنْ** جَمَاعَتِكمْ وَالمعْتَدِی الطَّوْرِ هَالكُ

| لَهَالِكِي | تُأوْوَ | تُطوْرِيكُنْ | تَعَدْدَیْ |
|---|---|---|---|
| ب-ب- | ب-ن | ب --- | ب -- |
| مَفاعِلُنْ | فَعُولُ | مَفَاعِیلُنْ | فَعولُنْ |

| رِهَالكو | تَدِلْطَوْ | تِكُمْ وَلْمُعْ | جَمَاعَ |
|---|---|---|---|
| ب-ب- | ب -- | ب --- | ب-ن |
| مَفَاعِلُنْ | فَعُولُنْ | مَفَاعِيلُنْ | فَعُولُ |

تێبینی: هەندێ لەم گۆڕانکارییانە، کە زیادکردنی پیتە لە سەرەتای دوو نیوە و لە حەشو (ناواخن)ی دێڕدا ڕوو دەدەن لە شیعری عەرەبیدا، لە هۆنراوەی کوردیشدا شتی وا ڕوو دەدا، بەتایبەتی لە کێشی بڕگەییدا، بەتایبەتیتر لە کاتی خوێندنەوەدا، بەسۆز و شەوقەوە، وەک (دە بڕگەیی):

وەرە داستانی وەطەنی ســـــووتاو

لە گۆشەیەکۆ - ئازیز - بخەینە بەرچاو

بیکەین بەیادگار ڕووداو بەڕووداو

بۆ پەند و عیبرەت، نەک بۆ چاو و ڕاو

٤٢- زیادکردنی نوونی ویقایە لەپاش افعل التفضیلەوە، وەک لەم فەرموودەیەدا دەفەرموێ: (غَيْرُ الدَّجَال أخْوفُنِي عليكُمْ).

٤٣- له ڕاستیدا ئەگەر بەوردی سەرنج بدرێ و دەستەیەکی شارەزا و پسپۆڕ دیوانە کوردییەکان بگەڕێن و بپشکنن، نموونە و یاسا و ڕێسای زۆری تر لە هەموو بابەتە عەرووزییەکان دیاری دەکەن، کە شاعیرە گەورەکانمان پیادەیان کردوون، کە هەیانە دەقاودەق وەک عەرەبییەکان وان، هەیشیانە بەقیاس لەسەر ئەوان، بەپێی تایبەتمەندی زمانی کوردی، بۆ یەکەمجار لە لایەن ئەوانەوە پیادە کراون. بڕوانە ژمارە (٨٥-٣-ب) کە چۆن مەولەوی، بەقیاس لەسەر کرتاندنی شەرط و جەواب (٧١) (کە)ی بەمەعنا: ئەگەر، یا بەمەعنا: هەردەمێی کرتاندووە، وە هەروەها (کە)ی پاشگری دیاری کردنیشی لە (حەلقە) کرتاندووە. کەواتە ناچاری، چ زیادە بێ و چ لێ کەمکردن بێ و چ گۆڕانکاری تر بێ، چ لە عەرەبیدا و، چ لە کوردیدا بێ، تەنیا بریتی نین لەم ژمارانە و بەس. بەڵکو چەشنی تریشیان هەیە، زوو یا درەنگ تۆمار دەکرێن.

**(جۆری دووەم: لێ کەمکردن: ضرورات الحذف):**

٤٤- کرتاندنی (إمّا)ی دووەم و هاتنی (إمّا) بەبێ ئەوەی کە (إمّا)ی تر لە پێشیەوە هەبێ، وەک (طەویل):

تَهَاضِ بَدارٍ قَدْ تَقَادَمَ عَهْدُهَا (وإمَّا) بأمْوَتٍ ألَمَّ خَيَالُهَا

٤٥- کرتاندنی هەمزەی معادلە بۆ (أمْ) وەک (کامل):

(كَذَبَتْكَ) عَيْنُكَ أم رَأيْتَ بِوَاسِطٍ غَلَسَ الظَّلاَمِ مِنَ الرَّبَابِ خَيَالاَ

خۆی مافی (أكذبتكَ)ەیە.

٤٦- بۆ ڕاستکردنەوەی ڕەوی، پیتێ لە وشەیێ لادەبرێ و پیتێکی تری لەبار لە جێگەی دادەنرێ، بۆ پاراستنی یەکێتیی پیتی ڕەوی. وەک لەم شیعرەدا (الثعالِبِ) و (أرانبِ) کراون بە(الثعالي) و (أراني) (بەسیط):

لَهَا أشارِيرُ مِنْ لَحْمٍ تُتَمِّرُهُ مِنَ (الثَعَالِي) وَ وَخْزٍ مِنْ (أرَانيهَا)

٤٧- کەمکردنەوەی جەمع لە وەزنی خۆی لەبەر ناچاری سەروا، وەک لەم هۆنراوەدا (الحلوق - ب - ب) کراوە بە(الحلق - ب -) (ڕەجەز):

(حَتَّى إذَا بَلَّتْ حَلاَقِيمَ الحُلَقْ)

٤٨- کرتاندنی تەنوین و هێشتنەوەی بزوێنەکەی لەسەر باری ئاسایی خۆی، بۆ ڕاستکردنەوەی کێش، لە هەر سێ حاڵەتەکەی ئیعرابدا:

آ- کاتی نەصبە، وەک (موتەقارەب):

فَألْفَيْتُهُ غَيْرَ مُسْتَعْتِبٍ    وَلا ذاكرَ اللهَ إلاَّ قَليلاَ

چونکە ئەم شیعرە نیوەی دووەمی دەکاتە چوار جار (فَعُولُنْ) بەبێ زیاد و کەم، ئاوا: وَلاَذَا = فَعُولُنْ ب -- + کِرَلْلاَ = فعولن ب -- + هَئلْلاَ = فَعُولُن ب -- + قليلا = فَعُولُنْ ب --). بەلام لەم جێگەیەدا لە بنەڕەتدا (ذاکِرَ) (ذاکراً) بووە، واتە: تەنوینی هەبووە، دوا پیتی لە کێشدا یەکسان بووە بەبڕگەیەکی درێژ، کە یەکسان بێ بەسەبەبێکی سووک لە چەشنی سەبەبی سووکی عەرەبی ئاوا (دا = فَا -). دەی ئەگەر تەنوینی وشەی (ذاکراً) نەکرێ کێشەیەکی کێشی دروست دەبێ، چونکە ئەو کاتە لەبەر دروستبوونی گەیشتنی دوو پیتی وەستاو بەیەکتر، کە شتی وا لە عەرەبیدا دروست نییە مەگەر بەمەرجی خۆی، دەبێ لەم کاتەدا یا بخوێنرێتەوە (ذاکراً أللە) هەمزەی (اللە) بکرێ بەهەمزەی قەطع، یا بخوێنرێتەوە (ذاکرَنِ اللهَ) واتە: نوونە تەنوینە وەستاوەکە بزوێندار دەکرێ، جا ئەو کاتە کێشی دەریاکە تێکدەچێ و دێڕەکە لەنگ دەبێ، چونکە ئاوای لێ دێ: (وَلاَذا = فَعولُنْ + کِرَنَلْ = فَعُولُنْ + لاَهَئلْ = فاعِلُن + لاَ قَليلاَ = فَاعِلاتُنْ). شتی وایش لە دەریای موتەقارەبدا نییە. (ر: ٦٢ - تێبینی).

ب- کاتی رەفعە، وەک وشەی (ثَلاَثُ) بەبۆری ثێ، بەبێ تەنوین، لە شیعرە نموونەکەی ژمارە (١٤) چواردەدا، یا وەک وشەی (**سابِقُ**) لەم شیعرەدا، کە خۆی (سابقٌ = فاعِلُنْ) بووە، لەبەر ناچاری کێش تەنوینەکەی فڕە دراوە، دەنا کێشە دروست دەکا و شیعرەکە لەنگ دەبێ:

(لاَ اللَّيْلُ سَـابِقُ النَّهَارَ) يَابَهَا
صَحَّتْ شُرُوطُ حَذْفِ تَنْوينٍ بِهَا

ج- کاتی جەررە، وەک وشەی (هاشِمِ) لەم شیعرەی جەزەریدا (رەجەز):

(هَاشِمِ) مِنْ عَبْدِ مَنَافِ بْنِ قُصَيْ
كِــــلاَبِ مُرَّةِ بْنِ كَعْبِ بْنِ لُؤيْ

٤٩- پاشەکرتێ یا تەرخیمی غەیری مونادا، وەک (عَائِشٍ) لەم شیعرەدا، کە جەزەری - رەحمەتی خودای لێ بێ - لە (ذَات الشِّفَا)دا دەڵێ:

ثُمَّ بِشَوَّالِ البنا لِفاطِمَتْوَعَائِشٍ، وَقَيْنُقَاعُ الظَّالِمَهْ

لەم شیـعرەدا ئەم چەند ناچارییـە ڕوویان داوە: لە (شَوأَلِ)یدا تەرکی تەنوین کراوە (ر: ٤٨) قەصر لە (البنا)دا ڕووی داوە، ئێستە بەوەستان لەسەر تێی (فاطمة) و (الظالمة) بەهێی وەستـاو پێویستـە (عائشة) کە غەیرە مـونصەریفە مامەڵەی مـونادای بۆ کراوە، تەرخیم کراوە، پاش تەرخیمیش کراوە بەمونصەریف و ژێر و تەنوینی چووەتە سەر!!

لەم بابەتە لە کوردیدا زۆرە، بەڵام مەرج نییە دەقاودەق وەک عـەرەبییـەکە بێ، چونکە وەک هەمـوومـان دەزانین، گەلێ جار یاسا عـەروزییـەکان، لە کوردی و فـارسی و تورکیـدا، گـۆڕانکارییـان تـیادا دەکرێ. جـا لە هەر کوێ کـە دەبینین ناوێ، چ عـەرەبی، چ کـوردی، پاشەکرتێ و گۆڕانکاری وای تیادا کراوە، کە بەپێی خواستەی کێشی دەریای شیعرەکە بێ، ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەم جۆرە یاسـایەی ژێردەسـتـمـان، وەک شێخ ڕەزای تاڵەبانی - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - دەفەرموێ (رەمەل):

ژێردەسی ئەسعەد ئاغا بووین وەکو مووری زەعیف

بۆ خەلاسیمان (سمایل) وەک (سلێمان) هـاتەوە

چونکە لە بنەڕەتدا (سمایل) ئیسماعیلە و (سلێمان) سولەیمانە.

٥٠- کرتاندنی (فێ):

آ- لە وەڵامی شەرطدا (بەسیط):

مَنْ یَفْعَلِ الْحَسَنَاتِ اللهُ یَشْکُرُهَا

وَالشَّرُّ بِالشَّرِّ عِنْدَ اللـــهِ مِثْلاَنِ

ب- لە وەڵامی (أمَّا)دا، وەک (طەویل):

فأمَّا الْقِتَالُ لاَ قِتَالَ لَدَیْکُمْ     ولکنَّ سَیراً في عِرَاضِ الْمَراکِبِ

خۆی حەقی (فَلاَ قِتَالَ)ەیە (فێ)یەکەی لەبەر ناچاری کرتاوە.

٥١- لابردنی نوونی ویقایە لە (لَیْسَ)ە (رەجەز):

عَدَدْتُ قَومي کَعدِیدِ الطَّیْسِ     إذْ ذَهَبَ الْقَوْمُ الکِرامُ لَیْسِي

خۆی هەقی (لَیْسَنْيِ)یە.

٥٢- کرتاندنی نوونی (لکنْ) وەک (دەریای تەویل):

فَلَسْتُ بآتیهِ ولاَ أَستَطِیعُهُ     ولاكِ اسْقِنِي إنْ کَانَ مَاؤُكَ ذا فَضْلِ

خۆی مافی (لکن)ە، بەڵام لەبەر ڕاستکردنەوەی کێشی نوونەکە فڕە دراوە.

٥٣- کرتاندنی نوونی (الذین)ە و(اللّذان) و(اللّذینَ)ی و(اللتّانَ)ی و(اللّتَینِ) لەبەر ڕاستکردنەوەی کێش (ڕەجەز):

هُمَا اللّتَا لَوْ وَلَدَتْ تَمِيم     لَقِيلَ فَخْرٌ لَهُمُ صَمِيمُ

یا وەک (کامل):

أبني كُلَيبٍ إنَّ عَمَّيَّ اللّذا     قَتَلاَ ٱلْمُلُوك وَفَكَّكَا ٱلاغْلاَلَ

یا وەک (تەویل):

(وإنَّ **الّذي** حانَتْ بِفَلجٍ دِمائُهُمْ     هُمُ ٱلقومُ كُلَّ ٱلقَومَ يا أمَّ خَالِدِ

٥٤- کرتاندنی نوونی جەمعی موذەککەری سالم (مونسەریح):

الحَافِظُوْ عَورَةَ العَشِيرَةِ لاَ     يَأتِيهِمْ مِنْ وَرَائِنا وكَفُ

خۆی مافی (الحافِظُونَ)ەیە.

٥٥- کرتاندنی نوون لە ئەفعالی خەمسە بەبێ بوونی جازم یا ناصیب:

أ- لە موفرەدەی موخاطەبە، وەک (ڕەجەز):

أبِيتُ أسْرِي، و(تبيتِي تَدْلُكِي)

وَجْهَـكِ بِالعَنْبَرِ والمِسْكِ الذَكِي

ب- لە جەمعی موذەککەری موخاطەب، وەک:

ج- لە جەمعی موذەککەری غائیب، وەک:

د- لە موثەننای غائیب:

هـ- لە موثەننای موخاطەب

٥٦- کرتاندنی نوونی تەوکیدی سووک لە فیعل، دوا چوونە سەری، وەک:

لا (تُهِينَ) الفَقِيرَ عَلَّكَ أنْ     تَركَعَ يوماً والدَّهْرُ قَدْ رَفَعَهْ

خۆی (لا تهينَنْ) بووە.

٥٧- کرتاندنی نوونی (لَمْ يَكُنْ) کە بگات بەپیتی وەستاو، وەک (تەویل):

فَإنْ لاَ (تَكُ) المَرْأةُ أبْدَتْ وِسَامَةً     فَقَدْ أبْدَتِ المرأةُ جَبْهَةَ ضَيْغَمِ

یا وەک (ڕەجەز):

وَ الأمرُ إنْ لمْ يَكُ لِلنُّونِ مَحَلْ     فِيهِ هُوَ اسمُ نَحْوُصَهْ وَحَيَّهَلْ

خۆی (لاتكون) و (لم یكن) بووه، بۆ ناچاری كێش كراون به(تَكُ = فَعُ ب ب) كه بریتی بێ له سەبەبێكی قورس، یەكەم كه (تكون) وه یەكسانە بەوەتەدێكی كۆ و بڕگەیەكی كورت، بەڵام دووەم كه (یَكُنْ)ه، یەكسانە بەوەتەدێكی كۆ، دوا گۆڕانكارییەكان بوون به(یَكُ = فَعُ ن) كه دەكاتە سەبەبێكی قورس و بەس.

٥٨- كرتاندنی نوونی تەثنیە (تەویل):

هُما (خطّتَا) إمَّا إسَارُ وَمِنَّةٌوَإمَّا دَمُ والقتلُ بالحُرِّ أجدَرُ

خۆی (خِطَّتانِ)ی بووه.

٥٩- كرتاندنی نوونی ویقایه له (لَیْتَ) وەك (وافیر):

كَمُنیةِ جَابرٍ إذْ قَالَ (لَیْتي) أصَادِقُهُ وَأفقِدُ جُلَّ مالي

٦٠- كرتاندنی نوونی ویقایه له (عَنْ) و (مِنْ) كاتێ بچنە سەر یێی موتەكەللیم، كه بەكوردی پێی دەگوترێ ڕاناوی كەسی یەكەمی تاك. بڕوانه: جۆری دووەمی ژماره (٤).

٦١- كرتاندنی نوونی ویقایه له (قَدني) و (قَطْني) وەك (ڕەجەز):

قَدْنِي مِنْ نَصرِ اْلخُبَیبْیِن (قَدِی) لَیْسَ الإمامُ بالشَّحیحِ المُلْحِدِ

٦٢- كرتاندنی پیتێ، یا چەند پیتێ له وشەیێ، لەبەر ناچاری كێش وەك:

آ- یەك پیت، بڕوانه (بكاء) له ژماره (٢)دا، یا وەك ئەم هەڵبەستەی مەحوی، له كوردی خۆماندا (ڕەمەل):

وەقتی نوێژی سەر جەنازەی بۆ شەهیدی عیشق دۆست

مەوج ئەدا ئەم ئاسمانانە له دەنگی (الصَّلاَ) خۆی (الصَّلاَةَ)ه بووه، لەبەر ناچاری كێش و یەكێتیی سەروا، یەك پیتی لێ كرتاوه، بووه به(الصَّلاَ) ئیتر هەم كێشەكە ڕاست بۆتەوه، هەم یەكێتیی سەروا له چامەكەدا پارێزراوه. بڕوانه: ژماره (٢) شیعرەكەی مەحوی. یا وەك لەم شیعرەدا حیسابی مونادا بۆ غەیری مونادا كراوه، شیاو بۆ بانگكردن تەرخیم كراوه، (طەویل):

لَنِعْمَ اْلفتى تَعشُو إلى ضَوءِ نارِهِ

طَرِیفُ بن مَالٍ لَیْلَةَ الجُوعِ والخَصْرْ

خۆی طەریفی كوڕی مالیكە، كاف له (مالك) لابراوه لەبەر ناچاری كێش، ژماره (٥٢، ٥٣، ٥٤، ٥٧) له ڕاستیدا لەم بابەتەن.

ب- کرتاندنی دوو پیت وەک (المَنَازِل) لەم دێڕەدا کراوە بە(المَنَا) (کامیل):

دَرَسَ (المَنَا) بمتالعٍ فَأَبَانِ فَتَقَادَمتْ، فالحَبْسِ فالسُّوبانِ

لە کوردیدا وەک ڕەحمەتی، نالی دەفەرموێ (ڕەمەل):

مەمخەرە هاوییەیی هەولّی فیراق

دەستی من دامەنی تۆ ڕۆژی (قیا)

(قیا...) کورتکراوەی (قیام) یا (قیامەت)ە.

ج- کرتاندنی سێ پیت، لە کوردیدا زۆر زۆرە، بەنموونە (عبدالغفور) و (عبدالكريم) و (محی الدین) و وێنەی ئەمانە، بەچەندین جۆر گۆڕانکارییان تیادا دەکرێ، وەک شێخ ڕەزا - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - دەفەرموێ (ڕەمەل):

چایەکەی مامە (غەفوورم) زەردە وەک میزی نەخۆش

ئیحتیاج ناکــا بەئاگــر هــەر بەدوو تڕ دێتە جۆش

خۆی (عبدالغفور) یا (شێخ غفور) بووە. یا وەک لەم شیعرەدا (شێخ ڕەشید)ی کردووە بە(ڕەشە) (ڕەمەل):

ڕەشە! ڕەششاشی کەری ڕەش بەڕەشت

تا ڕەشت ماوە ڕەش و سـوور بەڕەشت

گۆران - ڕەحمەتی لێ بێ - دەڵێ ( )

شەپۆلی بای بەهرە و جۆشم مەنگ ڕاوەستا بوو

تەلی عوود و کەمـــانم (پس) کونی شمشاڵم

(پس = پساوە)

تێبینی: جاری وا هەیە، وەک لەم نموونانەوە دەرکەوت، وشەکە، لەپاش لێ کرتانەکە لەسەر حاڵی لێ کرتاوی خۆی دەمێنێ، وەک (المنا) لە (المَنَازِل)دا، وەک (قیا) لە (قیامەت)دا. بەلام جاری وایش هەیە دەسکاری تریشی دەکرێ، وەک (فُلِ) لەم شیعرەدا (طەویل):

سَلِ الناسَ إنيِّ سائلُ اللهَ وَحْدَهُ وَصَائِنُ وجهي عَنْ فُلاَنٍ وَعَنْ (فُلِ)

ابن عقيل/٢/٢٧٩

خۆی (فلان) بووه، پاش ئەوەی کە دوو پیتی لێ فڕەدراوە، لامەکەیشی ژێردارکراوە و ئیشباعیش کراوە، تا (وَعَنْ فُلِي) یەکسان بێ بە(مَفَاعِلُنْ) وە پیتی ڕەویش لە دێڕەکەدا لامی ژێرداربێ، هەتا هاوسەروابێ لەگەڵ دێڕەکانی تری ناو چامەکەدا. وەک (الحَمِي) کە کورتکراوەی (الحَمَام)ە، لەم دێڕەدا (ڕەجەز):

(أوَالِفاً مَكَّةَ مِنْ وُرْقِ ألْحَمِي). (بڕ: اختصار)

ئەوەتا کاتێ دوا پیتی کە میمە کرتاوە، لەبەر ناچاری، سەری میمی یەکەمیش قەلبکراوە بەژێر و ئەلفەکەی دوای بەیێ، هەتا یەکێتیی سەروا لە چامەکەدا پارێزراوبێ لەم جۆرە شوێنەدا گرنگ ئەوەیە: ئەوەی کە ماوە لە وشەکە دەست بدا بۆ ئەوەی کە وشەکەی پێ بناسرێتەوە، گەرچی گەلێ جار لە کوردیدا، وشە موحەررەفەکەیش وەک ئەصڵەکەی ناسراوە، وەک (حەمە) و (ئەحە) و (کەریم) و (صەلاح) و (ڕەحە) و (عەزە) و (سەعە) لە (محمد) و (ئەحمەد) و (عبدالکریم) و (صلاح الدین) و (ڕەحمە) و (عەزیز) و (سەعید)دا. (بڕوانە: ابن عقیل/١/٢٩٦ + ٢/١٥٩).

گەرچی ئەم چەند نموونانەی تریش لەم ژمارانەی دواوە، هەر لەم جۆرە بابەتەن، بەڵام لەبەر ئاسانکاری ژمارەی تایبەتییان بۆ دادەنێین:

٦٣- کرتاندنی پیتی بانگکردن (حەرفی نیداء) لەو جێگایانەدا، کە جێگەی نەکرتاندنە، کە بریتین لە مەندوب و ضەمیر و موستەغاث و اسم الاشارە و اسمی جنس. وەک (طەویل):

إذا هَمَلَتْ عَيْنِي لَهَا قَالَ صَاحِبِي    بِمِثْلِكَ (هذا!) لَوعَةٌ وَغَرَامُ

خۆی حەقی (یا هذا)یە، لەبەر ناچاری کێش (یا)کە فڕە دراوە. (ر: ٦٥).

٦٤- کرتاندنی پیتی ناصب (طەویل):

ألاَ أيُّهذا اللَّدَئمِي (أحْضُرَ) الوَغَىوَأنْ أشْهَدَ اللَّذاتِ هَلْ أنْتَ مُخلِدِي

خۆی مافی (أنْ أحضر)ەیە.

٦٥- کرتاندنی پیتی ئەلف، لە نالی/ ٥٧١ هەندێ وشە، لە بێژەی (اللّه) وەک (وافیر):

ألاَ لاَ بَارَكَ **(اللّهُ)** في سُهَيْلٍ    إذَا مَااللّهُ بَارَكَ في الرجالِ

(بڕ: ١٠١/٩)

کرتاندنی ئەلف لە (یا)ی نیداء، وەک (طەویل):

(یَذَا) اْلعَرْشِ صَبِّرنِي عَلَى ما أصَابَنِی     وَقَدْ بَضَعُّوا الحمى وَقَد قَلَّ مطمعِ

خـۆی (یاذا) بووە، ئەلفـەکـەی لەبەر ناچاری کـرتاوە. کـرتاندنی لە (ها)ی ڕاناوی مێیینەی کەسی سێیەمی تاک، وەک (بەسیط):

أمَا تَقودُ بِهِ شَاةٌ فَتَأكُلُهَا     أوْ أنْ (تَبیعَهَ) في بَعْضِ الْأراكیب

خۆی (تَبیعَهَا) بووە، لەبەر ناچاری ئەلفەکەی کرتاوە. لە (أنا)یش دروستە بکرتێ. لە کوردیشدا ئەم جۆرە کرتاندنە هەیە. نالی - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - دەڵێ (موضاریعی هەشتی ئەخرەب):

دەستم لە گەردنی خۆت هەڵمەگرە ئەی حەبیبە!

(وەبزْانە) خوێنی خۆمـــە، یا میننەتی ڕەقیبە

ئەمـە خـۆی (وابزانە) بـووە، لەسـەر کـێـشی (فـاعـلات-ب-ن) بێـکەی بزێو بـووە، جـا بەیاســای (بۆ ناچاری پیــتی بزوێندار بێ بزوێن دەکـرێ) بێـکەی زەنەدار کــراوە، بووە بە(وابزانە) ئەو بەیاسـای دوو پیتی وەسـتـاو و کۆ بـبنەوە، بۆ چارەی ئەم کـێشـەیە کـە لە عـەرەبیـدا پێی دەگـوترێ (التـقـاء السـاکنین)وە دروست نـیـیـە، بۆ چارەی ئەمـە پیـتـە نەرمەکەیان کە ئەلفەکەیە و پێی دەگوترێ پیتی عیللە دەکرتێ و دەبێ بە(وەبزْانە = مَفْعُول -- ب).

ئەسیرییش - بەڕەحمەت چێ - دەفەرمووێ:

ئەم بیست و چواری ئایارە، (کوردە!) ماتەمە

ڕۆژی موسیبەت و بەڵا و پەرێشانی و غەمـە

لەم ڕۆژە شێخی نەهری و پاڵو شەهید کـــران

لەو کـــاری تورکــە مـرۆ ئەمـرۆ سەرسەمــــە

خۆی (سەرسامە) بووە، بۆ پاراستنی یەکێتی سەروا لە چامەکەدا ئەلفی (سـەرسـامـە) کرتاوە، چونکە سەرواکان لە چامەکەدا ئەم وشانەن:

(ئەمە، ئادەمە، تەمە، کەمە، خومـە، شەرتمە)، کـوردەیش ئەی کوردە بووە. کـرتاندنی ئەلف، یا پیت لە شیـعری کێـشی پەنجـەیشدا، بۆ پێـویسـتـیی کێش دەکـرتێ. وەک (دە بڕگەیی):

تا لە ریسوایی سوالّ (قوتەرت) بێ

حـــــالّ و مـــالّێکی سەروبەرت بێ

خۆی (قوتارت) بێیە.

٦٦- کرتاندنی پیتی لین، یا عیللە بەشێوەیەکی گشتی. هەروەکو لە کاتی ئیشباعا ئەلف و واو و یێ زیاد دەکرێن، بۆ سافکردنی کێش، لە هەندێ کاتدا ئەم سێ پیتە بۆ ڕاستکردنەوەی کێش پێویستە بکرتێن، نموونەی زۆریان لە ژمارەکانی پێشەوە ڕابوورد، بەلاّم هێشتا نموونە و یاسای زۆری تریان ماوە:

آ- ئەلف کە بەشی وشەبێ لە فیعلیشدا لادەبرێ، بەمەرجێ بزوێنەکەی پێشی کەسەرە بێنێ. وەک (رەجەز):

وَصَّانِيَ العَجَّاجُ فيما (وَصَّنِي)

خۆی (وَصَّانِي) بووە.

ب- پیتی لین، بەشی وشەیش نەبێ، هەر دروستە بۆ سافکردنی کێش بکرتێ، وەک واوی ضەمیر، خۆی دەکرتێ و بزوێنەکەی پێشی دەمێنێ لەباتی خۆی، وەک (وافیر):

وَلَوْ أنَّ الأطبَّاءَ (كانُ) حَولِي     وكَانَ مَعَ الأطبَّاءِ شِفَاءُ

خۆی (کانوا) بووە، بۆ ئەوەی بەپێی پێیەکانی بەحری وافیر (نُوحَوْلِي = مفعولن---) ببێ بە(نُحَـوْلِي = فَعُـولُن ب --) واوی (کـانـوا)ی جەمع کرتـاوە، وە بەبۆری نوونەکە ئیکتیفا کراوە، ئەلفەکەیش ڕۆڵی جیاکردنی نەماوە، ئەویش لە خەتدا سڕاوەتەوە.

ج- کرتاندنی یێی لین (رەجەز):

سَنَةَ سَبْعٍ، خَيْبَرٍ، وَادِي الْقُرى     وَبَعَثَ النَّجاشِ أيضاً جَعْفَرَا

خۆی (النجاشی)یە، ئەگەر یێی (النجاشِي) نەکرتێ شیعرەکە لەنگ دەبێ پارە پارەی کەرتی دوودمی ئاوایە:

(وبَعَثَلْ = فَعِلَتُنْ ب ب ب -) + (نَجَاشِيْ = مفاعلن ب - ب -) + (ضَنْجَعْفَرَنْ = مستفعلن -- ب-).

یا وەک یێی بەشی وشە لەم شیعرەدا (کامیل):

كَنَوَاحِ رِيشِ حَمَامَةٍ نَجْدِيَّةٍوَمَسَحْتَ باللثَتَيْنِ عَصْفَ الإثْمِد

خۆی (نَوَاحِي)یه، لەبەر ڕاستکردنەوەی کێش لە کاتی ئیضافەدا مامەڵەی کاتی تەنوینی بۆ کراوە، چونکە وشەی مەنقووص، وەکو (قاضی) و (رامی) و (نواحی) و (عوالی) لە کاتی تەنویندا، یێکەی ئاخریان دەکرێ، دەبن بە (قاضٍ، رامٍ، نَوَاحٍ، عَوَالٍ) بەڵام لە کاتی ئیضافەدا (ی) کە زیندوو دەبێتەوە، جا لێرەیشدا (نَوَاحٍ) گەرچی ئیزافەیش کراوە بەڵام مامەڵەی کاتی تەنوینی بۆ کراوە لەو ڕووەوە کە یێکەی زیندوو نەکراوەتەوە، لەبەر ئەوەیش کە ئیزافە کراوە تەنوینی بۆ دانەنراوە.

د- کرتاندنی واوی لینی بەشی وشە، وەک (رەجەز):

الرُّومُ وَالشَّامُ وَبَيْتُ الْمَقْدِسِ    هذَا الَّذي أضْمَرَهُ الأنْكُرُسِي

خۆی (الأنكروسي)یە، واوەکەی لەبەر کێش کرتاوە.

هـ- کرتاندنی واوی (هُوَ)ە و یێی (هِيَ) بڕوانە: (١٣ - ب، ج).

٦٧- کرتاندنی (ی) لە (الَّذي) و (الَّتي) و (اللَّوَاتي). وەک (رەجەز):

فَظَلْتَ في شَرٍّ مِنَ اللَّذْ كِيدا    كَمَنْ تَزَبَّى زُبْيَةً فَاصْطِيدا

خۆی (الَّذِي) بووە. وەک (وافیر):

فَقُلْ لِلَّتْ تَلومُكَ: إنَّ نَفْسي    أرَاهَا لاَ تَعَوَّذُ بِالتَّمِيمِ

خۆی (لِلَّتِي) بووە. کرتاندنی (یێ) و (تێ) لە (اللَّواتِي). وەک (رەجەز):

جَمَعْتَها مِنْ أيْنُقٍ غِزَارِ    مِنَ (اللَّوَا) شَرَفْنَ بِالصِّرَارِ

خۆی (اللواتي) بووە، لەپاش لابردنی (ی) لە (الذی) و (التی) دروستە ذال و تێکەیش وێستا و (ساکن) بکرێن، دروستیشە بەژێرداری بمێننەوە.

٦٨- کرتاندنی ئەلف لە (كِلْتا) وەک (رەجەز):

في (كِلْتَ) رِجْلَيْهَا سُلاَمَى زَائِدَهْ    كِلْتَاهُمَا قَدْ قُرِنَتْ بِواحِدَهْ

خۆی (كلتا)یە.

٦٩- کرتاندنی واوی صیله (بەسیط):

وَأشْرَبُ الماءَ (...) مَا بِي نَحْوَهُ عَطَشُ
إلا لأنَّ (عُيُونَهْ) سَيْــلُ وَادِيهَــا

خۆی هەقی (... ومَا بيْ)یە.

٧٠- كرتاندنی لامی ئەمر (وافیر):

مُحَمَّدُ! (تَفْدِ) نَفْسَكَ كُلُّ نَفْسٍ    إذا مَا خِفْتَ مِنْ شَيْءٍ تَبَالاً

خۆی هەقی ئاوایە: (یا محمدُ لِتَفْدِ) یێی نیدا و لامی ئەمری سەر فیعلی (تَفْدِی) کرتاوە، نیشانەی ئەوەیش کە لە دلّا هەیە و کرتاوە، یەکەم مەعناکەیەتی، دووەم حەزفی (ی)یە لە فیعلی (تَفْدِ) کە لێرەدا غەیری لامی ئەمر، دەست نادا کە تەقدیر بکرێ.

٧١- کرتاندنی شەرط و جەواب (رەجەز):

قَالَتْ بَنَاتُ الْعَمِّ یا سَلْمى وَإِنْ    كَانَ فَقِيراً مُعْدِماً قَالَتْ وَإِنْ

خۆی (وَإِنْ كَانَ فقيراً مُعْدَماً) بووە.

٧٢- کرتاندنی مەجزوومی (لَمْ) وەک (کامل):

احْفَظْ وَدِيعَتَكَ الَّتِي اسْتَودَعْتَهَا    يَوْمَ الْأعَارِبِ إِنْ وَصَلْتَ وَإِنْ لَمْ

لە بنەڕەتدا (وَ إِنْ لَمْ تَصِلْ) بووە.

٧٣- کرتاندنی (إمَّا) لە ڕستەدا (مُتَقَارب):

سَقَتْهُ الرَّوَاعِدُ (...) مِنْ صَيِّفٍ    و... إِنْ مِنْ خَرِيفٍ فَلَنْ يُعْدَمَا

خۆی (... إمَّا مِنْ صَيِّفٍ وَ إمَّا مِنْ خَرِيفٍ...) بووە.

٧٤- کرتاندنی ئیسمی (لیتَ) ئەگەر ڕاناو بوو (تەویل):

فَلَيْتَ دَفَعْتَ الهَمَّ عَنِّي سَاعَةً    فَبِتْنَا عَلَى مَا خَيَّلَتْ نَاعِمِيْ بَالِ

خۆی (لَيْتَكَ)ەیە.

٧٥- کرتاندنی مەوصوول و هێشتنەوەی صیلەکەی (طەویل):

عَدَسْ مَا لِعَبَّادٍ عَلَيْكِ إِمَارَةٌ    نَجَوْتِ وَهذا تَحْمِلِينَ طَلِيقُ

هەقی خۆی (وَهذا الَّذِي تَحمِلِينَ)ەیە.

٧٦- کرتاندنی ئیسمی (لکن) وەک (تەویل):

وَلَكِنَّ مَنْ لاَ يَلْقَ أَمْراً يَنُوبُهُ    بِعُدَّتِهِ يَنْزِلْ بِهِ وَهْوَ أَعْزَلُ

خۆی (لكنه) بووە.

٧٧- کرتاندنی ئیسمی (إنَّ) وەک (خفیف):

إِنَّ مَنْ يَدْخُلُ الكَنِيسَةَ يَوماً    يَلْقَ فِيهَا جَآذِراً وَظِبَاءَ

خۆی (إنه من...) بووە.

٧٨- کرتاندنی (ما)ی نافیه (طەویل):

لَعَمْرُ أبي دَهْماءَ (زَالَتْ) عَزيزَةً    عَلَى قَومِهَا مَا فَتَّلَ الزَّنْدَ قَادِحُ

خۆی (مازالت) بووە.

٧٩- کرتاندنی (أنْ) لە خەبەری (عَسی) وەک (وافیر):

عَسَى الكَرْبُ الَّذي أمْسَيْتَ فيهِ    يَكونُ وَرَاءَهُ فَرَجٌ قَريبُ

خۆی هەقی (ان یکون)ەیە.

٨٠- کرتاندنی (رُبَّ) لەپاش (واو) و (فێ) و (بَلْ)ەوە:

آ- (وَ) لَيْلٍ كَمَوْجِ البَحْرِ أرْخى سُدُولَهُ    عَلَيَّ بأنْواعِ الهُمُوم لِيَبْتَـكي

ب- فمثلك حُبْلَى قَدْ طَرَقْـــتُ وَمُرضِعٍ    فَألْهَيْتُهَا عَنْ ذي تمائم مُحْوِل

ج- بَـلْ بَلَـدٍ مِـــلأ الإكْمَـــامِ قَـتَمُـهُ    لاَ يُشْتَـرى كَتَانُـهُ وَجَهْرَمُـهْ

٨١- کرتاندنی (قَدْ) لە ماضی کە لە جەوابی قەسەما واقیع بێ (طەویل):

حَلَفْتُ لَهَا باللهِ حِلْفَةَ فَاجِرٍ    لَنَامُوا فَمَا إنْ مِنْ حَديثٍ وَلاَصَالِ

٨٢- کرتاندنی ضەمیری شەئن، کاتێ ئیسمی (إنَّ) و (أنَّ) و (لكن) و (لعل) و (لیت)ە بێ. وەک (طەویل):

كَأنَّ عَلَى عِرْنَيْنِهِ وَجَبينِهِ    أقَامَ شُعَاعُ الشَّمْسِ أوْ طَلَعَ البَدْرُ

خۆی (کأنه) بووە، بڕوانە (٦٣، ٦٥، ٦٦).

٨٣- کرتاندنی حەرفی جەڕ و جوزئێ لە ئیسمی جەلالە. وەک (بەسیط):

لاَهِ ابنُ عَمِّكَ لاَ أفْضَلْتَ في حَسَبٍ    عَنّي، وَلاَ أنْتَ دَيَّاني فَتَخْزُوني

خۆی (للّه) بووە، لەپێشا لامی حەرفی جەڕی لێ کرتاوە، ماوەتەوە (ألله) بەمەجڕووری، لەپاشدا (أل)ی تەعریفیشی لێ لابراوە ماوەتەوە (لاَهِ) (ر: شەرحی ئیبنو عەقیل لەسەر الفیەی ئیبنو مالیک ج/٢ ص٢٣ ط/١٤).

٨٤- کرتاندنی تێی تەئنیثی خڕ:

١- لە تاک (موفرەد) وەک (ڕەجەز):

وَ إذْ أتَى أبُوهُرَيْرَ في غَدهْ    بِتَمَرَاتٍ صَفَّهُنَّ في يَدهْ

خۆی (أبوهریرة)ە بووە. زۆر جار لەبەر ناچاری کێش (خدیجة و عائشة و فاطمة و طلحة و طعمة) دەکرێن بە(خدیج و عائش و فاطم و طلحه و طعمه).

٢- له موثەننای ناو وەک (رەجەز):

آخِرُ مَا نزلَ آيَتَان    فِي آخِرِ التَّوبَةِ ثَابِتَانِ.

خۆی (ثَابِتَتَانِ)یە.

٣- له موثەننای فیعل، وەک (رەجەز):

وَأمرَ اثنَتَيْنِ مِنْ بَيْنِ الشَّجرْ    (فَاجْتَمَا وَاْفتَرَقَا) كَمَا أمَرْ

٨٥- له بابی (افتعال) کە لە (تقوی) دروست بکرێ، لە هەموو متصرِفەکانی دروستە فائەلفیعلەکەی بکرتێ، وەک (وافیر):

تَقُوهُ أيُها الفِتْيانُ أنّي    رَأيْتُ اللّهَ قَدْ غَلَبَ الجُدُودَ

خۆی (اتَّقُوهُ) بووە.

٨٦- کرتاندنی بزوێنی ئیعراب، لەبەر ناچاری کێش، وەک (سەریع):

فَالْيَوْمَ (أشربْ) غَيْرَ مُسْتَحْقِبٍ    إثْماً مِنَ اللّهِ وَلاَ وَاغِلِ

یا وەک (رەجەز):

يَرْقَعُ ثَوْبَهُ (وَيخْصِفْ) نَعْلَهُ    وَيَرْكَبُ الفَرَسَ ثُمَّ يَغْلَهُ

یا وەک ئەم شیعرەی تر، کە (هَن)ی مەرفووعی فاعیل ساکنە:

رُحْتُ وَفي رِجْلَيكِ مَا فيهِمَاوَقَدْ بَدَا (هَنْكِ) مِنَ الْمِئزَرِ

تێبینی: ئێمە ئەم نموونانە بۆ ئەوە دەهێنینەوە، هەتا شاعیرانی کورد، لەم زانستە تەواو تەواو شارەزا بن، وە لە ئایینددا وەک لەمەوپێش سوود و بەهرە لەم دەستوورانە وەربگیرێ، چونکە ئێمە هەتا لە سەرچاوە عەرەبییەکە حاڵی نەبین، ناتوانین لە کوردیدا پیادەی بکەین، هۆی سەرکەوتنی نالی و مەحوی و مەولەوی و وەفایی و شێخ ڕەزا، حاڵیبوونیانە لە عەرووز.

داخەکەم کەسانێ پەیدا بوون دژایەتیی زمان و ئەدەبی عەرەبی بەوپەڕی کوردایەتی دادەنێن. هەموو کەس دەزانێ کە هیندستان موستەعمەرەی بەریتانیا بووە، لەگەڵ ئەوەیشدا هەتا ئێستایش لە هیندستاندا زمانی ئینگلیزی یەکەمە. جا بفەرموون سەرنج بدەن کە هەستیارە پێشینە کوردەکان چۆن چۆنی، زۆر بەوردی لەم وردەکارییانە حاڵی بوون و هەزمیان کردوون و زۆر بەوەستایانە، لە زۆربەی ئەم یاسا و ڕێسایانە سوودیان وەرگرتووە و، لەناو شیعری کوردیدا بەکاریان هێناون. لەپێشەوە بازێ نموونەمان لە

چۆنێتیی پیادەکردنی ئەم دەستوورانەدا لە کوردیدا هێنایەوە، وا ئێستەیش کۆمەڵێ تر باس دەکەین و دەڵێین:

یەکەم: وەک دەزانین ناچارییە کێشییەکان لەبەر ئەم مەبەستانە بەکار دەهێنرێن:

١- ڕاستکردنەوەی کێش، واتە: ئەگەر ئەو روخصەتە شیعرییە بەکار نەهێنرێ شیعرەکە لەنگ دەبێ. وەک گۆران - رەحمەتی خوای لێ بێ - دەڵێ (هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەحذووف):

تاکــو لــە پــڕا کەوتمە نــــاو دۆزەخی غوربـــەت

کەم کەم سپی بوو یاد(ت) لەسەر لەوحی خەیاڵم

بەپێی ناوی کێشەکە دەشێ ئەم دێڕە ئاوا بکێشرێ: (مَفْعُولُ -- ب) + (مَفَاعِيلُ ب -- ب) + (مَـفَاعِـيلُ ب -- ب) + (فَعُـولُنْ ب --). چونکە کـە دەڵێین هەزەجـە، ئەوە واتای وایە پێیەکانی بریتین لە پێی (مَفَاعیلن ب ---) و گۆڕاوەکان (مزاحفات)ەکانی، کە دەڵێین: هەشتی واتە: هەر دێڕێکی بریتییە لە هەشت پێ، بروانە (خەرب و کەف و حەذف لە هەزەجدا، لە لیستەکاندا) هەتا بەباشی لەم سێ زاراوە تێبگەیت. ئێستا ئەم هۆنراوەیە دەکێشین، تا بزانین لەنگە یا سافە:

(تاکو لە = مفعول -- ب) + (پڕا کەوت = مَفَاعیلُ ب -- ب) + (مەناودۆزە = مَفَاعِيلُ ب -- ب) + (خیغوربەت = فَعُولُنْ ب --) × (کەم کەمس = مفعول -- ب) + (پیبوویاد = مَفَاعِيلُ ب -- ب) + (لەسەر لەوحی = مفاعیل ب -- ن) + (خەیاڵم = فعولن ب --). وەک دەردەکەوێ شیعرەکە و کێشەکە دەقاودەق دەرچوون، بەمەرجێ (ت)ی وشەی (یادت) لەسەر شێوەی ئاخاوتنی سلێمانی نەخوێنرێتەوە، ئەم جۆرە نموونە کوردییانە لە جۆری قیاسی ڕاناو لەسەر ڕاناوە، بەوێنە لە عەرەبیدا، وەک لە ژمارە (٦٦ - ب)دا دەردەکەوێ، واوی ڕاناوی کۆ لە (کانوا)دا لەبەر ڕاستکردنەوەی کێش کرتاوە، جا لەسەر ئەم بنیاتە لە کوردیشدا، تێی (یادت) کرتاوە.

٢- بۆ پاراستنی یەکێتیی سەروا، وەک شیعرەکەی نەسیری و شیعرە دە بڕگەییەکەی کۆتایی ژمارە (٦٥). یا وەک ئەم هەڵبەستەی خوالێخۆشبوو مەحوی:

لە ئاوی تێغی هەر زامێ بو ئاوا     برینی من نەبێ هەر وایە وەیران

(وەیران) خۆی (وێران)ە، لەبەر ڕاگرتنی هاوسەروایی لەگەڵ دێڕەکانی تری چامەکەدا دەسکاری کراوە، چونکە وشەکانی تری ئەم چامەیە ئەمانەن: (حوزەیران، سەیران،

جـــەیران، وەیران، طەیران، حـــەیران، دەیران). بۆیە ئەمـــەیش لە جـــۆری ڕاگـــرتنی هاوسەروایییە، چونکە (وەیران) و (وێران) کێشەکەیان یەکە کە (فَعْلُنْ --)ە، بەڵام هاوسەروا نین، بڕوانە (حەرەکاتی سەروا).

٣- هەیە دەسکاری و ناچارییەکە لەبەر ڕاگرتنی سەنگی دێڕەکە و هاوسەرواییشە، وەک کردنی (قیامەت) بە(قیا) کە هەم یەکێتی سەروا رادەگرێ و هەم لەنگی کێشی شیعرەکە ساف دەکا (بڕوانە: ٦٢ - ب) شیعرەکەی نالی، هەروا شیعرەکەی مەحوی (الصَّلاَ).

دووەم: حەذف و کرتاندنی تریش هەیە وەک:

آ- کرتاندنی عاطف و معطوف، وەک (رەجەز):

(سَنَةْ ثَلاَثٍ سَادِسَ العِشْرِينَ)

خۆی ئاوایە: (سَنَةَ ثَلاَثٍ وَعِشْرِينَ...)

ب- کرتاندنی عاطیف بەتەنها وەک (رەجەز):

وَمِنْهُ ذوُ فَتْحٍ وَذوُ كَسْرٍ وَضَمْ    كأيْنَ أمْسِ حَيْثُ وَالسَّاكِنُ كَمْ

خۆی ئاوایە (... كَأيْنَ وَأمْسِ وَحَيْثُ...). ئەمە لە کوردیدا هەر زۆر زۆرە، مەولەوی - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - دەفەرموێ:

چوو، بوو، دی، بیستی، کریا، دریاوە

هاتـــەوە حەلقە هەر دەلـەریـــــاوە!!

خۆی ئاوایە: (چوو وە بوو وە دی وە بیستی وە کریا وە دریاوە، کە هاتەوە حەلقەکە هەر دەلەریاوە). لەم شیعرەی مەولەویدا، لە پێنج شوێندا (و)ی عەطف کرتاوە، وە (کە)ی پەیوەست لەنێوانی دوو ڕستەکەدا کرتاوە، هەروا (کە)ی ناسینیش لە (حەلقە) کرتاوە.

**(جۆری سێیەم: چەند گۆڕانکارییەکی تر):**

٨٧- کردنی موذەککەر بەموئەننەث، وەک (کامیل):

لَمَّا أتى خَبَرُ الزُّبَيْرِ تَوَاضَعَتْ    سُورُ المَدِينَةِ وَالجِبَالُ الخُشَّعُ

خۆی هەقی (تواضَعَ)ە بوو.

٨٨- کردنی مؤنث بەمذکَّر، وەک (بەسیط):

إنَارَةُ العَقْلِ (مَكْسُوفُ) بِطَوْعِ هَوى    وَعَقْلِ عَاصِي الْهَوى يزدَادُ تَنْوِيرا

خۆی مافی (مکسوفة)ە، بەڵام لەبەر ڕاگرتنی کێش کراوە بە(مکسوف). بڕوانە: (٨٣).

٨٩- کردنەوەی پیتی گیراویدار (فَكُّ اْلُمدَّغَم). (طەویل):

وَلاَ يُبْرِمُ اْلامرْ الَّذي هُوَ حَالِلٌ    وَلاَ يُحْلَلُ الأمْرَ الَّذِي هُوَ مُبْرَمُ

٩٠- پێشخستنی مەعطووف لە مەعطووفوعەلەیهی، وەک (وافیر):

(عَلَيْكَ) وَرَحْمَةُ اللّهِ السَّلاَمُ

خۆی هەقی: (عَلَيْكَ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللّهِ)یە. مەحوی و نالی - ڕەحمەتی خودایان لێ بێ - بەهرەیەکی زۆریان لەم جۆرە دەستووره وەرگرتووە، بەتایبەتی مەحوی، لەم دێڕەدا مەحوی ئ وەی مافی پێشخستنە دوای خستووە و ئەوەی مافی دواخستنە پێشی خستووە. دەڵێ (هەزەج):

دەترسم گەردی خوێنی من لە شیشەی گەردنت نیشێ

وەگەرنا، غەم نییە بمرم لە حەسرەت لێوی مەیگوونت

چونکە مەحوی دەیەوێ بفەرمووێ:

من خەمی خۆمم نییە، گەر لە تاو دەردی دووریی لە لێوی سوور و ئاڵی تۆ بیشمرم دەربەست نیم، بەڵام مەترسی ئەوەم هەیە، کاتێ من لە ئەشقی تۆ شەهید ببم، ئۆ اڵی من بچێتە ئەستۆت و تۆزی خوێنی وشکەوە بووم لە مینای گەردنی بلوورینت بنیشێ و تەڵخ و لەکەداری بکا، شتێ وایش وەڵامی تاوانە بەتاوان، بۆیە نامەوێ بەو دەردیی دوورییە بمکوژێ!

یا ئەم شیعرەی تری کە چەندین پاش و پێشی تیادا کردووە (ڕەمەل):

کۆتری دڵ، چەنگوڵی بازی قەضا -یەعنی موژەی-

دی، بەزوڵفی چوو پەنا با، کەوتە نێو داوی بەڵا

واتە: کۆتری بەسەزمانی دڵ، کاتێ چنگی بازی قەزاوقەدەری دی، کە برژانگی یارە، لە ترسا چوو پەنای بردە بەر زوڵفی، هەتا خۆی تیا حەشار بدا و ڕاو نەکرێ، کەچی لەوێیش دیسان کەوتە ناو داوی قەزاوقەدەرەوە، گەرچی لە چنگی باز ڕزگاری بوو، بەڵام کەوتە ناو داوی ڕاوچییەوە و ئەوەی لێی دەترسا ڕوویدا.

٩١- مەبەست لە موفرەد، موثەننا یا جەمع بێ، یا بەپێچەوانەوە:

آ- گوتنی تاک و مەبەست دوو بێ، وەک (بەسیط):

كأنَّهُ (وَجْهُ) تُركِيَّيْنِ قَدْ غَضَبا    مُسْتَهْدَفُ لِطِعَان غَيْر تَذْبِيبِ

ب- مەبەست لە تاک و کۆ بێ، وەک (وافیر):

كُلُوا فيِ نِصْفِ بَطْنِكُمْ تَعِيشُو    فَــــانَّ زَمَانكُمْ زَمَنُ خَمِيصُ

خۆی (بُطُونِكم)ە لەگەڵ (وَجهَا تركيتين...).

لە کوردیدا ئەم جۆرە تەعبیرە زۆرە، وەک نالی دەفەرمووێ:

(کانی) دەزێــن بەئاو و (درەخت) ئاوســن بەبـا

شـایی بەهارە، بـولبولـــە داماد و غونچە بـووک

وەک چاوی وشکەسۆفییە (کانی) لە دار و بەرد

دەدرێن، بەصەد تەرەننوم و گریان و نووکە نووک

خۆی (کانییەکان دەزێن و دەردێن...). یا وەک ئەم هەڵبەستە دە بڕگەییە:

ئای چەنـدەم دیوە گـەورە کچی دیل

ئەنفـــالـکراوی بـــارکـــراو لە زیل

(جەلەی کردبوون) جاشێکی زەلیل

(دەیبرد) بۆ ئاغـای لەباتی بەرتیل

خۆی هەقی ئاوایە: دەیبردن بۆ ئاغای لەباتی بەرتیل.

٩٢- ڕاناو (ضەمیر) پێش بخرێ لەسەر مەرجەع، وەک:

لە کوردیدا وەک نالی دەفەرموێ:

(دەس بەندیانە) (دێن و دەچن) سەروو نارەوەن

صاحێب کولاه و سایە و بەرگن وەکو مولـــووک

صافی - کاکی هێرانیش - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - دەفەرمووێ (ڕەمەل):

گەر مەرامی کوشتنە یارم چە باکم ســەر نییە

وا ئەسەف، ئەمما کە دامێنی بەمن خوێنێن دەکا

چونکە خۆی ئاوایە، پاش و پێشی تیاکراوە: (یارم گەر مەرامی کوشتنی منی هەیە...).

٩٣- خەبەردان لە موئەننا بەموفرەد، یاسایە مویتەدا و خەبەر دەبێ لەم جۆرە شتانەدا چوون یەک بن، وەک (طەویل):

حَشَایَ عَلَى جَمْرٍ ذَكِيٍّ مِنَ الغَضَاوَعَيْنَايَ فِي رَوْضٍ مِنَ الْحُسْنِ تَرْتَعُ

خۆی هەقی (... تَرْتَعانِ)یە.

٩٤- دابڕینی مضاف لە مضاف الیه، بەئەجنەبی، وەک (کامیل):

مَازَالَ يُوقِنُ مَنْ يَؤُمُّكَ بِالغِنَى    وَسِوَاكَ مَانِعُ - فَضْلَهُ - المحتاجِ

خۆی ئاوایە: (وَسِوَاكَ مَانِعُ المحتاجِ فَضْلَهُ)

٩٥- دروستکردنی ترکیبی إضافی لە عەددا، لەسەر ئەم شێوەیە:

(ثانی عشرین، سادس العشرین، ثالث التسعین) وەک (رەجەز):

وَقُبِضَ الصَّدِيقُ ذَاكَ الْاولى    ثَانِي عِشْرِينَ جمادى الأُولى

ئەوەتا لەم شیعرەدا بەشی یەکەم کە (ثانی)یە إضافە کراوە بۆ لای (عشرین) خۆی هەقی ئاوایە: (... فی الثانی والعشرین).

٩٦- بێ بزوێنکردنی بزوێندار، کە پیتی عیللە بێ، تا بارودۆخێکی وا دروست ببێ، کە ببێ بەهۆی کرتاندنی، وەک (رەجەز):

وَمَعَهُ الصَّدِيقِ (ثانِي) اثْنَيْنِ    وَنَزَلاَ قُبَاءَ فِي الْإِثْنَيْنِ

خۆی (ثانيِ اثْنَيْنِ) بووە، بەسەری یێ، وشەی (ثانی) کە مەنقووصە، مامەڵەی مەقصووری بۆ کراوە، تا ببێ بە(ثانی) بەزەنەی یێ، جا ئەو کاتە لە نێوانی یێ و ثێدا التقاء الساکنین ڕوو دەدا، یائەکە پیتی عیللەیە بێ هێزە دەکرتێ و کێشەکەیش بەم کردارانە ڕاست دەبێتەوە.

ئەم وردەکاری و وەستاکارییەی کە لەم شیعرەدا باسمان لێ کرد، بەزیادەوە لەم هۆنراوەی مەحویدا ڕەنگ دەداتەوە (وافیر - یا - هەزەجی مەحذووف):

شەرەف هەر عیلمە، نابینی کە ئەشرەف

موشەررەف بوو بەئەمر ئەووەڵ بە(إقْرَأْ)!

لەنیوە دێڕی دووەما، هەستیار هەتا خۆی ڕزگار بکا لە قورسی کێش بزوێنی هەمزەی (ئەووەڵ) دەگوێزێتەوە بۆ پێش خۆی، کە ڕێی (ئەمر)ە، جا لەبەر بەیەکگەیشتنی دوو پیتی وەستاو، کە ئەلفی سەرەتای (أول)ە و واوەکەی پاشیەتی ئەلفەکە دەکرتێ دەبێ بە:

موشەررەفبوو    بەئەمرەوودڵ    بەإقرا

ب ---    ب ---    ب --

مفاعیلن    مفاعیلن    فعولن

٩٧- تەنوین کە دەگات بەپیتی بێ بزوێن دەبێ بەنوونێکی ژێردار، وەک (رەجەز):

كَلاَمُنَا لَفْظُ مُفِيدُ كاسْتَقِمْ    واسْمُ وَفِعْلُ ثُمَّ (حَرْفُنِ) الكَلِمْ

٩٨- ضەمیری موتتەصیل (ڕاناوی لکاو) لەبەر ناچاری بەدوا (إلاَّ)دا دێ، وەک (طەویل):

أَعُوذُ بِرَبٍّ العَرْشِ مِنْ فِئَةٍ بَغَتْ    عَلَيَّ، فَمَالِي عَوْضُ (إلاَّهُ) نَاصِرُ

یا وەک (بەسیط):

وَمَا عَلَيْنَا -إذَا مَا كُنْتِ جَارَتَنَا-

أَنْ لاَ يُجَـــاوِرَنَا (إلاَّكِ) دَيَّــارُ

٩٩- جاروبار لەبەر ڕاستکردنەوەی کێش ڕاناوی لکاو دەکرێ بەڕاناوی جیا، وەک (بەسیط):

بالباعِثِ الوارِثِ الأَمْوَاتِ قَدْ ضَمِنَتْ

(إيَّاهُمُ) الْأَرْضُ فِي دَهْرِ الدَّهَــارِير

١٠٠- لەبەر هاوسەروایی و ناچاری کێشی، گەلێ جار ئاخر پیتی عەروض و دوا پیتی ضەرب دەسکاری دەکرێن، بەپێی شوێن دەگۆڕێن، بەتایبەتی لە چامەدا، پیتی ئیعراب، یا پیتی ڕەوی لە سەروادا، خۆی هەقی ئەوەیە کە بێ بزوێن بێ، شاعیر بزاوی دەکا، یا بەپێچەوانەوە، یا مافی ئەوەیە بۆری هەبێ، کەچی ژێری هەیە، یا سەری هەیە، یا بەپێچەوانەوە. وە ئەمە لە عەرەبی و کوردیدا هەر زۆر زۆرە. وا ئێستا بۆ سەر مەشق و ڕاهێنان چەند نموونەیێ دەنووسین، وەک (طەویل):

إِذَا ٱلْقَوْمُ قَالُوا مَنْ فَتَى خِلْتُ أَنَّنِي    عُنِيت، فَلَمْ أَكْسَلْ وَلَمْ أَتَبَلَّدِ

خۆی مافی (وَلَمْ أَتَبَلَّدْ)ە، بەدالی بێ بزوێن، بەڵام لەبەر ئەوەی پیتی ڕەوی لە سەراسەری چامەکەدا دالی ژێرداره، لێرەیشدا کراوه به(وَلَمْ أَتَبَلَّدِ = فَعُول ب - ب) + (تَبَلَّدِي = مَفَاعِلُنْ ب - ب -).

یا وەک (وافیر):

وَأَنَّا الْمَانِعُونَ لِمَا أَرَدْنَا وَأَنَّا النَّازِلُونَ بِحَيْثُ شِينَا

خۆی (شِئْنَا) بووە، قەلبی هەمزەکە کراوە بەیێ، بۆ ڕەچاوکردنی یەکێتیی پیتی ریدف لە سەراسەری سەرواکانی چامەکەدا. چونکە لەم جۆرە وشانەن: (رضينا، فينا، ساجدينا...).

یا وەک (خەفیف):

فَملكْنَا بِذَلِكَ النَّاسَ حَتىً مَلَكَ الْمُنْذِرُ بْنُ مَاءِ السَّمَاءُ

خۆی (مَاءُ السَّمَاءِ)یە بەژێری پیتی ڕەوی، بەڵام لەبەر ئەوەی لە سەرواکانی تری چامەکەدا پیتی ڕەوی هەمزەیەکی بۆرداره، لێرەیشدا بۆ هاوشانی ئەوان هەمزەی (السماء) بەمەضموومی دەخوێنرێتەوە، نەک بەمەکسووری. بڕوانە: (ژمارە: ٤+ ١٢+ ١٩+ ٥٥+ ٩٦). بۆ نموونەی کوردی بڕوانە ژمارە: (٦٥- شیعرەکەی ئەسیری).

لێرەدا بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست ئەم ڕەخنەیەی مامۆستا رەفیق حیلمی دەنووسین، کە لە شێخ سەلامی دەگرێ، لە تەرجەمەی ئەم هەڵبەستەی خەیاما: (لەبەر خەلق نۆرە بۆ سەر من نایە...). مامۆستا رەفیق دەفەرمووێ:

ئەوەش لەوێ بێ کە (نایە) ئەگەر لەبەر ناچاری قافیە (سەروا -ن) نەبێ و بەئیملای ڕاستی بنووسرێ، نەبێ بە(نایێ). (بڕوانە: شعر و ئەدبیاتی کوردی - بەرگی یەکەم - لاپەڕە/٩٧). لە ژمارە (٨٥)یشدا بینیمان کە چۆن مەحوی (وێران)ی کردووە بە(وەیران) لەبەر ڕاگرتنی سەروا.

چەند نموونەیێ تر:

آ- سەلام لە تەرجەمەی خەیاما دەڵێ (دە برگەیی):

بەهەوری نەورۆز گوڵ چاوی (شۆریا)
تۆ و پیاڵە و شەراب، داوێنی چیا
نیمڕۆ تێر سەیری سەوزەگیا بکە
سبحەی لە خاکت سەوز ئەبێ گیا

لەنیوە دێری یەکەما، هەستیار وشەی ڕەسەنی (شۆرا)ی گۆڕیوە بە(شۆریا) کە وشەیەکی نامۆی نارەسەنە، چونکە زاراوەیەکی ناوچەیی وایە، کە بەرەو نەمان دەڕوا، لەبەر ڕاگرتنی یەکێتیی سەروا، وە ئەمەیش بۆ شاعیر دروستە، بەڵام بۆ نووسەر دروست نییە (ر:١٠١ - ٣).

ب- ناریش - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - دەڵێ:

ئەی خوو کەچ و کەچ باز و کەچ ئەندێشە و عەمەل کەچ
دانێ نەفەسێ یەک قەدەمی چاکە بەراسۆ!

خۆی هەق وایە بیگوتبایێ: (... بەراستەوە) بەڵام لەبەر ڕاگرتنی کێش و لەبەر ناچاری سەروا کردوویەتی (... بەراسۆ) هەتا هاوسەروا بێ لەگەڵ ئەم وشانەی تردا کە بوون بەسەروا لەم چامەیەدا: (جەفاجۆ، خودارۆ، بەدگۆ، هۆلاکۆ، بەداخۆ، میحنەت و شینۆ...).
لەم چامەیەدا وشەی (بەداخۆ)یش (بەداخەوەدیە) و (شینۆ)یش (شینەوەیە) لەبەر ناچاری سەروا وایان لێ کراوە. (بڕوانە سەروا، بەدووروودرێژی باسی ئەم جۆرە گۆڕانکارییانە نووسراوە. هەروا بڕوانە - بدل - هەروا بڕوانە: پیتی ذال).

ج- ئەوەتا لەم هەڵبەستەیشداش لەبەر ناچاری و بۆ هاوسەروایی لە شیعری موزدەوەجدا، غەیرە مونصەریف کە (مكّة)یە ژێردار کراوە (ڕەجەز):

ثمَّ الحديبيَّةُ قُرْبَ مَكّةِ وَبَيْعَةَ الرِّضْوَانِ وَسْطَ القَعْدَةِ

بەژێری تێیی (مكّة)ی، تا لەگەڵ سەروای (القَعْدَةِ)یدا یەک بن، چونکە ئەگەر ئێستیان لەسەر بکرێ، کێش لەنگ نابێ، بەڵام سەرواکان تێکدەچن، نیوەی یەکەم کاف دەبێ و نیوەی دووەم دال، ئاوا (مەککە × قەعدە) شتی وایش لەم شوێنەدا دروست نییە.

١٠١- کۆمەڵێ گۆڕانکاری جۆربەجۆر:

آ- فیعلی موضاریعی موعتەللولام، لە کاتی مەجزوومیدا، لەبەر ناچاری، دروستە ئیثباتی پیتێ عیللەکەی بکرێ، وەک (طەویل):

وَتَضْحَكُ مِنّي شَيْخَةٌ عَبْشَمِيَّةٌ كَأَنْ (لَم تَرى، قبلي أسِيرآ يَمَانِيَا

خۆی مافی (لَمْ تَرَ)ەیە.

ب- فیعلی موضاریعی مەنصووبی موعتەلل، دوا پیتی یێ یا واو بێ، دروستە کە سەری واوەکە، یا سەری یێکەی بکرێ بەزەنە (سکون) وەک (أنْ أسْمُوْ ---، أنْ أمْضِيْ ---، لِيَقْتَدِيْ ب - ب -) بەزەندی واوی (أسْمُو) و یێی (أمْضِي) و (يَقْتَدِي).

ج- ئەم جۆرە وشانە هەستیار بۆی هەیە بەیەکێ لەم دوو شێوەیە بیانخوێنێتەوە: (وَهْيَ = فَعْلُ -ب، وَهِيَ = فَعَلَ ب ن ب، وَهِيْ = فَعَلْ ب -. وَهُوَ = فَعَلَ ب ب ب، وَهْوَ = فَعْلُ - ب، فَهُوَ ب ب ب، فَهْوَ - ب، فَهِيَ - ب، فَهِيَ = فَعَلَ ب ب ب، فَهْيَ = فَعْلُ - ب، لَهُوَ

= فَعَلَ ب ب، لَهْوَ = فَعْلُ - ن، لَهِيَ = فَعَلَ ب ب ن، لَهْيَ = فَعْلُ -ب، ئیتر ئەم جۆرە وشانە لە هەر کوێیەکی هۆنراودا بوون، هەستیار دەتوانێ بەیەکێ لەم دوو شێوەیە بیانخوێنێتەوە. وەک (رەجەز):

وَذُو ارتِفَاعٍ وَانْفِصَالٍ (أنَا هُوْ) وَأنْتَ وَالفُرُوْعُ لاَ تَشْتَبِهُ

لەم دێرەدا (لِنْ أنَهُوْ = مُفْتَعِلُنْ - ب ب -) واتە (أنَا) دانراوە بەسەبەبێکی قورس و (هُوْ)یش دانراوە بەسەبەبێکی سووک. بڕوانە (١٩+ ١٢ - و) + (١٣ - ب، ج) یا وەک (رەجەز):

وَعِندَمَا رَدَّ تَزَوَّجَتْ بِهِ وَعمرُهُ خَمْسٌ وَعِشْرُونَ (وَهِيْ)

یا وەک (رەجەز):

والثانيِ منهما كَثَانِ أثْنَىْ كَسَا (فَهْوَ به) في كلّ حُكْمٍ ذوائْتِسَا

د- جاری وا دەبێ وشەیێ بەدوو جۆر دەخوێنرێتەوە، یەکێکیان ناسراوترە، بەڵام هەستیار لەبەر هۆیێ، ناباوەکە بەکار دەهێنێ، وەک قانیع لەباتی (مامۆستا) وشەی (مامۆسا) بەکار دەهێنێ، گۆران لەباتی (قوربان) وشەی (قوبان) بەکار دەهێنێ (بڕ: ٨٣- اختصار) و (١- الأبجدیە/ک) (م).

١٠١- چۆنێتیی مامەڵەکردن لەگەڵ هەمزە و ئەلف و تەنویندا:

هەمزەکە بریتییە لە ئەلفی بزوێندار، یا لە هەمزەی زەنەدار، وەک (سألَ، سُئلَ، ضَألَ، سُؤلَكَ، جُؤجُؤْ، لؤلُؤْ، ماءُ السماءُ، جِيءْ بِهِ، شِئْتَ أمْ لَمْ تَشَأْ، جاءَ أوْ لَم يَجِئْ، هؤُلاءِ، هَاؤُم اقْرأ و اكتابيه) بڕیاری کێشی لەبارەیەوە لە عەرەبی و کوردیدا هەر زۆر زۆرە، بەتایبەتی لە کوردیدا، ئەگەر هەموو جۆرە دەسکارییەکانی کۆ بکرێنەوە، دەبێ بەنامیلکەیەکی جوان لە بابەتی خۆیدا. دیارە کە هەستیارە کوردەکان لەم بابەتە فرە لێ و قووڵەیشدا، سوودی چاکیان لە ئەزموونی شاعیرە پێشینەکان، بەعەرەب و ناعەرەبیانەوە وەرگرتووە.

فەرموو بۆ نموونە بڕوانە:

١- ژمارە (١) و (٢) و (٩) و (١٠).

٢- هەندێ جار لەبەر ناچاری قەلبی هەمزە دەکرێ بەئەلف (رەجەز):

وَأشْجَعُ الوَرَى وَأجْوَدُ (المَلاَ) مَا قَالَ لاَقَطُّ لِشَيْءٍ سُئِلاَ

خۆی (المَلأ)ە، بەواتا کۆمەڵ و دەستە، بۆ هاوسەروایی لەگەڵ (سُئِلاَ)دا کراوە بە(اَلْمَلاَ) واتە: هەمزە بزاوەکەی کراوە بەئەلف، دیارە کە ئەلفی وەستاو مەبەستە.

٣- هەروا بەپێچەوانەیشەوە قەلبی ئەلفیش دەکرێ بەهەمزە (رەجەز):

أسْهَلُ خَدٍ وَاسِعُ الجَبِينِ    أدْعَجُ عَيْنَيْنِ (أقْنَأُ) العِرْنَيْنِ

خۆی (أقنى)یە، بەئەلفی مەقصوورە، بەڵام هونەر لەبەر ڕاستکردنەوەی کێش، مامەڵەی کاتی ئێستی بۆ کاتی پەیوەست کردووە، کە لە هەندێ زاراوی لاوازی ناوچەییدا، بەهەمزە ئێست لەسەر هەموو ئەلفێ دەکرێ، ئەمیش (أقْنَيِ)ی کردووە بە(أقْنَأُ). (ر: ٩٩ - آ).

٤- بزوێنەکەی دەگوێزرێتەوە بۆ پیتی نەبزوێنی پێشی و هەمزەکە خۆی دەکرتێ، وەک (رەجەز):

مَنْ مِثْلُ عثمانَ الزكيُّ الطَّاهِرُ    (تَالِي القُرَانِ) لِلْبَلاَءِ صَابِرُ

خۆی مافی (اَلقُرْآنِ) بووە، هەمزەیەک و ئەلفێ بووە، بزوێنی هەمزەکە گوازراوەتەوە بۆ سەر ڕێکەی پێشی و خۆی کرتاوە و لە (قُرآن)ەوە، کە دوو برگەی درێژ و یەک برگەی کورتە، بووە بە(قُرَان ب - ب).

یا پاش گواستنەوەی بزوێنەکەی بۆ پیتی پێشی، هەمزەکە خۆی تەخفیف (م) دەکرێ و دەبێ بەئەلفی پیتە بزوێنی درێژ، وەک (أُسْألُ) کراوە بە(أسَالُ) لەم هۆنراوەدا (رەجەز):

فَقَالَ قَدْ وَدِدْتُ أنْجُو مِنْهَا    عَفْواً كَفَافاً لاَ (أسَالُ) عَنْهَا

لە کوردیدا وەک (گۆران - موضاریعی مەکفوفی ئەخرەبی مەحذووفی هەشتی):

مەشبووعی عیشق و جەذبەیە بۆ جوانی (باقلَم)

قـابیل نیـیـە فـەراغـەتم حـەتـتـا بیـشـمـرم

نموونەیێ تر لە گۆڕینی هەمزە بەئەلف، بۆ زادە ڕاهێنان:

آ- آلأ مِيـرُ قَـائِمُ. خۆی (أ ألأمِيـرُ قَائِمُ) بووە، هەمـزەی دووەم کـە هەمـزەی وەصـڵـە ناکرتێ، چونکە ئەگەر بکرتێ نازانرێ: ڕستـەکـە خەبەرە یا ئینشایە، سـەرلێشـێـوان ڕوو دەدات،، نایشبێ وەک خۆی بەبزوێنداری بمێنێتەوە چونکە هەمزەی پەیوەستـە، لەبەر ئەوە دەسـوێ و دەکـرێ بەئەلف. ئەمـە هەر لە شـیـعـردا وا نیـیـە، بەڵکو زۆربەی کـات لە پەخشانیشدا هەر وایە.

ب- نموونەیێ تر لە گـواسـتنەوەی بزوێنی هەمـزە و کـرتاندنی خـۆی، کـە بەم کـردارە

دەگوترێ جۆرێ لە دەرجی هەمزە. وەک (ڕەجەز):

(وَمَاتَتُ امُّهُ) وَقَدْ كَمُلَ لَهْ    أرْبَعٌ اوْ ستٌّ وَبَعْدُ كَفَلَهْ

دەکرێ بە(وَمَاتَتُمْ = مَفَاعِلُنْ + مُهُو وَقَدْ = مَفَاعِلُنْ + كَمُلَ لَهْ = فَعِلَتُنْ)

چونکە هەمزەی (أُم -ب) هەمزەی قەطعە، لەبەر کێش نەبێ ناکرێ.

ج- نموونەیێ تر (ڕەجەز):

فَرَاحَ مُصْعَبُ (وَالإِسْلاَمُ) أعْتَلى

في الأوْسِ والخَــزْرَجِ ثُــمَّ أقْبَــلا

ئەوەتا هەمزەی (إِسْلام) لەپاش گواستنەوەی بزوێنەکەی بۆ پیتەکەی پێشی خۆی، کە لامی تەعریفەکەیە کرتاوە و وشەی (وَ ألإسْلاَمُ) بەدوو کردار بووە بە(وَلِسْلاَمُ ب -- ب) کرداری یەکەم هەمزەی (ألْ) کرتاوە، چونکە هەمزەی پەیوەستە، کرداری دووەم لەبەر ناچاری هەمزەی قەطعی (إسلام)یش بەو شێوەی باس کرا کرتاوە. هەتا لە ئەنجاما کێشەکە ساف دەبێ و لەنگی تیادا نامێنێ و بەجوانی ئاوا پارە پارە دەکرێ:

(فَرَاحَمُصْ = مَفَاعِلنْ + عَبُنُ وَلِسْ = مَفَاعِلُنْ + لاَ مُعْتَلاَ = مُسْتَفْعِلُنْ)

د- نموونەیێ تر لە یاساکانی هەمزە و تەنوین (ڕەجەز):

خُدَّامُهُ أنَسُ أسْمَا هِنْدُرَبِيعَةُ وَعُقْبَةُ وَسَعدُ

ئەم شیعرە ئاوا تەقطیع دەکرێ:

(خُدْدَامُهُوْ: مستفعِلُنْ + أنَسُنِس: فَعِلَتُنْ، مَاهِنْدُنْ: مَفْعُولُن)

لەم شیعرەدا ئەم چەند ڕوخصەتە شیعرییەی وا تیادا

١- قەصری (اسماء) کراوە، بووە بە(أسما).

٢- هەمزەی سەرەتای (أسماء) گەرچی هەمزەی قەطعە، لەبەر ناچاری - پاش نەقلی بزوێنەکەی بۆ پیتی وەستاوی پێشی کە تەنوینی (أنَسُنْ)ە - کرتاوە، لە ئەنجاما بەو شێوەیە دەخوێنرێتەوە کە پارە پارەمان کرد.

٣- تەنوینی (أنَس) کراوە بەنوونێکی بزوێندار. دروستیشە بۆ ساف کردنی کێشی دێڕەکە (أنَسُ) بکرێ بەغەیرە مونصەریف و هەمزە (أسْمَا) بمێنێ.

٥- قەلبی هەمزە دەکرێ بەحەرفی لین، لە جینسی بزوێنی پێشی، ئەوسا مامەڵەی

'معتل اللام)ی بۆ دەکرێ، لەبەر ناچاری بەحەرفی جازمە دەکرێ وەک (رەجەز):

وَحَاطِبُ رَاحَ إلَى ٱلْمُقَوْقَسِ     سَلِيطُهُمْ لِهَوْزَةٍ (فَلَمْ يُسِ)

خۆی (یُسیئُ) بووە، کە بە(لَمْ)ەکە مەجزووم بووە، بووە بە(یُسِیئْ ب -) دوو پیتی وەستاو داویانە لە یەکتر، لەبەر ئەوە (عين الفعل)ە کە کرتاوە و بووە بە(یُسأ ب -) جا هەمزەکەیش بەپێی یاسای ئیعلالی هەمزە قەلب کراوە بەیێ، بووە بە(یُسیْ ب -) جا وەک معتل اللام مامەڵەی لەگەڵ کراوە، یێکە بە(لم)ەکە کرتاوە، بووە بە(لَمْ یُسِ) بەڵام بەیاسای ئیشباعی پیتی رەوی لە قافیەی مطلقا سینی (یُسِ) تێر دەکرێ هەتا یایەکی لێ پەیدا دەبێ، گۆی پێ دەکرێ، بەڵام لە خەطا نانووسرێ!! ئەمەیە کە دەڵێن: دەوەرە ئەم هەرە لەم هەرە دەرێنە! پارەکردنی:

| وَحَاطِبُنْ | رَاحَ إلَلْ | مُقَوْقَسِي |
|---|---|---|
| ب - ب - | - ب ب - | ب - ب - |
| مفاعِلُن | مُفتعِلُنْ | مفاعِلُنْ |

| سَلِيطُهُمْ | لِهَوْذَتِنْ | فَلَمْ يُسِي |
|---|---|---|
| ب - ب - | ب - ب - | ب - ب - |
| مفاعِلُنْ | مَفاعِلُنْ | مَفاعِلُنْ |

٦- گەلێ جار هەمزەکە لەگەڵ حەرفی حەلقی تردا کۆببێتەوە دەکرێ، وەک (فَلْیَهْنَه) دروستە بڵێین ئەم نموونەیەیش لە جۆری ژمارە پێنجە لەم ژمارەیەی ژێردەستمان کە (١٠١)ە.

٧- تەنوین و پیتی بێ بزوێن کە دەگەن بەهەمزەی وەصڵ، مەگەر لەبەر ناچاری، دەنا هەمزە وەسڵەکە لە دەرجا دەکرێ و پیتە وەستاوەکە یا تەنوینەکە بزوێندار دەکرێ، وەک:

آ- بزاوکردنی وەستاوی یەکەم، لە کاتی بەیەکگەیشتنی دوو پیتی وەستاودا، لەپاش کرتاندنی هەمزەی وەسڵ (بەسیطی موخەللەع):

أَبْشِرْ فَقَدْ جَاءَتِ السُّعُودُ     أَبَادَ أَعْـدَاءَكَ المبيـدُ
لَمْ يَظْفَروُا بِالّـذِي أرَادُوا     بَلْ يَفْعَلُ اللّهُ مَايُرِيـدُ

ب- بزاوکردنی پیتی وەستاوی یەکەم، لەپاش نەقڵی بزوێنی هەمزەی قەطعی دوای بۆی و کرتاندنی هەمزە (رەجەز):

يَتْبَعُ فِي ٱلإعْرَاب (الاسماءَ) ٱلأوَلْ     نَعْتٌ وَتَوكِيدٌ وَعَطفٌ وَبَدَلْ

ج- بزاوكـردنى تەنوين و كـردنى بەنوونێكى بزاو، لە كـاتى كـرتاندنى هەمزەدا وەك (رەجەز):

وَوَلِيَ اسْتِفْهَاماً اوْ حَرْفَ نِدَا أو نَفْياً اوْجاصِفَةً أو مُسْنَدَا

ئەم دێڕە ئاوا پارە پارە دەكرێ:

| وَوَلِيَسْ | تفْهَامَنو | حَرْفَنِدَا |
| --- | --- | --- |
| ب ب ب - | -- ب - | - ب ب - |
| فَعِلَتُنْ | مستفعلن | مفتعلن |

| أوْنَفْيَنَوْ | جَاصِفَتَنْ | أوْ مُسْنَدَا |
| --- | --- | --- |
| --ب- | -ب ب- | --ب- |
| مُسْتَفْعِلُنْ | مفتعلن | مستفعلن |

٨- بڕوانە: ئەو پیتانەی كە لە نووسینا دەكرتێن.

٩- بابزانین هەستیارانی كورد لەم بواری هەمزەیەدا چییان كردووە؟

آ- نالی - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - دەفەرمووێ (رەمەل):

خـالی بەینی چاو و ئەبرۆت ئینتیخابی كاتیبە

یەعنی نوقطەی فەرقی ئیبنوموقلە ویبنوحاجیبە؟

ئەوەتا نالی هەمزەی (ئیبنوحاجب)ی كرتاندووە، پاش ئەوەی بزوێنەكەی گواستۆتەوە بۆ سـەر واوە عـەطفـە ساكینەكەی پێش خۆی، دەق وەك نموونە عـەرەبییـەكانی ئەم بابەتە: (وَمَاتت امُّهُ، الأسماء الأول).

ب- حەریق - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - دەفەرمووێ (هەزەج):

تاكەی لە طـەوافی حەرەمی قیبلەیی ئـەبـرۆت

وەك پەرچەمی پێشانی (سەرئەفگەندە و خوارم)

دەخوێنرێتەوە (سەرەفگەندەو = مَفَاعیلن + خوارم = فَعُولُنْ).

ج- مەحوی - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - دەفەرمووێ (هەزەج):

(دەوای ئەم نەفســە مەلعونەت دەوێ، هـەر دەردە وەك جیـوە

كە هاتی كوشتتن، ئەو ڕۆحی مەحضە، (ئەم) جەوهەری زیوە)

هەمزەی (ئەم) حیسابی هەمزەی وەصڵی بۆ کراوە، بەبێ چەندوچوون کرتاوە، دیسان مەحوی دەفەرمووێ (هەزەج - یا - وافیر):

(بەجوزمەی نـــاوی ئەم نـــاوە بەچی بـــەم

بەنەشئەی ئەو بەشەر هەم (بوالبشر) مەست)

لەبەر ناچاری کێش هەمزەی قەطعی (أبوالبشر) لە دەرجا کرتاوە.

دیسان مەحوی دەفەرمووێ (رەمەل):

(جیلوەی ئەو) حوسنە نییە گەر کارگەر

بۆ جەمـادیش، ئـایینە حـەیـرانە بـۆچ

(جِلْوَیَوْحَسْ = فاعِلاتُنْ)

مەحـوی - ڕەحـمـەتی لێ بێ - هـەروا نالیش، زۆرینەی کـات، ئەگـەر کـاری بەکـرتاندنی هەمـزە هەبێ، فـیـعـلی مـضـاریع بەهەمزە دەست پێ دەکـات، دەنا بـەدال گـۆی پێ دەکـات. مەحوی دەفەرمووێ (رەمەل):

بۆ دوکانی موشتەری گر (حەول ئەدا) کالاّفرۆش

دینی وا دێنێتـە قیـمـەت خواجە ئەعضایی بکا

(حەوڵ ئەداکا = حەوڵەداکا = فاعلاتن + لاّفرۆش = فاعلن).

د- نالی - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - دەفەرمووێ (هەزەج):

شەوەمما، کەوکەبەی هەر کەوکەبی نیلی فەلەک دەتگوت

لە میصری ڕۆژی زینەت دەستی مووسای ئیبنی عیمرانە

ئەم شیـعـرە هەزەجـە، بە(مَفَـاعـیلُنْ) دەست پێ دەکـات، لەبەر ئەوە لەبەر ناچاری، نالی (شـەو ئەمما = مـفـعـولن)ی کـردووە بە(شـەوەمما = مَفَـاعي) ئەم کـردارەیش بەکـرتاندنی هەمزەی (ئەمما) تەواو دەبێ و کێشی شیعرەکە ساف دەبێ. هەروا نالی دەفەرموێ:

ئەڵڵا... ئەڵڵا... کە چ عەقڵ و چ کەمالێکی هەیە!

(لەگەڵ ئەو) عەقڵ و کەماڵە چ جەمالێکی هەیە!

لەبەر ئەوەی کـە ئەم دێڕە دوو ڕوخـصـەتی شـیـعـری گـرنگی وا تیـادا، وا پارە پارەی دەکەین:

(ئەڵڵە ئەڵڵا = فاعلاتن + کە چ عەقڵ و = فَعلاتُنْ + چ کەماڵی = فَعلاتُنْ + کی هەیە = فاعِلُنْ × لەگەڵە و عەق = فَعلاتُنْ + لوکەماڵە = فاعلات + چ جماڵێ = فَعلاتُنْ + کی هەیە = فاعِلُنْ).

وەکو لەم پارە پارەیەوە بەدەردەکەوێ، نالی بەپێی یاسای ژمارە (٦٥)ی ئەم ناچارییانە، ئەلفی (ئەڵڵاه)ی یەکەمی کرتاندووە، وە بەپێی ژمارە (٦٢-آ) تەرخیمی (ئەڵڵاه)ی یەکەم و دووەمی کردووە. لە سەرەتای نیوەی دووەمیشدا یاسای کرتاندنی هەمزەی بزواوی جێبەجێ کردووە، پاش ئەوەی کە نەقڵی بزوێنەکەی کردووە بۆ (ڵ)ەکەی پێشی.

بۆ زیاتر شارەزابوون لە جۆرەکانی هەمزەی کرتاو لە کوردیدا، کۆمەڵێ وشە دەنووسین، کە هەستیارە کوردەکان بەهرەیان لەم ڕێسایانە وەرگرتووە، لە کاتی کرتاندن و سووککردن و گۆڕینیاندا. وەک:

(ئەی - دەڵێم ئەی: دەڵێمەی، ئاو - گوڵ ئاوی: گوڵاوی، ئاگری - بەحر ئاگری: بەحراگری، ئەمڕۆ - واعیظ ئەمڕۆ: واعیظەمڕۆ، ئیتر - وەرە باتۆبەکەین ئیتر ریا بەس: وەر باتۆبەکەینیتر ریا بەس، ئەر - مەرگ ئەر: مەرگەر، ئیفتادە - ئەم ئیفتادە: ئەمیفتادە، ئەو - وەکو ڕۆژ ئەو: وەکو ڕۆژەو، بوبەکر، بوسینا، بوطالیب، ئەکەم، ئەسباب، ئاغا)

ئەوەی لێرەدا شایانی گوتنە ئەمەیە:

یەکەم: ئەم جۆرە گۆڕانانەی کە بەسەر ئەم جۆرە وشانەدا دێ، بەزۆری دەبێ بەشێوەی ڕێنووسی ئاسایی بنووسرێن، لە عەرەبیدا هەمزەی وەصڵ دەنووسرێ، بەڵام کرتاوی تەرخیم نانووسرێ.

دووەم: لە شیعری عەرووزیدا لە هەر کوێ هەمزە نووسرا بوو، مەرج نییە لە کێشا چەسپابێ، بەتایبەتی لە شیعری کوردیدا. کەواتە سەرنجی بدە.

سێیەم: لە ڕاستیدا، لە کوردیدا، کەم دێڕە هەڵبەست هەیە، کە روخصەتی شیعری، یا تەرهیم و پینەوپەڕۆی تیادا نەبێ، لەبەر ئەوە هەتا زیاتر گرنگی و بایەخی تەواو، بەم بابەتە بدەین، هێشتا هەر کەمە، ڕاستە قەبووڵی ناچاری و روخصەتی شیعری زۆر لە عەرەبیدا، زۆر پەسەند نییە، بەڵام لە کوردیدا وا نییە، چونکە خودی روخصەتەکان لە کوردیدا کارێکی ناچارییە، بگرە زۆرجار ناچارییە کە شیعرەکە جوان دەکا (بڕ:٦٢-ب).

لەم شیعرەدا نالی وشەشکێنییەکی جوانی کردووە، کاتێ دەیخوێنیتەوە حەز ناکەی وشە شکاوەکە ڕاست بکرێتەوە و بچێتەوە دۆخی جارانی خۆی، هەروەها نیوە دێڕی دووەمی سەردێڕی ئەم چامەیە کە ئەم دێڕەیە (ڕەمەل):

پەچەیی پەرچەمی یو، پرچی سیا     هەر دەڵێی مانگەشەوە کوڵمی تیا

چوارەم: بۆ شاعیری کورد فێربوونی عەرووز ئەو بایەخەی نییە، بەڵکو ئەوە سوودمەندە کە بزانێ چۆن چۆنی لە دارشتنی شیعری کوردیدا عەرووز بەکار دەهێنێ، چونکە ئەمە خۆی لە خۆیدا هونەرێکی ترە، زادەی بیر و بۆچوونەکانی کەڵەشاعیرەکانمانە.

پێنجەم: هەمزە لە زمانی عەرەبیدا لەم شوێنانەدا قەطعە، واتە: نەگۆڕە، هەموو کات چەسپاوە (لە وصل و لە درجا ثابتە):

١- لە ماضی و ئەمر و مصدری بابی إفعالدا، وەک: (أَقْطَعَ، إِقطاعاً، أكرمَ، إكرام، أخرج، إخراج).

٢- هەروا لە هەموو فیعلێکی ثلاثی و مصدرەکەیدا، ئەگەر هەمزەکە بەشی وشەکە بێ. وەک: (أمِنَ، أمْناً، أخَذَ، أخْذاً).

٣- لە سەرەتای ناوەوە، لە هەموو شوێنێکا بۆ قەطعە، لەم دە ناوەدا نەبێ، کە هەمزەکەیان بۆ وەصڵن: ١- اسم ٢- است ٣-ابن ٤- ابنه ٥- أبْنُم ٦- اثنين ٧- امرئ ٨- امرأة ٩- اثنتين ١٠- أيْمُن - کە بۆ شوێن بێ.

٤- ئیتر لە غەیری ئەم سێ بابەتەدا لە هەموو شوێنێکا بۆ وصڵە، وەک هەمزەی سەرەتای فیعلی مزید فیه و مصدەرکەی، وەک: (انقطع انقطاعاً، اجتمع اجتماعاً، استخرج استخراجاً...).

### ١٠٢- ڕێساکانی ئێست و جۆرەکانی:

**مەبەست ئەو ئێستانەیە کە بۆ ڕاگرتنی کێش یا سەروا بن**

**تَحَكُّمُ الوُقُوفات وَأَنْوَاعُهَا لإقَامَةِ الوَزنِ وَرِعَايَةِ القافية:**

١- وەستان: ئێست: وەقفە، لە عەرەبی و لە کوردیدا جۆری زۆرە، وە ڕۆڵی گرنگیش دەبینێ، کێشزانەکانی خۆیشمان لەم بابەتەیشدا وەک هەموو بابەتەکانی تری کێشزانی، بەهرەی زۆر و وەستایی چاکیان نواندووە، بۆ ئەم مەبەستانە و لەم بوارانەدا ئێستیان بەکار هێناوە: بۆ ڕاگرتنی کێش یا سەروا، یا سافکردنی پێیەکان!

٢- دروستە ئێست (وەقفە) لەسەر پیتی ئیعراب، لەناواخن (حشو)ی دێڕدا، بەزەنە بکرێ، وەک (ڕەجەز):

وَعَدٍّ لاَزِماً بِحَرْفِ جَرّْ وَإِنْ (حُذِفْ) فالنَّصْبُ لْلمُنْجَرّْ

یا وەک (عُیُونَهْ) بەهێی وەستاو لە ژمارە (٦٩) بڕوانە (٨٥).

٣- دروستە ئەم جۆرە ئێستە لەناو پێ (تەفعیلە)یشدا بکرێ، وەک (عُیُونَهْ) و (یَخْصفْ) لە ژمارە (٦٩) و (٨٥)دا، هەتا لەسەر موضاف دەکرێ. ئەم جۆرە ئێستە لە کوردیدا هەر زۆر زۆرە، مەولەوی - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - دەفەرمووێ (دە بڕگەیی):

گوڵ چون ڕووی نازیز، نەزاکەت پۆشان

بەفراوان چون (سەیلْ) دیدەی من جۆشان

خۆی لە بنەڕەتدا مافی ئاوایە: (چون سەیلی دیدەی...) لەبەر ڕاستکردنەوەی کێشەکە، کە دە بڕگەییە، ئێست لەسەر موضاف کراوە، بزوێنی دوا پیتی (سەیل) لەگەڵ پیتی (ی) نیشانەی ئیضافەدا کرتاوە، کێشەکە بەم کردارە لە یازدە بڕگەییەوە بووە بەدە بڕگەیی (بڕوانە ژمارە «٤» چەند جۆرێکی ئێستی وا تیادا). ڕاستە کە هەندێ زاراوەی ناوچەیی کەم، لە پەخشانیشدا وەک هەڵبەست، موضاف بێ بزوێن دەکەن، وەک لەجیاتی بڵێین: قەومی باوکم، دەڵێن: قەومْ باوکم، بەڵام ئەم جۆرە لکەزاراوە، ئەمڕۆ لە کوردی ڕەسەنی ئەدەبی دوورخراوەتەوە.

بۆ نموونە ئێست لەسەر موزاف لە عەرەبیدا بڕوانە ژمارە (٤- بمنزلە هارون). ئەم جۆرە ئێستە لە کوردیدا، بۆ کێشی پەنجە ڕۆڵێکی تریش دەبینێ، کە دەبێ بەجێگەی لەنگەرگرتنی یەکەم لە نیوە شیعری یەکەما.

**تێبینی:** لە بابەت و ڕێساکاندا، لە زۆربەی دەستوور و بابەتەکاندا، هۆنراوی ستوونی، بەبەشی عەرووزی و، بەبەشی پەنجەییەوە، ملکەچی یەک ڕێسا دەبن. لەبەر ئەوە جێگەی خۆبەتی کە بەشیعری هێجایی نموونە ساز بکەین.

٤- ئێستکردنی پێویست لە کۆتایی عەرووز و زەربا بۆ ڕاگرتنی کێش و سەروا، بەزەنەی حەرفی صەحیحی بزوێندار، وەک (ڕەجەز):

نَجْمٌ بَدَا، زَهْرٌ زَهى، نورٌ (ظَهَرْ)     مَا أعْجَبَ النَّجْمَ الَّذي فَاقَ الْقمرْ

مەحویش - ڕەحمەتی لێ بێ - دەفەرمووێ (ڕەمەل):

مـاهی مـن ڕۆژێ لە ڕوو لادا (نیقابْ)

شەو، مەگەر هەڵبێ لە شەرمان، (ئافتابْ)

٥- وەستان لەسەر پیتێ قورس (گیراویدار: مثقّل، مشدّد) لە سەروادا، یا لەدوا پیتی نیوەی یەکەما، یا لە هەردوو لادا (بڕ: ٤، ٨، ٢١، ٢٢).

مەحوی بەهەشتی دەفەرمووێ (موتەقارەب):

طەرەب کەن شوکر زۆری هێناوە غەم

تَوَقَّعْ زَوَالاً إذَا قِيلَ تَمْ

٦- بۆ ئێست لەسەر ڕاناوی لکاو، وەک (لَهُ، لَكَ، بِهِ) بڕوانە (١٢ - و) نموونەیش وەک (١٠١ - ٤ - ب).

٧- وەستان لەسەر تێی خڕی تەئنیث، لە هەرسێ حاڵەتی ئیعرابا، زۆرتر بەهێی بێ بزوێنە، وەک حاڵەتی نەصبە (ڕەجەز):

أقَامَ شَهْرًا ثُمَّ عَادَ مَأمَنَهْ     وَعُمْرُهُ إحْدَى وَخَمْسُونَ (سَنَهْ)

بڕوانە ژمارە (٤) هەڵبەستی سێیەم و پێنجەم، بڕوانە (١٤).

٨- جاری وا هەیە لەبەر ناچاری کێش یا ڕاگرتنی سەروا، بەتێی وەستاو ئێستی لەسەر دەکرێ، وەک (شَجَرَتْ) لەم دێڕەدا (ڕەجەز):

وَنَامَ فِي يَوْمٍ فَجاءَتْ (شَجَرَةْ)     فِي الْأرْضِ قَامَتْ عِنْدَهُ فَذَكَرَتْ

ئەم جۆرە تێیە لە کاتی ئێست لەسەر کردندا، دروستە بەتێی خڕ، یا بەتێی درێژ بنووسرێ، بەڵام جۆری (٧) یا بەهێی خڕ یا بەتێی خڕ دەنووسرێ و بەس.

٩- وەستان لەسەر (هُوَ)ە و (هيَ)ە و (أنَا ب ب) لەسەر ئەم شێوەیە دروستە، لەبەر ناچاری (هُوَ ب ب) بکرێ بە(هُوْ -)وە (هِيَ ب ب) بکرێ بە(هِيْ -) وە (أنَا ب ب) بکرێ بە(أنَا ب -). (بڕ: ١٠٠ - ج).

١٠- جاری وا هەیە تێی خڕی مێیینە، لە کاتی پەیوەستیدا، حیسابی کاتی ئێستی بۆ دەکرێ، لەبەر ئەوە مامەڵەی کاتی ئێستی بۆ دەکرێ، وەک (رەجەز):

(سَنَهْ) ثَلاثٍ غَطَفَانَ وَأُحُدْ     وَحُرِّمَ اْلخَمْرُ وَحَسَنٌ وُلِدْ

تەنانەت لە بەشی یەکەمی عەدەدی مورەککەبیشدا، ئەم کارە ئەنجام دەدرێ، وەک (رەجەز): سَنَةَ أربَعْ عَشرةٍ... الخ (بڕوانە: ٨).

١١- وەستان لەسەر مەنصوبی تەنویندار، کە نە مەقصووربێ و نە تێی خڕی پێوەبێ، چەند جۆرێکی هەیە:

آ- بەزۆری تەنوینەکە دەکرێ بەئەلف لە کاتی ئێستا، وەک (کامیل):

حَــالَ الزَّمَــانُ فَبَدَّلَ اْلآمَــالاَ

وكَسَى اْلمَشِيبُ مَفَارِقاَ وَقَذالاَ

چونکە لێرەدا لەبەر ڕاگرتنی سەروا (قَذالاً) دەبێ تەنوینەکەی بگۆڕێ بەئەلف دەنا لە نیوەی یەکەما پیتی وەصڵ ئەلف دەبێ و لە نیوەی دووەما نوونێکی وەستاو دەبێ، شتی وایش لەم جێگەدا نابێ.

ب- بەکرتاندنی ئەلفی موبەددەل لە تەنوین و وەستاندنی پیتی سەرداری پێشی، وەک (رەجەز):

وبَعْدَ تِسْعِ أشْهُرٍ أسرىَ بِهْ     لِلْمَسْجِدِ الاقْصى، وكَانَ مُنْتَبِهْ

خۆی مافی: (وكَانَ منتَبِهاَ). (بڕوانە: ٢٨. شیعری (... يكنْ مَاشٍ) خۆی مافی (... يكن مَاشياَ...)ە.

١٢- ئێستکردن بەزیادکردنی هێی ئێست (بڕ: ١٤+١٥).

١٣- هەندێ جار ئێست لەسەر هەمزە بەئەلف دەکرێ، بۆ ڕاگرتنی یەکێتیی سەروا، یا بەپێچەوانەوە هەمزە دەگۆڕدرێ بەئەلف بۆ سافکردنی کێش، وەک (رەجەز):

وَأجْوَدُ اْلوَرى وَأجْوَدُ اْلمَلا

مَا قَالَ لاَقَطُّ لِشَيْءٍ سُئِلاَ

(الملا) خۆی (الملأ) بووە. وەک (رەجەز):

أسْهَلُ خَدًّ واسِعُ الجبِين أدْعَجُ عَيْنَيْنِ أقْنَاُ الْعِرْنَيْنِ

خۆی (أقْنى)یە بەئەلفی مەقصوورە، بەڵام هونەر لەبەر ڕاگرتنی کێش، ئەلفەکەی کردووە بەهەمزەی بزوێندار، بەپێی یاسای مامەڵەی کاتی ئێست بۆ کاتی پەیوەست، چونکە لە هەندێ زاراوە هەموو ئەلفێ لەکاتی ئێستدا دەکرێ بەهەمزە، بڕوانە: (١٠١ - ١ + ٢ + ٣ + ٤ + ٥).

١٤- ئێست لەسەر معتَلّ اللامي متحرِّك بەزەنە دەکرێ، چ لە حشو (ناوەخن)دا بێ، چ لە عەرووز و زەربا بێ، وەک (رەجەز):

وَتَاءُ تأنيثٍ تلي (الماضِي) إذا

كانَ لأنْثى، كَـأَبَتْ هِندُ الْأذى

چونکە (مَاضِيْ إذا --ب-= مستفعلن) بەڵام (مَاضِيَ إذا-ب ب ب-= مفتعلن) شتی وایش نییە.

١٥- ئێست لەسەر مضاف بڕوانە: ٤. بِمَنْزِلَهْ + هَارُونَ...).

### (نووسینی عەرووزی = الخَطُّ العَروضِيّ):

**(ئەمە لە عەرەبیدا وایە، لە کوردیشدا تا ڕادەیێ ڕەچاو دەکرێ):**

نووسینی عەرووزی جیاوازی زۆری هەیە لەگەڵ نووسینی ئاسایی، واتە: تەقطیع ڕێنووسی تایبەتی خۆی هەیە، کە لەسەر ئەم دوو یاسایە دامەزراوە:

١- ئەو پیتەی بەزار دەگوترێ دەنووسرێ و لە کێشدا جێگەی بۆ دادەنرێ.

٢- ئەوەی کە بەگوتن ناگوترێ نانووسرێ و لە کێشدا حەزف دەکرێ.

جا جێبەجێکردنی ئەم دوو خاڵەیش پێویستی بەم دوو گۆڕانکارییە لە ڕێنووسی ئاساییدا هەیە:

آ- هەندێ پیت کە لە ڕێنووسدا نین زیاد دەکرێن.

ب- هەندێ پیت کە لە ڕێنووسی ئاساییدا دەنووسرێن، لە ڕێنووسی کێشیدا دەکرتێن و نانووسرێن. (بڕوانە: حەرفێ بەدوو حەرف، لە پیتی (ح)یدا).

**١- ئەو پیتانەی کە پتر دەکرێن:**

ئەم شەش پیتە لە نووسینی عەرووزیدا پتر دەکرێن:

١- پیتی گیراویدار بەدوو پیت دەنووسرێ، یەکەمیان بێ بزوێن، دووەمیان بزوێندار. وەک: (رَقًّ) بە(رَقْقَ)ە و (عَدًّ) بە(عَدْدًّ)ە و (ئومّید) بە(ئومْمید) دەنووسرێن. گەرچی بەشێوەیەکی گشتی پیتی قورس لە کوردیدا بەدوو پیت دەنووسرێ، وەک: (مەککە، هەچچە، سەدد، حەدد، ڕەدد).

٢- تەنوین بەنوونێکی وەستاو دەنووسرێ، لە هەرسێ حاڵەتەکەیدا، کە ڕەفعە و نەصبە و جەررەیە، وەک: (جَبَلٌ = جَبَلُنْ، في جَبَلٍ = في جَبَلِنْ، إنَّ جَبَلاً = إنَّ جَبَلَنْ). تەنیا لە حاڵەتی نەصبەدا کە تەنوینەکە قەلب بکرێ بەئەلف، ئەوە بەئەلف دەنووسرێ، بڕوانە: (١٠٢-١-١١) و (حەرف/ ١٦).

١٣- لە هەندێ وشەدا کە کرک بەئەلف دەکرێ و نانووسرێ، ئەو ئەلفە، لە نووسینی عەرووزیدا زیندوو دەکرێتەوە، وەک (الله = اللاه، هذا = هاذا، ذلكَ = ذالكَ، هذه = هاذة، هذان = هاذان، لكن = لاكن، لكنّ = لاكنّ، هؤلاء = هاؤلاء، رحمن = رحمان... تاد).

٤- لە هەندێ ناو واوێ زیاد دەکـــــرێ. بەوێنە: (داود) بە(داوود) و (طاوس) بە(طاووس) و (ناوس) بە(ناووس) دەنووسرێن.

٥- بزوێنی پیتی کۆتایی نیوەی یەکەم و کۆتایی نیوەی دووەم، بۆر بەواو و، سەر بەئەلف و، ژێر بەیێ دەنووسرێن. وەک (رەجەز):

عَلَيْكَ بالدُّعاء فالدُّعاءُ
لكُلِّ دائنا هُوَ الـدَّواءُ!

لێرەدا (فالدُّعاءُ) بە(الدعائو) و (دَوَاءُ) بە(دَوَائُو) دەنووسرێن، لە ڕێنووسی کێشیدا. یا وەک (رەجەز):

فَمَسَّ منْ طيبكَ مَا تَيَسَّرَ    عطْراً على عطْرٍ يَكُنْ، بَلْ اكْثَرَ

دەنووسرێ (تیَسَّراَ، أكثراَ). یا وەک (رەجەز):

تَعَلَّم القرآنَ منْ معلِّمٍ    تُصْبَحْ بذا مثَالَ خَيْرَ مُسْلِمِ

دەنووسرێ (معلمي، مسلمي).

٦- هەموو پیتێکی تێرکراو، چ لە عەرووز و چ لە زەرب و چ لە ناواخن (حشو)دا بێ، پیتێ لە چەشنی بزوێنەکەی پتر دەکرێ و لە خطی عەرووزیدا دەنووسرێ. بەوێنە ئەم ڕاناوانە لە کاتی ئیشباعدا ئاوا دەنووسرێن: (لَهُ) بە(لهو) و (منه) بە(منهو) و (عنه) بە(عنهو) و (بِهِ) بە(بهی) و (فیه) بە(فیهي) و (إلیه) بە(الیهي) و (هم) بە(همو) و (کم) بە(کـمـو)، هەروەها (هذه) بە(هاذهی) دەنووسرێ (بڕوانە: ١١٤ - الشعر). بڕوانە: (ناچارییەکان ژمارە/ ١٢). کورت و پوخت: هەر پیتێ گۆی پێ بکرێ، لە خەتی عەرووزیدا دەنووسرێ هەر پیتێکیش گۆی پێ بکرێ و لە خەتی عەرووزیدا بنووسرێ لە کێشدا دەکێشرێ، وە هەر حەرفێ گۆی پێ نەکرێ لە خەتی عەرووزیدا نانووسرێ، کە نەیشنووسرا لە کێشدا ساقطە.

٢- ئەو پیتانەی کە لە نووسینا دەکرتێن:

١- هەمزەی وەصڵ، کە لە گوتندا کرکی پێ نەکرێ، لە خەطی عەرووزیدا نانووسرێ، بەڵام ئەگەر بۆ ڕاگرتنی کێش بکرێ بەهەمزەی قەطع لە نووسینی عەرووزیشدا دەنووسرێ. جارێ بابزانین کە هەمزە چەند جۆری هەیە: هەمزە سێ جۆری هەیە، هەمزەی بێ بزوێن، وەک: (ئەء، جُؤْجُؤْ، راْس، بِئْسَ...). هەمزەی بزوێندار، یا هەمزەی قەطعە، یان هەمزەی ددرجە، واتە: هەمزەی وەصڵ، کە بریتییە لە هەمزە لەم چەند شوێنەدا:

آ- ماضي و ئەمر و مصدری ئەفعالی خوماسی و سوداسی، کە بەهەمزە دەستیان پێ کرابێ، هەمزەکەیان هەمزەی وەصلە، وەک: (انطلَقَ، إنْطَلِقْ، انطلاق، استـغفَرَ، استـغْفِرْ، استغفَار) هەر کاتێ پیتێکی بزوێنداریان لە پێشەوە بوو، ئیتر ئەم ئەلفە وەصلانە نامێنن، وەک: (فَنطَلَقَ = فانطلق).

ب- هەمزەی ئەم دە ناوەیش هەمزەی وەصلن:

١- اسم ٢- ابن ٣- ابنه ٤- ابنم ٥- امرؤ ٦- امرأة ٧- اثنان ٨- اثنتان ٩- ايمن (کە بۆ شوێن بێ) ١٠- اسْت.

ج- هەمزەی سەرەتای فِیعلی ئەمری ثولاثی، کە پیتی دوا پیتی موضارعی بێ بزوێن بێ، هەمزەی وەصلە، وەک: (فَسْمَعْ = فاسْمَعْ).

د- هەمزەی (ألْ)ی تەعریف، ئەویش لە سەرەتاوە چەسپاوە، ئاوا دەنووسرێ: (المسلم: المسلم، الدَار: اَدْدَار، النار: أنْنَار... تاد). لە کاتی پەیوەستا دەکرتێ، جا ئەگەر قەمەری بوو، لامەکەی دەچەسپێ و ئاوا دەنووسرێ: (طَلَعَ القَمَرُ: طَلَعَ لْقَمَر). ئەگەر شەمسیش بێ ئەلفی وەصلەکە دیسان دەکرتێ و نانووسرێ، لامەکەیش دەکرێ بەپیتێ لە چەشنی پیتەکەی پاشی، ئاوا: (تُشْرِقُ الشمْسُ: تشرقُ شْشَمْسُ) و (وَالناس: وَنْنَاس، بالصدقَ: بِصْصِدْقِ) واتە: هەمزەی وەصلی شەمس دەق وەک پیتی قورس دەنووسرێ.

بۆ هەمزەی قەطعیش بڕوانە: کۆتایی ژمارە (١٠١) لە ناچارییەکان.

٢- واوی (عمرو) لەکاتی بۆر و ژێردا دەکرتێ، وەک (یاعمرو!) دەنووسرێ: (یَاعَمْرُ).

٣- یێی وەستاوی کۆتایی وشە و ئەلف و ئەلفی مەقصوورە و واوی وەستاو، هەروا حەرفی عیللە، لە هەر شوێنێکی وشەدا بن، مادام لەبەر هۆیێ گۆیان پێ ناکرێ، لە خەطی عەرووزیدا نانووسرێن. وەک:

(في البَيْتِ، إذَا الشَمْسُ، إلَى الْمَدِينَة، عَلَى المائدَة، المحامي القدير، تَمْضى فى، أحْلى المُنى) ئەم وشانە وێنەیان لە نووسینی کێشیدا ئاوا دەنووسرێن:

(فلْبَيْت -- ن، إذشْشَمسُ ب -- ب، إلْلْمَدينَة ب - ب - ب ب، عَلَلْمَائدَة ب -- ب ب ب، المحاملقدير - ب -- ب - ر، تَمضَفي - ب -). کورت و پوخت: پیتی بزوێن و حەرفی عیللە لەبەر هەر هۆیێ گۆیان پێ نەکرێ نانووسرێن، دەنا ئەگەر گۆیان پێ کرا دەنووسرێن، وەک (تمضى الى = مستفعلن -- ب -).

٤- ئەلفی پاش واوی کۆ دەکرتێ، وەک: (کـتـبـو = کـتـبـوا، لَنْ يَدْخُلُو = لَنْ يَدْخلُوا، اخرُجُو = اخرجُوا).

(نموونەیێ لە نووسینی عەرووزی لە شیعری خۆم):

هُمَزَةٌ قَدْ قَادَ جَیـــشَ الفیـلِ

خَانَ الحِمی ملعونُ کُلِّ جِیلِ

| شَلْفِیـلِ | قَدْ قَادَجَیْ | هُمَزَتُنْ |
|---|---|---|
| مفعولن | مستفعلن | فَعِلَتن |
| - - - | - ب - - | ب ب ب - |

| لجِیلِیْ | مَلعونُکُلْ | خَانَلْحِمی |
|---|---|---|
| فَعُولَنْ | مستفعلن | مستفعلن |
| ب - - | - ب - - | - ب - - |

ئەمانەی گوترا زۆربەی تایبەتە بەشیعری عەرەبییەوە، لە شیعری کوردیدا، کە جاران بەرێنووسی فارسی دەنووسرا، لەگەڵ رێنووسی عەرەبیدا جیاوازییەکی وەهای نەبوو، بەڵام ئێستا جیاوازی زۆرە، بۆ تەواوکەری ئەم باسە بڕوانە: (خَطُّ العَرُوض) کە لە مادده (خ. ط. ط)دا دێ.

٣ - هەندێ تایبەتی رێنووسی کوردی:

١ - هەندێ پیتی عەرەبی لە کوردیدا بەپیتی تر، کە نزیک بێ لە مخرجەکەی، دەخوێنرێتەوە، وەک (ص) بە (س)، (ضاد) بە (زێ) و (ث) بە (س) و (ذ) بە (زێ) ئەمە بەهەر شێوەیێ بنووسرێ، هیچ لە کارەکە ناگۆڕێ، بەڵام وا باشە بەشێوەی کوردی بنووسرێ، چونکە رێنووسی کوردی بەپیتی عەرەبی، وشە یا پیت چۆن لە دەم دەردەچێ ئاوا دەنووسرێ (بنوارە: ذال و ثاء) و (بڕ: حەرفێ بەدوو حەرف/ حرف).

٢ - بەڵام شتێکی جەوهەریتر هەیە، کە بڕگە (مقطع) لە کوردیدا وەک لە دواوە باسی دەکەین جیاوازییەکی بنچینەیی هەیە لە بڕگەی عەرەبی، جا لەبەر ئەمە وا باشە کە لە سەرەتاوە بۆ داهێنان و مەشقکردن، شیعری کوردی سەروبۆر و ژێروزەنەی بۆ بکرێ، دەق وەک حەرەکات و سەکەناتی عەرەبی، لەپاشا کە کێشزان قاڵ بوو، بەرەبەرە بەرێنووسی ئاسایی بنووسرێ. وەک (هەزەج/ وافیر):

ئەمن دەمرەم بەڵام وێنەم دەمێنێ

هیوام وایە کە خۆشی گەل ببینێ

لەسەرەتاوە ئاوا تەقطیع بکرێ:

| | | |
|---|---|---|
| أمَنْ دَمْرَمْ | بَلاَمْ وِیْنَمْ | دَمِیْنِی |
| مفاعیلن | مفاعیلن | فعولن |
| ب --- | ب --- | ب -- |
| هِوَامْ وَایَا | کَخُوْشِیْ گُلْ | بَبِیْنِیْ |
| مفاعیلن | مفاعیلن | فعولن |
| ب --- | ب --- | ب -- |

٣- وا باشە لە عەرووزی کوردیدا، لە سەرەتاوە نموونە بەهۆنراوێ بهێنرێتەوە کە برگەکانی زۆر نزیک بن لە برگەی عەرەبی، تا سەر لە مەشقکەر نەشێوێ وەک (هەزەج):

بەسەرسامی لەسەر لوتکەی بلّندی گەنجی وەستاوم

شەریتی عەمری ڕابووردووم وەکو خەو دێتە بەرچاوم

٤- شیعری مەشطور و مەنهوک بەدوو شێوە دەنووسرێن:

آ- بەشێوەیەکی سەربەخۆ، ئاوا وەک شیعری تری دوو نیوەیی، ئەگەر دێڕێ ما بەتەنیا لە ژێر ئەوانەوە لە نێوانیانا ئاوا دەنووسرێ:

نحن بنات طارق    نمش على النمارق

إنْ تُقْبِلُوا نُعَانِقْ    أو تُدْبِرُوا نُفَـارِق

فِراقَ غَيْرِ وامق

ب- هەموو دێڕێ بەتەنیا بنووسرێ، دوو دێڕ دوو دێڕ بەیەکەوە نەنووسرێن، وەک ئەو هۆنراو و چامەیەی لە (٢٢ - البيت - ٤، ٥)دا نووسراون.

**(وشـەیێ سـەبارەت بەگرنگیی زانسـتی عـەرووز):**

**عـەرووز چییە؟:**

عـەرووز زانسـتێکی تایبەتییە، کێشی ڕاست و دروسـتی شیعری، لە کێشی لەنگ و چەوتی شـیعر، لە هەمـوو زمـانێکا پێ جـیـا دەکرێتـەوە، هەروا شـیعـر جیـا دەکـاتەوە لە پەخشـان، بەهەموو جۆرەکانی پەخشانەوە، چ ئەو شیعرە ستوونی بێ، وە چ کێشی پەنجە بێ، گـەرچی کـێـشی پەنجـە خـۆشی بەر سـتـوونی دەکـەوێ. هەروەک چۆن نەحـو و ڕێزمـان ئاخاوتنی ڕەوان و ڕەسـەنی بێ هەڵەی زمـانەوانی، لە قـسـەی ڕەمـەکی و ڕەشـۆکی جـیـا دەکـەنەوە، عـەرووزیـش ئاوا هەڵبـەسـتی کـێـشدار لە هەڵبـەسـتی لەنگی لارەسـەنگ جـیـا دەکاتەوە.

**مـەوزووع و بابـەتی عـەرووز:**

شیعر و هۆنراو و هەڵبەستە، لە بابەت دروسـتی و نادروستی کێشەکەیانەوە.

**سـوودی ئەم زانسـتـە ئەمـەیە:**

کە هۆنراو لە قسـەی ئاسایی و لە پەخشان بەهەموو جۆرەکانیەوە، با سەرواداریش بن، وەک سـەجع، جـیـا دەکـاتەوە، بەوێنە: مـقـامـاتی حەریری و هەمـەدانی شـیـعـر نین، وە لە هەمـان کـاتا شـاعـیرە نوێکـان فـێری هونەری شیعـر هۆنینەوە لەسـەر شێـوەیەکی ڕاست و دروسـتی بێ هەڵە دەکـات، کە هۆنـەری هەسـتـیـار بن، نەوەک فـێری پیت ڕیزکردن و پەنجە ژماردن بن و بەس!

عـەرووزی عـەرەبی سـوودێکی تایبـەتی تریشـی هەیە، کـە بەهۆیەوە دەزانرێ کـە قـورئان شـیـعـر نییـە و قـسـەی شـاعـیـر نیـیـە، سـەلماندنی ئەم ڕاسـتـیـیـەش مـەبەسـتـێکی گـرنگی ئایینییە، دادەنرێ بەئەرکێکی کفایی ئیسلامی.

**شـیـعـر چییە؟:**

شیعر بریتـییە لە دوو شتی جەوهەری: لە لەفظ و لە مەعنا، واتە: بریتـییە لە بێژە و واتا، وەک گوتراوە: (الشـعـر الكلام الموزون المُقَفَّى مَعَ القَصْدِ). واتە: قـسـەی کـێشـداری سەروادار لەگەڵ هەبوونی نیازی شیعر.

کـێـشـزانی (عـەرووز) و کـێـش (وەزن) پەیوەندییـان هەر بەلەفظەوە هەیە، لەم ڕووەوە

شیعر بریتییە لە: (گوتاری خاوەن کێش و سەروا کە بەمەبەستی شیعر گوترا بێ) جا هەر ئاخاوتنێ ئەم سێ عەناصیرەی تیا نەبێ بەشیعر دانانرێ وەک: (نەفرەت لە شەڕی براکوژی، چەن دڵتەزێنە خوێنی برای خۆت بەدەستی خۆت بڕێژی). هەندێ ئایەتی قورئانی پیرۆزیش هەن، هەموو مەرجێکی شیعریان وا تیادایە، بەڵام چونکە بەمەبەستی شیعر نەگوتراون، هیچ بەشیعر دانانرێن، وەک:

لَنْ تَنَالُوا البِرَّ حَتَّى  تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّون

یا وەکو ئەم گوتەیە کە پێغەمەر (د. خ) فەرموویەتی:

هَلْ أنت إلاّ إصْبَعُ دَمَيت

وَفي سَبِيلِ اللّهِ مَا لقيتِ

لە لایەنی واتایشە، دەبێ هەمیشە ئەم ڕاستییەمان لە بەرچاو بێ: (شیعر: کێشە، ئاوازە، مۆسیقایە، ئەندێشەیە، سۆزە، هەستی ناسکە، خەیاڵە، زمانی هەستە، دوانە بەزمانی دڵ، ئەدەبێکی بەرزە خەیاڵ ئامێتە دەکا لەگەڵ واقیعا، پەی بردنە بەدەربڕینی جوانی ئەدەبی، لە ناسکی و نازداری و ڕاز و ئەسراردا لە وەحی (سرووش) دەکا، ئیبداعە، داهێنانە، خورپەیە، خولیایە). وەکی تریش: (شیعر واتە: شای گوتار!). کەواتە لەم ڕوانگەیەوە ئەم شتانە، گەرچی بەمەجاز پێیان دەگوترێ شیعر، بەڵام لە حەقیقەتدا شیعر نین:

١- هۆنراوی ئاسایی، وەک: شیعری تەعلیمی و هەڵبەستی فێرکاری، وەک ئەلفیەی ئیبنو مالیک و زۆر لە ئورجووزەکانی تر، کە مرۆڤ فێری زانستی لە زانستەکان دەکەن.

٢- شیعری حوڕ، شیعری ئازاد.

٣- هەر شیعرێ کە یاسا دامەزراوەکانی کێش ببەزێنێ.

٤- پەخشانی پڕ واتای سەجعداری جوان. وەک: (منم من منۆکە، پێمەوەیە دوو چاوی بزبزۆکە!). (بڕ: سجع).

عەرووزی عەرەبی، لە سەدەی دووەمی کۆچیدا، مامۆستای فرەزانا، خەلیلی کوڕی ئەحمەدی فەراهیدی (١٠٠-١٧٤ک) دایناوە.

دیارە کە هەموو زمانێ عەرووزی تایبەتی خۆی هەیە، هەروەک ڕێزمان و ڕێنووسی تایبەتی خۆی، ئەوەیش واتای وا نییە کە هیچ زمانێ، لەم بوارەدا، بەهرەی لە زمانەکانی

تر ودرنەگـرتووە، بەڵکو بەپێـچـەوانەوە زمـانەکـان لەناو خـۆیـاندا، لەم بوارانەدا سـوود لە یەکتری وەردەگرن، بەپێی دوور و نزیکییان لە یەکتری. کورت و پوخت: (شیعر لەسەر ئەم چوار ستوونە بەندە: ١- بێژە (لفظ) ٢- کێش ٣- واتا ٤- سەروا).

(جۆرەکانی شـیـعـر: أنواع الـشـعـر):

شیعر بەزۆر ئیعتیبار و ڕەچاوکردن، ناوی جیاجیای شایستەی هەیە: هۆنراو ئەگەر تاقە دێڕ (بەیت)ێ بێ، پێی دەڵێن: (فەرد: تاک، تاقانە). ئەگەر دوو شیعر بێ، پێی دەڵێن: (ڕوباعی: چوارین، چوارینە). چونکە چوار نیوە دێڕە، دوو بەیتیشی پێ دەگوترێ، یا دوو بێت، ئەمە خۆی کێشێکی فارسییە، بەڵام عەرەب و کورد و تورک و گەلانی تریش لەسەر ئەم کێشە هەڵبەستیان هۆنیوەتەوە. (بڕ: البیت، الشعر). بڕوانە (١٤٠- الشعر)

(بڕگە: مـەقـطـەع، بڕگە عـەرووزییـەکان: اَلْمَقَاطِع الْعَرُوضِيَّة)

بڕگە لە هەمـوو زمانێکا بڕبڕاگەی کێشـە، سروشتی ئەو زمانە هەر چۆنێ بێ، چ کێشی هەڵبەستی چەندی بێ، چ لەنگەر بێ، چ پەنجە بێ، بڕگە بریتییە لە یەک لەرەی دەنگی سەربەخۆ، یا بریتییە لە چەند لەرەیەکی دەنگی وا، کە هەر یەکەم لەرەیان سەربەخۆ بێ، ئەوانی تریان لە گۆ پێکردندا بێن بەپاشکۆی یەکەم، وە بەبێ ئەو گوتنیان ستەم بێ).

بۆ حاڵیبوون تەواو لە حاڵەکە دەڵێین: یەکەم:

١- بڕگەی عەرووزی جیاوازی زۆری هەیە لە بڕگەی دەنگی.

٢- بڕگەی کوردی - بەدەنگی و عەرووزییەوە - جیاوازی زۆرە لە بڕگەی عەرەبی.

دووەم: جارێ بەکـورتی، لە بڕگەی کوردی دەدوێین، بڕگەی کـوردی بەهۆی چەندییـەت و چۆنییەتەوە، دەبێ بەدوو بەشی سەرەکییەوە:

١- (بڕگەی کورت): دوو جۆری هەیە.

٢- (بڕگـەی درێژ): جـۆری زۆرە، بەڵام با درێژی ئەم دوو خـاڵـە دوا بخـەین، بۆ پاش ڕوونکردنەوەی ئەم زاراوانە:

(حەرف: پیت، تیپ). (حەرەکە: جووڵە: بزوێن). (سکون: زەنە: وەستان). (فتحە: سەر). (کسرة: ژێر). (ضمە: بۆر). (کسرة مختلة: پیتە بزوێن)

یەکەم: پیت بەچەند بایەخێ، چەند جۆرێکی هەیە، وەک:

آ- پیتی جووڵەدار: بزواو: بزووتوو: بزوێندار: حەرفی موتەحەرریک. لەعەرەبیدا پیتی جووڵەدار سێ جۆری هەیە: (مەفتووح: سەردار، مەکسوور: ژێردار، مەضموومِ: بۆردار).

بەڵام لە کوردیدا چوار جۆری هەیە: چونکە یا سەری هەیە، یا ژێری هەیە، یا بۆری هەیە، یا پیتە بزوێنی هەیە، کە ربودە، یا (کسرة مختلة)یشی پێ دەڵێن و، لە عەرەبیدا نییە، وەک یەکەم پیتی سەرەتای ئەم وشانە: (ژن، من، دڵ، بزن، کزن، چز، چزوو).

ئەوەی شایانی باسە پیتی بزواو، لە ڕووی کێشەوە یەک بەهای هەیە، ئەوەندە بەسە کە پیتی بزواو لە میزان و مەوزووندا - واتە: لە تەرازوو و کێشراودا - هەردوو لایان بزواو بن، خۆ ئەگەر بزوێنەکەیشیان جیاواز بن، بایەخی نییە، بەمە دەگوترێ: (الحركة في الموزون تُقابَلُ بالحركة في الميزان وَإنْ كانَتَا مِنْ نوعين مختلفين، كان تكون في الموزون فتحةً وفي الميزان ضمَّةً وهكذا).

وەک جیاوازی زۆربەی بزوێنەکانی ئەم شیعرە کە مەوزوونە، لە تەرازووەکەی (رەجەز):

جَامِعَةٌ تَكُونُ مِنْ طُـــلابِهَا

مفخَرَةٌ حَتَّى لِمَنْ طَـــــلاَّبِهَا(*)

مُفْتَعِلُنْ، مَفَاعِلُنْ، مُسْتَفْعِلُنْ

مُفْتَعِلُنْ، مُسْتَفْعِلُنْ، مَفَاعِلُنْ

دەبینین بزوێنەکان لە کێشراودا ئاوایە:

ـَ، ـْ، ـ، ـَ، ـُ، ـْ، ـَ، ـُ، ـْ، ـُ، ـ، ـْ، ـُ، ـْ، ـَ، ـْ، ـ، ـَ، ـَ، ـْ

ـَ، ـْ، ـَ، ـَ، ـُ، ـْ، ـَ، ـْ، ـَ، ـْ، ـِ، ـَ، ـْ، ـَ، ـَ، ـْ، ـِ، ـَ، ـْ

بەڵام لە تەرازووەکەیدا ئاوایە:

ـُ، ـْ، ـَ، ـ، ـُ، ـْ، ـَ، ـَ، ـْ، ـ، ـُ، ـْ، ـُ، ـْ، ـَ، ـْ، ـ، ـُ، ـْ

ـُ، ـْ، ـَ، ـ، ـُ، ـْ، ـُ، ـْ، ـَ، ـَ، ـْ، ـ، ـُ، ـْ، ـَ، ـَ، ـْ، ـ، ـُ، ـْ

ب- پیتی وەستاو: ئارام: نەبزووتوو: نەجووڵاو: ساکن: بێ بزوێن: نەبزوێن. لە عەرەبی و لە کوردیدا پیتی وەستاو یەک جۆری هەیە. پیتی بزواو و پیتی وەستاو لە

---

(*) طَلاَ أيْ أبْطَأ: يَعني كَوْنَكَ أيُّها الطَّالبُ المتفوق في هذه الجامعةِ مَفْخَرَةٌ حَتَّى للطلاَّبِ الكُسالى فيها.

ئاخاوتنی عەرەبیدا ڕوون و ئاشکران و، دیاریکردنیان لەناو وشە و پێدا زۆر ئاسانە، گەرچی هەردوو لا لە وشە و پیتی کوردیشا هەن، بەڵام لە هەندێ شوێنا ڕوون نین.

ج- پیتی دەنگی: پیتی بێ دەنگ: حەرفی صامیت. مەبەست لە پیتی بێ دەنگ ئەو پیتانەیە کە لە وشەدا، بزوێن، یا پیتە بزوێن، یا بزوێنی درێژ، وا لەسەریان، هەروا مەبەست ئەو پیتانەیە کە لە وشە و ئاخاوتندا بێ بزوێن و غەیری بزوێنی درێژیشن. وەکو: (ب، پ، ر، پ، ڵ) لە (با) و لە (پرپۆڵە)دا، یا وەک (س. ک) لە (ئاسک)دا. هەروا.

د- پیتی دەنگدار: پیتی بزوێن. دوو جۆری هەیە، جۆرێکیان لە عەرەبیدا بەپیت نانووسرێن، بەڵکو لەسەر شێوەی سێ نیشانە ئاوا (-َ، -ِ، -ُ) سەر، ژێر، بۆر، لەسەر پیتی بێ دەنگ دەنووسرێن، وەک بزوێنەکانی پیتەکانی (تَزِرُ) کە بەڕیز: سەر، ژێر، بۆرن. ئەمانە پیتە بزوێنی کورتن، لە کوردیدا بەپیت دەنووسرێن، سەر بە(ە) و ژێر بە(ی)ی کورت و بۆر بە(و)ی کورت. وەک کورتە بزوێنەکانی پیتەکانی بێژەی (ڕەنگی گوڵاڵە) کە بەڕیز بریتین لە (ە، ی، و، ە).

جۆری دووەمی پیتی دەنگدار پیتە بزوێنی درێژە، کە ئەلف و واو و یێن، کە پیتی مەدد بن، کە ئەم سێ پیتن: (اْ، يْ، وْ). پیتی مەدد بریتییە لە پیتی عیللەی وەستاو کە بزوێنی پیتەکەی پێشی لە چەشنی خۆی بێ، وەک: ئەلفی (قال) و ییی (قیل) و واوی (کوفە). ئەم جۆرەیان لە عەرەبیدا حەرفی مەدد و حەرفی صائیتیان پێ دەگوترێ.

هـ- جووڵە: بزوێن: حەرەکە. بزوێن لە عەرەبیدا سێ جۆری هەیە: سەر، ژێر، بۆر، لەسەر پیتە بێ دەنگەکان ئاوا دەنووسرێن: (-َ، -ِ، -ُ) بەڵام بزوێن لە کوردیدا دوو جۆری هەیە: یەکەم بزوێنی کورت، دووەم: بزوێنی درێژ. بزوێنی کورت چوار جۆرە: سەر، ژێر، بۆر، پیتە بزوێن. بزوێنی درێژیش بریتین لە ئەلف و واو و یێ، کە پیتی مەدد بن.

و- زەنە: سکون، بزوێنی کورت لە کوردیدا ئەمانەن: (ە، ی، و) پیتە بزوێن تا ئێستا لە پیتی عەرەبیدا نیشانەی بۆ دانەنراوە، بزوێنە درێژەکانیش ئەمانەن: (ا، ی، وو، ۆ، یێ، وێ).

دووەم: ئەوەی شایانی گوتنە ئەمەیە: لە عەرەبیدا جیاکردنەوەی سەر لە ئەلف، یان ژێر لە یێ، یان بۆر لە واو زۆر ئاسانە، هەروا زەنە لە جووڵە، هەروا سەروبۆر و ژێر بەئاسانی لە یەکتر جیا دەکرێنەوە، چونکە لە عەرەبیدا چۆنیەت و چەندیەتی ئەم دەنگانە زۆر ڕوون

و ئاشكران، لەبەر ئەوە تێكەڵ و پێكەڵ نابن و گیروگرفت و كێشەی كێشیی دروست ناكەن، بەوێنە ئەلف كە بزوێنی درێژە دوو ئەوەندەی سەرە، كە بزوێنی كورتە، هەروا یێ دوو بەقەد ژێرە و واو دوو بەقەد بۆرە. جا لەبەر ئەم سروشتە جیاكردنەوەی بڕگەی كورت لە بڕگەی درێژ لە عەرەبیدا زۆر ئاسانە، هەر لەبەر ئەم تایبەتمەندەیە، كە دیاریكردنی بڕگە لە عەرووزی عەرەبیدا كارێكی ئاساییە و زۆر ئاسانە.

وەلێ لە كوردیدا جوولە و جۆری جوولە و ماوەی جوولە، لە گەلێ شوێندا، بەرێژەیەكی یەكسان نین، وەك عەرەبییەكە، جیاكردنەوەیان لە یەكتری ئاسان نییە، جا لەبەر ئەم جیاوازییە، گەلێ جاران لە كوردیدا بڕگەی كورت و بڕگەی درێژ جێگۆڕكێ دەكەن و، وا دەبێ بڕگەیەكی تایبەتی، لە هۆنراوەدا بەكورت و لە پەخشاندا بەدرێژ دەخوێنرێتەوە، یا بەپێچەوانەوە، وا دەبێ لە یەك دێڕە شیعردا بڕگەیێ بەهەردوو لا دەخوێندرێتەوە، گەرچی شتی وا لە عەرەبیشدا كەم كەمە هەیە، بەڵام لە شیعری كوردیدا زۆر زۆرە لەبەر ئەوە دەبێ لە كاتی دیاریكردنی بەحری هۆنراوەدا، بەكەرتكردن و تەقطیعی یەك شیعر ئیكتیفا نەكرێ.

ئێستایش كاتی ئەوەیە بچینەوە سەر باسی بڕگەی كوردی. دەڵێین.

**(بڕگەی كوردی) دوو جۆری سەرەكی هەیە:**

یەكەم: بڕگەی كورت، كە دوو چەشنی هەیە، هەر چەشنەی یەك پیتی بزواوە:

آ- پیتێكی بێ دەنگ و پیتێكی بزوێنی كورت، كە پێكەوە لە گەروو دەردەچن، وەك: (سە) و (بە) و (تە) كە سێ بڕگەی كورتن، لە وشەی (سەبەتە)دا. ئەوەتە سەبەتە بریتییە لە سێ پیتی بێ دەنگی (س، ب، ت) وە سێ پیتی بزوێنی كورتی (ە، ە، ە). یا وەك بڕگەكانی (گو) و (ڵە) لە وشەی (گوڵە)دا، یا بڕگەكانی (كە) و (نی) لە وشەی (كەنی)دا. گوڵە پێكهاتووە لە دوو پیتی بێ دەنگی (گ، ڵ) و لە دوو پیتی بزوێنی كورتی (و، ە). كەنیش لە دوو پیتی بێ دەنگی (ك، ن) و لە دوو پیتی بزوێنی كورتی (ە، ی). ڕەچاو دەكرێ كە سەبەتە سێ بڕگەی كورتە، گوڵە دوو بڕگەی كورتە، كەنی دوو بڕگەی كورتە، وەك ڕەچاو دەكرێ (و) لە (گوڵە)دا، واوی كورتی بێ نەبرەیە، هەروا (ی) لە (كەنی)دا، یێی كورتی بێ نەبرەیە، دەنا ئەگەر نەبرە بچێتە سەریان درێژ دەبنەوە و، دەبن بەواوی درێژ و بەیێی درێژ و دەبن بەبزوێنی درێژ. بزوێنی درێژیش كە چووە سەر پیتی بێ دەنگ دەبێ بەبڕگەی درێژ. وەك (شیر، سوور).

ب- پیتێکی بێ دەنگ و پیتە بزوێنێ، وەک بڕگەکانی (ب، ک، چ، ب) لە سەرەتای ئەم بێژانەوە: (بزن، کزن، چڕۆ، بخۆ، بچۆ، بخەوە، ببە).

تێبینی: ١- بزوێنی کورت لەگەڵ پیتە بزوێندا، یا لەگەڵ بزوێنی درێژی لە چەشنی خۆیدا، گەلێ جار، لەسەر پیتێ، لەناو وشەدا، ئەگەر جێ بگۆڕنەوە، واتای وشەکە بەتەواوی دەگۆڕێ، ئەوەیش بۆ سەروا و بۆ جیناس و وشەئارایی لە هۆنراودا، زۆر گرنگە، هەستیاران بەهرەی گەورەیان لێ وەرگرتووە، هەروا سێ پیتە بزوێنە کورتەکانیش، لە کاتی جێگۆڕینەوەیاندا هەمان شت ڕوو دەدا. وەک: (خلە) ناوە بۆ کەسێ، (خەلە) ناوە بۆ دەغڵ و دان (چقڵ): دڕک و شتی تری وا (چەقەڵ) ناوە بۆ دەعبایێ، وەک: (کل، کەل، مل، مەل، گڵ، گەڵ، دڵ، دەڵ، تور، توور، تون، توون...).

نالی -بەرەحمەت بێ- دەفەرمووێ (مضارع):

ئەی ساکینی ریاضی مەدینەی (مونەووەرە)

لوطفێ بکە، بفەرموو: مەدینەی (منەو، وەرە)

لە نێوانی (مونەووەرە) و (منە، و وەرە)دا، جیناسی تەرکیب هەیە، چونکە یەکەمیان یەک وشەیە و، دووهەمیان دوو وشەی بەیەکەوە بەستراوە، جیاوازی واتای یەکەم لە دووهەم ئاشکرا و ڕوونە، کە ئەویش ئەنجامی گۆڕینی بزوێنی کورتە بەپیتە بزوێن.

٢- بڕگەی کورت بەهەردوو جۆرەکەیەوە، لە کێشی عەرووزیدا، ڕۆڵی پیتێکی بزوێندار دەبینێ و بەس (ب) وەک بڕگەکانی (ش، لە، وە، خو، گە، عی، ل، ت، دە) لە وشەکانی (شتێ، لە، وەجاخ و، جێگەدار، شاعیران، عالمان، نیشتمانی، کوردەوار) لەم هۆنراوەیەی قانیعی ڕەحمەتیدا (رەمەل):

سێ شتێ ئەمڕۆ لە دنیا بێ وەجاخ و جێگەدار

شاعیران یەک، عالمان دوو، نیشتمانی کوردەوار!

هەروا لە کێشی بڕگەییشدا، ڕۆڵی یەک پیتی بزواو دەبینێ، کە بکاتە نیوەی سەبەبی قورس ئاوا (ب). وەک بڕگەکانی (مە، پە، هە، بە، مە، ب) لە وشەکانی (مەلی، پەل، هەڵۆ، بەجووت، مەترسن، بلێم)ی ئەم هۆنراوەی گۆراندا - بەر ڕەحمەتی خوا کەوێ - (پازدە بڕگەیی):

مەلی سەربنچک، پەل و پۆ ڕەنگین، خۆ من هەڵۆ نیم

لێم مەفڕن بەجووت، مەترسن ئاخر پێتان بلێم چیم

دووەم: بڕگەی درێژ. جۆری زۆرە، لە هەموو جۆرەکانیدا ڕۆڵی دوو پیت دەبینێ، کە یەکەمیان بزواو بێ و دووەمیان وەستاو، مەگەر لە کۆتایی دێڕدا، وەک کاتی تەذییل و تەسبیغ. بڕگەی درێژ ئەوەیە دوو پیتی بێ دەنگ، یا زیاتری تیا بێ، یا پیتی بێ دەنگ و بزوێنی درێژی تیا بێ، لەسەر یەکێ لەم شێوانە:

آ- پیتێکی بێ دەنگ و پیتێکی دەنگداری درێژ، وەک: (ئا، با، بی، بێ، یا، یێ، وا، یی، توو، تۆ، دۆ، دوو، وو، خۆ، خوو، لۆ، لوو، نۆ، فوو، جوو، جۆ). ئەم جۆرە یەکسانە بەسەبێکی سووک، وەک: (لوو) یەکسانە بەنیشانەی (-) یا وەک دوو بڕگەکەی (دارا = -،-) یا وەک بڕگەکانی (بێسارانی = ----). بەڵام (وو) و (یی) جاری وا هەیە دادەنرێن بەبڕگەی کورت (بڕوانە: ناچارییەکان/ ١٣).

ب- دوو پیتی بێ دەنگ (دەنگی) لەناوەڕاستیانا بزوێنێکی کورت هەبێ، وەک: (بەز، بەن، بەر، سەر، گوڵ) یا لەناوەندیانا پیتە بزوێنێ هەبێ، وەک: (تر، کل، جل، مل، سڵ، دڵ). ئەم جۆرەیش لە تەرازوودا یەکسانە بە(-). وەک بڕگەکانی ئەم ڕستەیە، کە شەش بڕگەن: (سەرگوڵ زۆر خۆش بڕوای) کە یەکسانە بە(------).

ج- دوو پیتی بێ دەنگ، لەنێوانیانا بزوێنێکی درێژ هەبێ. وەک: (بار، باز، ناز، بیر، شیر، بۆر، تۆڕ، توور، مۆر، مۆڕ، هۆو، تۆو، توون، بۆی، میو). یا وەک ئەم بڕگانە: (ڕۆژ، گار، بای، چاو، ماس، ییو، بۆم، قیو) لە وشەکانی ئەم هۆنراوەدا (دە بڕگەیی):

ئاوسە (ڕۆژگار) وەک (بـــای) داراوس

بەکارەسـات و ڕووداوی قـورس قـورس

دنیا لەبەر (چاو) وەک (ماستی مەییو)

لەپڕ دەبێتــــــە (بۆمـبـایێ تـەقیـو!)

د- پیتێکی بێ دەنگ و بزوێنێکی کورت و دوو پیتی بێ دەنگی تر، وەک: (بەرز، لەرز، تەرز، مەرز، هەرس، سەرد، گەرم، مەرد، ڕەنگ، دەنگ، کوڵم، گورز) یا وەک ئەم بڕگانە: (مەرد، جەرگ، مەشق، خەوش، نەوش، نەوز، قەید) لەم وشانەدا: (نامەرد، جەرگبڕ، سەرمەشق، بێ خەوش، وەنەوش، وەنەوز، بێ قەید).

هـ- پیتێکی بێ دەنگ و پیتە بزوێنێ و دوو پیتی بێ دەنگی تر، وەک: (ئارد، ماست، ڕاست، پۆست، دۆست، پێست، بیست، مێرد، کێرد، سارد).

ز- هەندێ ئەم جۆرە بڕگانە: (جەنگ، دەنگ، سەنگ، ڕەنگ، شەنگ، بەنگ...) ئاوا لە قەڵەم دەدەن: پیتێکی بێ دەنگ و بزوێنێکی کورت و پیتێکی تێکەڵاو لە دوو پیتی بێ دەنگ، چونکە لەم نموونانەدا (نگ) بەهەردوو پیتەکەی دەنگێکی تێکەڵ پێک دەهێنن، کە نە دەنگی (ن)یە، وە نە دەنگی (گ)یە، بەڵکو دەنگێکە تێکەڵ لە هەردوو لا، وەک منگە، یا وەک ئیمالە لە عەرەبیدا. هەروا ئەم جۆرە بڕگانەیش: (مانگ، لاجانگ، بانگ، قانگ، ئاسک، ماست، ڕاست) ئاوا لە قەڵەم دەدەن: پیتێکی بێ دەنگ و بزوێنێکی درێژ و پیتێکی تێکەڵاو لە دوو پیتی بێ دەنگ. بیمار لە (کێش و مۆسیقای هەڵبەستی کوردی)دا، لەم بارەیەوە دەڵێ: (س، ک)ی ئاسک بووەتە (دیفونگ) واتە: (دوو دەنگی لێکدراو، بۆیە وشەی ئاسک دەبێ بەیەک بڕگە گۆ بکرێ...).

ح- ئەم جۆرە بڕگانەی تریش هەن پێیان دەگوترێ: بڕگەی شلۆقی دوو بەینی، کە کەمێ خواروخێچن، گەلێ جار لە کاتی تەقطیعا، بەبڕگەیێ، یا بەدوو بڕگە گۆ دەکرێن: (خوێن، جوێن، سوێن، شوێن، نوێن، گوێ، خوێ، گیان، ژیان، جوان، خوان، گوێی، ڕێی، نوێ، توێ، توێی، نێی، جوێ، سوێ، کێی، خوا).

نەوەتا مەحوی - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - لە یەک چامەدا وشەی خوێن، جارێ بەیەک بڕگەی درێژ و جارێ بەدوو بڕگە (یەکێ کورت و یەکێ درێژ) بەکار دەهێنێ، کە دەفەرمووێ (هەزەج):

وەرە دەستێ بەخوونم کە نیگارین

خووێنی من حەڵاڵت بێ نیگارا

موژەی خوێنێ دەکا هەر لەحظە، سەیرە

ئەمەندە گوڵ لەبن یەک نووکە خارا

چونکە لە شیعری یەکەما (خووێنی من = ب---= مفاعیلن) کەواتە: خوێن، یەکسانە بە(مَفَا ب-) کە دوو بڕگەیە، یەکەم کورت و دووەم درێژ. کەچی لەشیعری دووەمدا وشەی (موژەی خوێنێ ب ---= مفاعیلن) کەواتە: خوێن یەکسانە بەیەک بڕگەی درێژ. ئەم جۆرە بڕگانەیش ئاوا هێمایان بۆ دادەنرێ: بار-ْ، مێو-ْ، مەرد -ْ، ماست-ْ، خوێن-ْ).

**(چەن تێبینییەک):**

١- وا دەبێ کە بڕگە وشەیەکی تەواو دەبێ، وەکو (ئاسک) جاری وا دەبێ بەشێکە لە وشەیێ، وەکو بڕگەکانی (سەبەتە) و (کەرەستە) جاری وایش دەبێ دابەش دەبێ بەسەر دوو بێژەدا، وەک (نم) لە (خوونم) و (نی) لە (خوێنی من) و (ڵت) لە (حەڵاڵت)دا، لە شیعرەکەی مەحویدا، چونکە (نم -) کە بڕگەی درێژە، پیتی یەکەمی کە (ن)یە، بەشێکە لە وشەی (خوون) کە موزافە، وە پیتی دووەمی کە (م)یە وشەیەکی ترە، چونکە موزاف و ئیلەیهییە و ڕاناوە.

٢- بڕگە لە تەرازوودا بەپێی شوێن دەکێشرێ، بەوێنە (دارا) لە سەرەتای پێی ڕەجەزەوە دەکێشرێ بە(مستف - -) بەڵام لە کۆتایی (مفاعیلن)دا دەبێ بە(دارا - - = عیلن) و لە (فاعلاتن)دا دەبێ بە(لاتن - -) و لە (مفعولن)دا دەبێ بە(عولن - -) وە هەروەها، کەواتە لەم ڕووەوە کێشی بڕگە بگۆڕە، نەگۆڕ نییە.

٣- بڕگە لە کێشی پەنجەدا ئاوا دابەش دەکرێ، یا دیاری دەکرێ، کوردیێکی هەژاری وەک من دەڵێ (دە بڕگەیی):

بووم بەجـانەوەر قـەلاچۆم دەکەن

خوێنم دەڕێژن و لۆمەی خۆم دەکەن

<u>پێی یەکەم</u> <u>پێی دووەم</u>

بووم به جا نه وەر : قه لا چۆم ده کەن

- ب - ب - : ب - - ب -

١ ٢ ٣ ٤ ٥ : ١ ٢ ٣ ٤ ٥

- - - - - : - - - - -

١ ٢ ٣ ٤ ٥ : ٦ ٧ ٨ ٩ ١٠

<u>پێی سێیەم</u> : <u>پێی چوارەم</u>

خوێ نم ده ڕێژ ن و : لۆ مەی خۆم ده کەن

١١ ١٢ ١٣ ١٤ ١٥ : ١٦ ١٧ ١٨ ١٩ ٢٠

- - ب - - : - - - ب -

١ ٢ ٣ ٤ ٥ : ١ ٢ ٣ ٤ ٥

- - - - - : - - - - -

١ ٢ ٣ ٤ ٥ : ٦ ٧ ٨ ٩ ١٠

له کـێشی عـەرووزیشـدا ئاوا دابەش دەکرێ، ئەسـیـری -ڕەحـمـەتی خـودای لێ بێ- دەفەرمووێ (ڕەمەل):

گەر لە ڕێگەی دین و قەومت لەت لەتت کەن بتکوژن

ئەی (ئەسیری) نـــاوی چاکت تـا ئـەبەد زاهیر دەبێ

نیوەی یەکەم = صەدر

پێی یەکەم پێی دووەم : پێی سێیەم پێی چوارەم

گەر لە ڕێ گەی: دی نو قەو مت : لەت لە تت کەن: بت کوژ ن

- ب - - : - ب - - : - ب - - : - ب -

فا ع لا تن : فا ع لا تن: فا ع لا تن : فا ع لن

١ ٢ ٣ ٤ : ١ ٢ ٣ ٤ : ١ ٢ ٣ ٤ : ١ ٢ ٣

- - - - : - - - - : - - - - : - - -

١ ٢ ٣ ٤ : ٥ ٦ ٧ ٨ : ٩ ١٠ ١١ ١٢ : ١٣ ١٤ ١٥

نیوەی دوودم = عەجز

پێی یەکەم پێی دووەم : پێی سێیەم : پێی چوارەم

ئەی ئە سی ری : نا وی چا کت : تا ئە بەد زا : هیر دە بێ

- ب - - : - ب - - : - ب - - : - ب -

فا ع لا تن : فا ع لا تن : فا ع لا تن : فا ع لن

١ ٢ ٣ ٤ ١ ٢ ٣ ٤ ١ ٢ ٣ ٤ : ١ ٢ ٣

- - - - - - - - - - - - : - - -

١ ٢ ٣ ٤ ٥ ٦ ٧ ٨ : ٩ ١٠ ١١ ١٢ : ١٣ ١٤ ١٥

٤- بڕگەی کورتـو بڕگەی درێژ لە کوردیدا، لە پەخشـان و لە هۆنراوی کێشی پەنجەدا، باشتر دەردەکەون و ئاسان لە یەکتری جیا دەکرێنەوە، چونکە لە سروشت و زەمینەی خۆیان دوور نەکەوتوونەتەوە، لەناو شەپۆلە ئاواز و مۆسیقای وشەکانا، وەک ماسی و سۆنە مەلە و گـەمە دەکـەن، زنجیـرەیێ لەرەلەری جـوێ جـوێ، لە بەرزی و نزمی و درێـژی و کـورتیـدا، یەک لەدوا یەک، کـە بریتین لە پۆل پۆل بڕگـەگـەلی کـورت و درێژ، وەک چۆن لە شـەوا ئەستێرە بەرودوا دەڕژێنە دەم کەل، ئەوانیش ئاوا بەرە بەرە دەتکێنە ناو گوێچکەی گوێگر، جا لەبەر ئەوەی کە گوێی گوێگر، ئاشنایە بەو زنجیرە قەف قەف و پارچە پارچەکراوە و ئەو

کۆمەڵە دەنگانەیش نامۆ نین لە لای هەستی و بەردەوام دەیان بیستێ، لەبەر ئەوە زۆر بەئاسانی، زرە زری ئەڵقە ئەڵقەی ئەو زنجیرەیە دەناسێ و بەبێ قووڵکردنەوەی زۆر وەریان دەگرێ.

بەڵام زۆر وشەی ئاڵۆزی کوردی، کاتێ لە هۆنراوی عەرووزیدا بەکار دەهێنرێن، چونکە لە زەمینەی سروشتی خۆیان دوور دەکەونەوە، جاروبار لەبەر ناچاری، ژمارەی برگەکانیان کەم و زیاد دەکا، وە بەپێی پێویستیی کێشی پێیەکە برگەکانی کەم یا زیاد دەکرێ، وەک وشەگەلی (گیان، گیا، ژیان، خوان، شوان، دووان، سیان، نیان، خەڵک، چڵک، چڵم، کڵم، قڵپ، کفر، گێسک، خوێ، خوا، کوا، ئاسک، باسک، ناسک).

ئەم وشانە و وێنەیان بەیەک برگە دادەنرێن، وەلێ جاروبار لەبەر ناچاری بەدوو برگە گۆیان پێ دەکرێ. بەنموونە: گیان دەکرێ بە(گی یان = ب -) وە ژیان دەکەن بە(ژی یان) و کاروان دەکرێ بە(کەرەوان) یا بە(کارەوان) هەروا لە کێشی پەنجەدا دوو برگەیی دەکەن بەسێ برگە، یا یەک برگەیی دەکرێ بەدوو برگە (بڕ: ناچارییەکان/١٩).

بەڵام لە ڕێنووسا وەک کاتی ئاسایی دەنووسرێن، گەرچی کەمە کەمەیش وەک کاتی گۆ پێکردن دەنووسرێن وەک (جوان) بە(جەوان) دەنووسرێ، بەڵام لە ڕێنووسی کێشیدا چۆن گۆیان پێ دەکرێ ئاوا دەنووسرێن.

بەوێنە: وشەی (جوان) مەحوی لەم شیعرەدا دایناوە، بەیەک برگە (رەمەل):

جوان و شیرینە ئەگەر دنیـــــا لە ڕوودا میهرەبان

وەردی خارە، شەهدی زەهری مارە، عەهدی بێ ثەبات

گۆرانیش هەروا کە دەڵێ (دە برگەیی):

لە گەرووی شمشاڵ، لە تەلی کەمان

گەلێ هەڵساوە ئاوازەی جوان جـوان

بەڵام نالی لە چەن هۆنراوێکا دایناوە بەدوو برگە وەک: (هەزەجی ئەخرەبی مـەحذوفی موستەزاد):

ئەی تازە جەوان! پیرم و ئوفتادە و کەوتووم

تا ماوە حەیاتم

کەچی نالی (خـوان) و (خـوار) کـە دەق هاوکێـشی جـوانـن بەیەک برگـە داناوە، وەک

دەفەرمووێ (هەزەجی هەشتی):

چ میوانێکە؟ صاحیب جێ و وجاهـ و عیززەت و عەزمە

کە دوو عالەم طوفەیلی دەعوەتی و، ئەو صاحیبی خوانە

کە ئاوا لەت لەت دەکرێ:

کە دوو عالەم طوفە یلی دەع وەتیو ئەوصا حبی خوانە

مفا عیلن مفاعیلن مفاعیلن مفا عیلن

بڕوانە (٢٣٤ - القافیة/ چەند نموونەیێ لە هۆنراوی عەرەبی و کوردی ریدفدار/١٦)

٥- بڕگە لە ڕوانگەی تریشەوە دابەش دەکرێ، وەک:

آ- بڕگەی کراوە (مقطع مطلق) ئەوەیە کە بزوێنێکی کورت کۆتایی بێ، ئەمە لە کوردیدا یەک جۆری هەیە، وەک (کە، نە، گو، ڵە، کە، نی) کە بەهێمای ئەم چەماوەیە (ب) دیاری دەکرێ. بەڵام لە بڕگەی عەرووزیدا دوو جۆری هەیە، یەکەم وەک کوردییەکە بریتییە لە یەک پیتی بزواو لە کۆتایی وشەوە، دووەم: بریتییە لە سەبەبێکی قورس، وەک (مَعَ ن ن).

بۆیە پێی دەگوترێ کراوە، چونکە بڕگەکە دانەخراوە، مەودای ئەوەی ماوە کە هەستیار بزوێنەکەی دەستکاری بکا، وەک ئەوە درێژی بکاتەوە و بیکا بەبڕگەیەکی درێژ، یا لە بڕگەی عەرەبیدا بزوێنێ شایانی، بەپێی ڕێزمان پێ ببەخشێ. وەک: (أقولُ، لَنْ أقولَ).

ب- بڕگەی داخراو (مَقْطَع مُقَیَّد) ئەوەیە کە کۆتایی بێ، بەپیتی وەستاو، چ بزوێنی درێژ بێ، وەک: (ما، موو، با، بی، بۆ، بوو، سێ، سۆ، ڕێ، تێ). کە بەم خەتە (-) هێمای بۆ دادەنرێ، وە چی پیتی بێ دەنگ بێ، وەک: (سەر، گوڵ، بەرز، سام، لام، داو، ناو، شیو، پیو، وای، نای، جێی).

واتە: هەموو بڕگەیەکی درێژ بڕگەی داخراوە، وە هەموو بڕگەیەکی کورتیش کراوەیە، بڕگەی داخراو بۆیە وای پێ دەگوترێ، چونکە هەستیار ڕێگەی دەستکاری لێ داخراوە، مەودای ئەوەی نەماوە کە دەسکاری بزوێنی بڕگەکە بکا (بڕوانە: قافیەی موطڵەقە و موقەییەدە).

ج- هەندێ کەس بڕگە دابەش دەکەن بۆ سێ جۆر: کورت و ناوەنجی و درێژ. بەڵام قسەی ڕاستتر ئەوەیە بڕگە لە کوردیدا: کورت یا درێژە و بەس.

د- بڕگەی لەنگەردار و بڕگەی بێ لەنگەریش هەیە.

ﻫ- مەرج نییە بڕگە لە یەک وشەدا بێ، بەڵکو جاری وا هەیە دابەش دەبێ بەسەر چەند وشەیەکا.

٦- دوا تێبینی لەم ڕووەوە: (بڕگە - کە بریتییە لە دەنگێ، یا لە کۆمەڵە دەنگێ، کە بەبێ پچڕان، بەیەک هەناسە، لە دەم دێنە دەرەوە - کاتێ وایە و بەیەک بڕگە دادەنرێ، کە سەربەخۆ بێ و پیتەکانی لە ڕستە و دەستەواژەدا تێکەڵی پاش و پێشی خۆی نەبێ، دەنا چۆنێتی و سروشت و ژمارەی بڕگەکە ئاوا دەگۆڕێ:

آ- جاری وا دەبێ وشەی یەک بڕگەیی دەبێ بەدوو بڕگە، یا دوو بڕگەیی دەبێ بەسێ بڕگە، وە هەروەها، بەوێنە: خۆیش یەک بڕگەیە، بەڵام (خۆیشی) دوو بڕگەیە.

ب- جاری وا دەبێ بڕگەی کورت دەبێ بەبڕگەی درێژ، یا بڕگەی درێژ دەبێ بەبڕگەی کورت، یا بڕگەی درێژ جۆری (آ)ی دەبێ بەجۆری (ب) یا بەپێچەوانەوە، وە هەروەها.

زانینی ئەم دوو خاڵە بۆ هەستیار زۆر گرنگە، چونکە دەتوانێ لەم ڕێگەیەوە جۆرەها بڕگە و پێی جۆراوجۆر دروست بکا. وەک (مضارع):

ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هـــاتەوە

جەژنێکی کۆنی کوردە بەخۆشی و بەهاتەوە

(پیرەمێرد)

لەم هۆنراوەدا، لە بنەڕەتدا (ڕۆژ) و (ساڵ) و (کۆن) و (کورد) یەک بڕگە بوون، لە جۆری (ج) و (د)ی بڕگەی درێژ، بەڵام ڕۆژ و ساڵ و کۆن، بەهۆی پێتوە لکانی پێی إضافە لە (ڕۆژی) و لە (کۆنی)دا و پێی نیشانەی وەصف لە (ساڵی)دا، هەریەکەی بوون بەدوو بڕگەی درێژ، لە جۆری (آ) کوردیش بەهۆی پێتوە لکانی (ە)وە، بووە بەدوو بڕگە، کور، دە، یەکەمیان لە جۆری (ج) درێژ، دووەمیان بڕگەی کورتی کوردی لە جۆری (آ). هەروا (نەورۆزە) لە دوو بڕگەی درێژەوە بووە بەسێ بڕگە، دووانی درێژ و یەکێکی کورت... تاد.

دەبینین ئەم گۆڕانکارییانە لە بڕگەکاندا، بووە بەهۆی دروستبوونی کێشی هۆنراوەکە ئاوا:

ئەم، ڕۆ، ژی سا، ڵی، تا، زە یە، نەو، ڕۆ، زە ها، تە، وە

-، -، ن + فا، ع، لا، ت + م، فا، عی، لن + فا، ع، لن

مف، عو، ل - ب - ب ب، -، - -، ب، -

**(برگەی عەرەبی):**

برگە لە عەرەبیدا دوو جۆری هەیە: کورت و درێژ.

کورتەکەی یەک جۆرە: بریتییە لە پیتێکی بزواو، بەچەماوەیەکی ئاوا (ب) دیاری دەکرێ، وەک (لَ، كَ) لە (لَكَ)دا، یا وەک (حە، مە) لە (حەمە)دا، بەڵام برگەی درێژ لە عەرەبیشدا چەند جۆرێکی هەیە:

آ- پیتێکی بزواو و پیتێکی وەستاو، پیتە وەستاوەکە چ پیتی مەدد بێ، کە بەکوردی پێی دەگوترێ بزوێنی درێژ، وەک (لا، ما، لی، فی، ذو، فو) وە چ پیتێکی بێ دەنگ (صامیت) بێ، وەک (لَمْ، مِنْ، قُلْ، لَوْ، أيْ، كَيْ) ئەم جۆرەیان بەهەردوو شێوەکەوە یەکسانە بەیەکێ لەم کێشانە لە تەرازوودا (فا) یا (لا) یا (مُسْ) یا (تَفْ) یا (عی) یا (عو) یا (لُنْ) یا (تُنْ) وە ئەمانەیش یەکسانن بەسەبەبێکی سووک، کە نیشانەیەکی ئاوای بۆ دادەنرێ (-) یا بەسەرەتای وەتەدی بڵاو و کۆتای وەتەدی کۆ.

ب- دوو پیتی بێ دەنگ لەنێوانیانا دەنگدارێکی درێژ هەبێ، وەک: (تنوب، نار، نور) لە کاتی ئێستدا، یا لە کاتی تەذییل و تەسبیغدا، ئەمیش یەکسانە بەسەبەبێکی سووک، نەم هێمای بۆ دادەنرێ (-ْ) لە کاتی تەسبیغدا، وە یەکسانە بەبرگەی درێژی ئاخری وەتەدی کۆ لە کاتی تەذییلدا، وە هەمان نیشانەی بۆ دادەنرێ (-ْ).

**(برگەی عەرووزی):**

برگە لە دوو ڕەگەزی بنچینەیی پێک دێ، کە پێیان دەگوترێ: حەرەکات و سەکەنات، واتە: بزوێن و زەنە. لەپێشەوە بەدرێژی باسی ئەمانەمان کرد، ئێستایش دەڵێین: لە پیت و جووڵە و زەنە برگە بەگشت جۆرەکانییەوە دروست دەبێ، لە برگەیش پێ - واتە: تەفعیلە، بەهەموو جۆر و شێوەکانییەوە - دروست دەبێ، لە پێیش کێش دروست دەبێ، واتە: شیعر لەدایک دەبێ.

برگەی عەرووزی لەم سێ شتە دروست دەبێ:

یەکەم: سەبەب. دووەم: وەتەد. سێیەم: فاصیلە. هەر یەکێ لەم سێ شتەیش دوو جۆری هەیە، ئاوا: یەکەم: سەبەب، کە دوو جۆرە:

١- سەبەبی سووک (سەبەبی خەفیف) یەک برگەی درێژە (م) لە عەرەبیدا لە دوو پیت دروست دەبێ، یەکەمیان بزواوە، دووەمیان نەبزواوە، نەبزواوەکە وا دەبێ بزوێنی درێژە، وا

دەبێ پیتی بێ دەنگە، وەک: (فا، نا، ما، لا، مُسْ، تَفْ، عي، لُنْ، إنْ، لَمْ، قُلْ) بەڵام لە کوردیدا هەموو بڕگەیەکی درێژی کوردی دادەنرێ بەسەبەبی سووک، کە هێمایەکی ئاوای بۆ دادەنرێ (-). جاروباریش ئاوا: (-ْ، -ْْ).

٢- سەبەبی قورس (سەبەبی ثەقیل) لە دوو بڕگەی کورت کە لەتەنیشت یەکەوە بن دروست دەبێ. واتە: لە دوو پیتی بزواو، وەک (مَعَ، لك) لە عەرەبیدا وە (حەمە ب ب، پەلە ب ب، گلە ب ب، بقە ب ب، کخە ب ب، ببە ب ب، گوڵە ب ب). لە کوردیدا، واتە: دوو بڕگەی کورتی کوردی یەکسانە بەسەبەبێکی قورس بەبێ کەم و زیاد، ئیتر چ بڕگە کورتە کوردییەکە لە جۆری (آ)ی کوردی یا (ب)ی کوردی بێ.

دووەم: وەتەد، کە ئەمیش دوو جۆرە:

١- وەتەدی کۆ (وەتەدی مەجمووع) لە عەرەبیدا بریتییە لە سێ پیت، یەکەم و دووەمیان بزواون، سێیەمیان نەبزواوە، وەک: (عَلَی، لَکُمْ، سَرَی، جَرَی). بەڵام لە کوردیدا ئەم چەند جۆرەی هەیە:

آ- دەق وەک عەرەبییەکە، وەک: (سەرا، لەسەر، خودا، خوا، بەغا، سزا، تکا، گەنم، بزن، گیا، خوێ، گوێ...).

ب- کۆمەڵێ پیتە، یەکەم و دووەمیان بڕگەی کورتن، ئەوانی تریان پیتی بزوێنی درێژ و پیتی وەستاو و پیتی بێ دەنگن، وەک: (هەزار، شەبەنگ، خەدەنگ، جوان، گیان، بەڕاست...). واتە: بڕگەیەکی کورت + بڕگەیەکی درێژ، لە هەر جۆرێ بێ، یەکسانە بەوەتەدێکی کۆ کە نیشانەیەکی ئاوای بۆ دادەنرێ:

(ب -) جاروبار ئاوا (ب -ْ)، یا (ب - ْْ).

٢- وەتەدی بڵاو (وەتەدی مەفرووق) کە لە عەرەبیدا لە سێ پیت پێک دێ، یەکەم و سێیەمیان جووڵەدارن، پیتی ناوەڕاستیان نەبزواوە، وەک: (قَالَ، قِیلَ، حَیْثُ، قَبْلُ، بَعْدُ، أَیْنَ) بەم نیشانەیە دیاری دەکرێ (- ب ×) بەڵام لە کوردیدا بریتییە لە دوو بڕگە، یەکەمیان بڕگەی درێژ لە هەر جۆرێ بێ، دووەمیان بڕگەی کورت، لە هەر جۆرێ بێ، وەک: (پەردە، پارە، بێنە، بارگە، کۆیلە، شۆربە، ڕێچکە، خوێنە). نیشانەکەی ئاوایە: (- ب، -ْ ب، -ْْ ب).

سێیەم: فاصیلە، کە ئەمیش دیسان دوو جۆرە:

١- فاصیلەی بچووک (فاسیلەی صوغرا) لە سێ پیتی بزواو و پیتێکی وەستاو

دروست دەبێ، واتە: دوو بڕگەی کورت + بڕگەیەکی درێژ یەکسانە بەفاسیلەی بچووک، وەک (سَکَنُوا، مُتَفَا، لَعِبَتْ= ب ب -) لە عەرەبیدا و (حەمەڕەش، هەرەوەز، کەرەمار، بەرەڵا، سەگەناز، دەڵەدێو، حەمەلاو) لە کوردیدا.

٢- فاسیلەی گەورە (فاصیلەی کوبرێ) چوار بڕگەیە، یەکەم و دووەم و سێیەمیان کورتن و چوارەمیان درێژە، وەک: (شَجَرَةٌ، عَلَمَتا، نَصَرَهُمْ) لە عەرەبیدا و (دەمەوەری، هەرەوەزی، کەمەرەشل، دەرەبەگی، بەدە هەزار، بەرەکەوا) لە کوردیدا.

(چەند تێبینییەک):

١- وەک ڕەچاو دەکرێ فاسیلەی بچووک بریتییە لە سەبەبێکی قورس و سەبەبێکی سووک، فاسیلەی کوبرایش بریتییە لە سەبەبێکی قورس و وەتەدێکی کۆ.

٢- مەرج نییە کە بڕگە یا سەبەب، یا وەتەد، یا فاسیلە، یەک وشەی سەربەخۆ بێ، بەڵکو دروستە دابەش بێن بەسەر چەند بێژەیەکا، وەک لە نموونەکانی دواوە ئەمە دەردەکەوێ.

٣- ژمارەی ئەو پێیانەی کە دەبن بەپارچەکانی تەرازووی کێشانی شیعر دەپێن کە ئەمانەن: ١- فعولن ٢- مَفاعیلن ٣- مفاعلتن ٤- فاع لاتن ٥- فاعلن ٦- مستفعلن ٧- متفاعِلُنْ ٨- مَفْعُولاتُ ٩- فاعِلاتُن ١٠- مستفع لُنْ (بڕوانە: أصول الأفاعِيل).

٤- سەبەبی سووک و سەبەبی قورس و وەتەدی کۆ و وەتەدی بڵاو و فاسیلەی بچووک و فاسیلەی گەورە بەڕیز لەم ڕستە عەرەبییەدا کۆ دەبنەوە:

| سەبەبی سووک | سەبەبی قورس | وەتەدی کۆ | وەتەدی بڵاو | فاسیلەی بچووک | فاسیلەی گەورە |
|---|---|---|---|---|---|
| لَمْ | أَرَ | عَلَیَ | ظَهْرِ | جَبَلِنْ | سَمَکَتَنْ |

٥- هەموو ئەو پیتانەی کە دە پێکەیان لێ دروست دەبێ لەم ڕستەیەدا کۆبوونەتەوە: (لَمعَتْ سُیُوفُنَا).

٦- لە شیعری عەرەبیدا قەت لە چوار پیتی جووڵەدار زیاتر بەشوێن یەکا نایەن، ئەگەر بەڕواڵەت لە هۆنراوێکا، شتێ وا ڕوویدا، ئەوە لەنێوانا پیتێکی بێ جووڵە (ساکن) هەیە، دەنگدارێکی درێژە، بەپێی شوێن و ڕێنووسی ئاسایی نەنووسراوە لە خەتدا، وەک لەم هۆنراوەدا پێنج پیتی بزواو لە شوێن یەک دێن، بەڵام بزوێنێکی درێژ لە

نێوانیاندا هەیە لە خەتا نەنووسراوە، گەرچی لە خەتی عەرووزیدا لە کاتی کەرتکردندا دەنووسرێ (کامل):

لَمَّا ظَفِرْ (تُ بِهِ عَلَی) حَرَمِ الهُدَی

لاِبْنِ البَتُولِ وَلِلصَّلاَةِ وَهَبْتُهُ

چونکە لێرەدا هێی (بە) درێژ دەکرێتەوە، تا دەبێ بە(بِهِي) ئەو کاتەیش ئەم یاسایەی پێ هەڵناوەشێتەوە (بڕ: ناچارییەکان/ ١١/١٩).

٧- لە چەند سەروایەکی تایبەتدا نەبێ، کە لە باسی سەروادا بەباشی باس کراوە، لە هۆنراوی عەرەبیدا دوو پیتی وەستاو کۆ نابنەوە (بڕ: بڕگەی عەرەبی/ب)

٨- لێرەدا بەشێوەیەکی گشتی دووپاتی دەکەینەوە، کە پیتی وەستاو، لە بڕگەی کوردی و لە سەبەبی سووک و لە وەتەدی کۆ و وەتەدی بڵاو و لە فاسیلەی بچووک و لە فاسیلەی گەورەدا، لە هۆنراوی کوردیدا مەرج نییە یەک پیت بێ، وەک لەم نموونانەدا بەدەردەکەوێ.

٩- لە هۆنراوی عەرووزی کوردیشدا، لە چوار پیتی جووڵەدار زیاتر بەدوا یەکا نایەن، ئەگەر هەیشبێ بەدیمەنە، نەوەک بەڕاستی، بەڵام لە دوو زەنەدار زیاتر، لە سەروا و ضەرب و ناواخنی شیعری کوردیدا، لە شوێن یەکتر دێن، وەک: (ڕاست، بیست، خوێن).

١٠- ئێستا ڕاهێنانێ دەنووسین، هەتا لەم بوارەدا ببێ بەسەرمەشقی جوان، چونکە هیچ شتێ وەک نموونەی زیندوو، نابێ بەهۆکاری حاڵیبوون لە بابەتەکانی زانست، هەر لەبەر ئەمەیە کە هەموو پەڕاوە فێرکارییەکان پڕن لە نموونەی جوان. جا بەپشتیوانی خودا دەڵێین:

## (کێشی بڕگەیی)

### (کێشی دە بڕگەیی: «دە پەنجەیی» وەک نموونەیێ):

ئەم کێشە لە هۆنراوی کوردیدا زۆر باوە، لە کۆن و نوێدا شاعیران هۆنراویان بەم کێشە وتووە، مەولەوی و وەلی دێوانە و گۆران و کامەران و هەستیارانی تریش ئەم کێشەیان بەکار هێناوە، هەیە سەرجەمی هۆنراوەکانی بەم کێشەیە، ئەم کێشە لە ڕاستیدا بیست بڕگەییە، هەروا کێشە بڕگەییەکانی تریش، بەکێشی نیوەی دێڕێکیانەوە ناویان

دەرکردووە، بەوێنە: کێشی هەشت بڕگەیی دەبوو ناوی شازدە بڕگەیی بووایە، بەڵام لەبەر ئەوەی بەژمارەی بڕگەکانی لەتە دێڕەوە ناودارن قەیناکا.

**یاسا سەرەکییەکانی ئەم کێشە:**

١- چوار پێیە، هەر نیوەی دوو پێیە، پێویستە بڕگەی پێیەکان بەژمارە بەقەد یەک بن.

٢- هەر پێیەی پێنج بڕگەیە کە سەرجەمیان دەکاتە بیست بڕگە.

٣- لەدوا هەموو پێیەکەوە جێگەی پشوودانە، یا جێگەی نەبرە و قورسکردنە.

٤- زۆربەی هۆنراو بەم کێشە و هەموو کێشە بڕگەیییەکانی تریش جووت سەروان و مثنوین، بەڵام هەیشە لەسەر شێوەی چامە وایە، یەکێتیی سەروا لە هەموو هەڵبەستەکانی بابەتەکەدا پارێزراوە، یا ناو بەناو سەرواکە گۆڕاوە، بەڵام هەموو پارچەیەکی هۆنراوەکە لە ژمارەی بەیتی چامە، کەمتر نییە، وەک دیلان - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - لە شینی شێخ مەحموودی یاد نەمردا، دەڵێ (دە بڕگەیی):

پایز... خەزانی تەماوی و مەنگە    گەڵا، لق و پۆپ، خونچە، بەزەنگە

ئینجا لەسەر ئەم سەروایە دەڕوا تا دەگاتە دوازدە دێڕ، ئاوا: (زەنگە، شەنگە، ئاهەنگە، لاسەنگە، جەنگە، نەنگە، دەنگە، زەبەنگە، تەنگە، پەنگە، بەنگە، زەنگە، هەنگە) ئینجا ئاوا: (کێوانە، هەورامانە) تا چوارده دێڕ، ئینجا ئاوا: (تاڵە، داڵە، باڵە، زاڵە،...) هەتا دە دێڕ، ئینجا ئاوا: (ڕێزانت، خەزانت...) هەتا سیازدە دێڕ، ئیتر چامەکە دێتە کۆتایی.

٥- مەرج نییە لە کێشی پەنجەدا ژمارەی بڕگەی کورت و درێژ لە پێیەکاندا بەقەد یەک بن، یا بەرابەر بن، وا دەبێ پێی یەکەم لە دێڕدا پێک دێ لە سێ بڕگەی کورت و دووانی درێژ، بەڵام پێی دووەم، یا سێیەم، یا چوارەم پێک دێ لە دوو بڕگەی کورت و سیانی درێژ، یا بەپێچەوانەوە. هەروەک مەرج نییە کە بڕگە کورتەکان و بڕگە درێژەکان لە یەک جۆر بن، هەروەک مەرج نییە دێڕەکانی چامەکە، یا غەزەلەکە، یا پارچە هۆنراوەکە، لە ژمارەی بڕگەی کورت و درێژدا بەقەد یەک بن، یا لە جۆری بڕگەدا بەقەد یەک بن، وەک لە زۆربەی هۆنراوی عەرووزیدا وایە.

٦- هەندێ هۆنراوی کێشی بڕگەیی بێ سەروا پەیدا بوون، شتی وا لە گۆرانیدا، کە لەگەڵ مۆسیقادا دەبێژرێ، لە شیعر دەکا، چونکە هەر هیچ نەبێ بڕگەکانی مۆسیقاکە جۆرە کێشێ دروست دەکا.

٧- بۆیە کێشی برگەیی کێشی پەنجەیشی پێ دەگوترێ، چونکە برگەکانی بەئاسانی بەپەنجە دەژمێردرێ، پێشی دەگوترێ کێشی هیجا و کێشی ژمارەیی.

با ئەم شیعرەی مەولەوی کێشانە بکەین و ئەم خالآنەی سەرەوەی تیا ڕەچاو بکەین:

سەر لە تەرەی خەم، خول ئاوردەوە

تای کرژی مەینەت دووباد کردەوە

نیوە دێڕی یەکەم = صەدر

| پێ ی یەکەم<br>خانەکانی برگەکان | | | | | خانەی پشوو | پێ ی دوەم<br>خانەکانی برگەکان | | | | | خانەی پشوو |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سەر | لە | تە | رەی | خەم | نیشتن = وەستان | خول | ئا | ور | دە | وە | نیشتن = وەستان |
| – | ب | ب | – | – | | – | – | – | ب | ب | |
| ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | |
| ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ | |
| درێژ | کورت | کورت | درێژ | درێژ | | درێژ | درێژ | درێژ | کورت | کورت | |
| ب | آ | آ | ب | ب | | ب | ب | ب | آ | آ | |

نیوە دێڕی یەکەم = عەجز

| پێ ی سێیەم<br>خانەکانی برگەکان | | | | | خانەی پشوو | پێ ی چوارەم<br>خانەکانی برگەکان | | | | | خانەی پشوو |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| تای | کر | ژی | مەی | نەت | نیشتن | دوو | باد | کر | دە | وە | نیشتن |
| – | – | – | – | – | | – | – | – | ب | ب | |
| ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | |
| ١١ | ١٢ | ١٣ | ١٤ | ١٥ | | ١٦ | ١٧ | ١٨ | ١٩ | ٢٠ | |
| درێژ | درێژ | درێژ | درێژ | درێژ | | درێژ | درێژ | درێژ | کورت | کورت | |
| ج | ب | آ | ب | ب | | آ | ج | ب | آ | آ | |

کاتێ ئەم خشتەیە شی دەکەینەوە و بەوردی سەرنجی دەدەین، دەبینین:

دێڕەکە دوو نیوەیە، هەر نیوەی دوو پێیە، کە سەرجەمیان دەکەنە چوار پێ، هەر پێیەی پێنج بڕگەیە، بڕگەکان وەک یەک نین، هەیانە درێژە، هەیانە کورتە، هەتا جۆری کورتی و درێژییەکەیان جیاجیان، دێڕەکە هاوسەروایە، بەئاسانی دەتوانرێ بڕگەکانی بەپەنجە بژمێررێ. دوا بڕگە بەڕیز لە پێکانا ئەمانەن: (خەم + وە + نەت + وە) هەر چواریان دابڕاون لەپاش خۆیان و دەتوانرێ بەئاسانی ئێستیان لەسەر بکرێ.

نالی - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - دەفەرمووێ (موضاریعی مەکفووفی ئەخرەب):

عەرشی بەرین کە دائیرەیە، ڕەوضە مەرکەزە

فەرشی زەمین بەعەرصەیی طەیبە موجەوهەرە

طەیبەکە یەعنی طەییب و طاهیر بەڕەوحی ڕۆح

فەرقی (ئەڵێن: گڵی) لە گوڵ، ئاوی لە کەوثەرە

دەستم لە گەردەنی خۆت هەڵمەگرە ئەی (حبیبە!)

وەبزانە (خوێنی خۆمە) یا مینەتی ڕەقیبە

مەحوی - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - دەفەرمووێ (هەزەجی هەشتی):

حەذەر لەم حەشری بێ وادەی لە قەبر هەڵساندنی مردوو

بەسەر قەبری شەهیدانا بەشۆخی لنگ ئەدا مەرکەب

دەبێ بزانین کە کێشی شیعرەکانی نالی ئاوایە:

مَفْعُول - - ب + فاعِلاَتُنْ + مَفَاعِیلُ + فَاعِلُنْ × ٢، دەبێ ئەوەیش بزانین کە (فَاعِ لاَتُنْ) لە موضاریعدا بریتییە لە (فاعِ = وەتەدی بڵاو) + (لاَتُنْ = دوو سەبەبی سووک).

وە (مَفَاعیلن = ب - - - = وەتەدی کۆ + دوو سەبەبی سووک).

جا کە ئەمەمان زانی دەزانین کە:

١- (ڕینکە - ب = فاع = وەتەدی بڵاو) کە بریتییە لە دوو بڕگە، یەکەمیان درێژە لە جۆری کوردی/ج، دووەمیان کورتە لە جۆری - آ -ی کوردی.

٢- (ڵێن گ - ب = فاع = وەتەدی بڵاو) دوو بڕگەیە، یەکەمیان درێژی کوردی لە جۆری/ج، دووەمیان کورتی کوردی لە جۆری/ب.

٣- (خوێنی - ب = فاع = وەتەدی بڵاو) دوو بڕگەیە، یەکەمیان درێژی کوردییە لە جۆری/ج، دووەمیان کورتی کوردییە لە جۆری/آ.

شیعرەکەی مەحویش کەرت کەرت دەکەین، تا جۆری بڕگەکانی دەرکەون و جۆری سەبەب و وەتەدەکانیشی بزانین ئاوا:

حە ذەر لەم حەش: ری بێ وا دەی: لە قەبڕْ هەڵ سان: د نی مر دوو

ب – – – : ب – – –: ب –ْ – –ْ : ب – – –

مفا عیلن : مفا عیلن : مفا عیلن : مفا عیلن

بە سەر قەب ری: شە هی دا نا : بە شۆ خی لنگ: ئە دا مەر کەب

ب – – – : ب – – – : ب – – –ْ : ب – – –

مفا عیلن : مفا عیلن : مفا عیلن : مفا عیلن

ئەوەتا لەم شیعرەی مەحویدا کۆمەڵێ وەتەدی کۆمەڵ و سەبەبی سووک هەیە، لەم شتەیەدا ڕوون دەبنەوە:

| پ / ١ | | | پ / ٢ | | | پ / ٣ | | | پ / ٤ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| وەتەدی | سەبەبی | سەبەبی | وەتەدی | سەبەبی | سەبەبی | وەتەدی | سەبەبی | سەبەبی | وەتەدی | سەبەبی | سەبەبی |
| کۆ | سووک | سووک | کۆ | سووک | سووک | کۆ | سووک | سووک | کۆ | سووک | سووک |
| حەذەر | لەم | حەش | ڕێی | وا | دەی | لەقەبر | هەل | سان | دنی | مر | دوو |
| بەسەر | قەب | ری | شەهی | دا | نا | بەشۆ | خی | لنگ | ئەدا | مەر | کەب |

لەم هۆنراوەیەدا وەتەد و سەبەبەکان لە جۆری ئاسایی عەرەبین، تەنیا ئەمانەیان نەبێ:

١- پێی سێیەم (لَة قَـتبْرْ هَةلْسَانْ = لَة قَـتبْرْ + هَتلْ + سَانْ = مَفَاعـِيلُنْ = ب –ْ، –، –ْ = وەتەدی کۆی کوردی جۆری/ب + سەبەبی سووکی جۆری/آ + سەبەبی سووکی کوردی جۆری/ –ْ).

٢- پێی چوارەم (دنی مردوو = دنِی + مَرْ + دُوْ = مَفَاعـيلن = ب – – – = وەتەدی کۆی کوردی جۆری/ ب – + سەبەبی سووک + سەبەبی سووک).

٣- پێی حەوتەم (بەشۆخی لنگ = بەشۆ + خی + لنگ = مَفَاعـيلُنْ = ب – – –ْ = وەتەدی کۆ + سەبەبی سووک + سەبەبی سووک جۆری کوردی/ –ْ).

## بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيم

(پێناسەیەکی پوخت بۆ زۆربەی زاراو و یاسا و ڕێسا عەرووزی و کێشییەکان، بەپێی ڕیزی ئەلفوبێ بەپێی حاڵ).

## یەکەم: (پیتی ئەلف) أ = ا

### ١- (الأبجديَّة)

پێشەکی: ئەمە خشتەی حیسابی ئەبجەدییە، کە پێشی دەگوترێ: حیسابی جومەل، یا ژمارەی جومەل:

آ- (خشتەی حیسابی جومەل):

| ا | ١ | ح | ٨ | س | ٦٠ | وەتەدی | سەبەبی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ب | ٢ | ط | ٩ | ع | ٧٠ | کۆ | سووک |
| ج | ٣ | ی | ١٠ | ف | ٨٠ | حەذەر | لەم |
| د | ٤ | ک | ٢٠ | ص | ٩٠ | بەسەر | قەب |
| ه | ٥ | ل | ٣٠ | ق | ١٠٠ | کۆ | سووک |
| و | ٦ | م | ٤٠ | ر | ٢٠٠ | حەذەر | لەم |
| ز | ٧ | ن | ٥٠ | ش | ٣٠٠ | بەسەر | قەب |

ئەم خشتەیە بەم شێوەیەیش دەنووسرێ و لەبەر دەکرێ:

١- أبْجَدْ ٢- هَوَّز ٣- حُطِّي ٤- كَلَمَنْ ٥- سَعَفَصْ ٦- قَرَشَتْ ٧- ثَخَّذْ ٨- ضَظَغْ.

یاسای زانین و لەبەرکردن و حەلکردنی ئەم خشتەیە ئەمەیە:

١- لەپێشدا پیتەکانی ئەلفوبێی عەرەبی، کە بیست و هەشت پیتن، لەناو خشتەیەکا، بەپێی ڕیزی پیتەکانی (أبْجَدْ، هَوَّز) دەنووسرێن، وەک لە خشتەکەدا نووسراون.

٢- ئینجا لە یەکەم پیتی یەکەم وشەوە، کە بەپێی خشتەکە ئەلفە، دەست دەکەین بەدانانی ژمارە و (١) بەرامبەر بەئەلف دادەنێین، ئینجا یەک یەک زیاد دەکەین و هەموو ژمارەیەکی تازە بەرامبەر پیتەکانی دواتر بەڕیز دادەنێین، تا دەگاتە (١٠) ئاوا:

أ = ١، ب = ٢، ج = ٣، د = ٤، ه = ٥، و = ٦، ز = ٧، ح = ٨، ط = ٩، ی =

۱۰، کاتێ بوو بە(۱۰) ئەوجا دە دە زیاد دەکەین، تا دەگاتە (۱۰۰) ئاوا:

ک = ۲۰، ل = ۳۰، م = ٤۰، ن = ٥۰، س = ٦۰، ع = ۷۰، ف = ۸۰، ص = ۹۰، ق = ۱۰۰، کاتێ بوو بە(۱۰۰) ئەوجا سەد سەد زیاد دەکەین، تا دەگاتە (۱۰۰۰) ئاوا:

ڕ = ۲۰۰، ش = ۳۰۰، ت = ٤۰۰، ث = ٥۰۰، خ = ٦۰۰، ذ = ۷۰۰، ض = ۸۰۰، ظ = ۹۰۰، غ = ۱۰۰۰

۳- ئەم حیسابی جومەلە بەزۆر شێوە لە کۆنەوە بەکارهێنراوە، وەک جومەلی صەغیر و جومەلی کەبیر. بەڵام لە هەموویان ناسراوتر ئەمەیە کە لەپێشەوە نووسرا، کە زانایان و هەستیاران و مفسران و مێژوونووسان و وەفقزانان لەسەر ئاستی جیهانی لە کۆن و نوێدا بەکاریان هێناوە، تەنانەت ئەمڕۆ جفرە و بروسکە و نامەی نهێنی پێ دەنووسرێ. بەوێنە: دەتوانین جەغزێکی بیست و هەشت پیتی بکێشین و بیست و هەشت پیتەکانی تیادا بنووسین و لە هەر خاڵێکی ناو خشتەکەوە بمانەوێ بەژمارەیێ دەست پێ بکەین، یا بەپیتێ تر ئاوا:



جا بەچەند جۆرێ هەستیاران بەهرەیان لەم بابەتە وەرگرتووە، هەندێ هاتوون بەریز بەژمارەی پیتەکانی ئەلف و بێ پارچە هۆنراو و چامەی داناوە، وەک دیوانی نالی و مەحوی و... تاد. هەندێ تر بەریز پیتەکانی ئەلف و بێی، بەچەند شێوەیەکی هونەری بەکارهێناوە، وەک (لُزُومُ مَالاَ يَلْزَمُ)ی موعەرری، ئیبنو عەرەبی چەن چامەیەکی هەیە، سەرەتای یەکەم وشە و کۆتایی دوا وشەی هەموو بەیتێکی بەریز یەکێکە لە پیتەکانی ئەلف و بێ، کە بەم هونەرە شیعرییە دەگوترێ (روضة: باخچە) وەک دەفەرمووێ - ڕەحمەتی خودای لێ بێ -:

(ا) أُنْظُرْ إلىَ الحَقِّ مِنْ مَدلُولِ أسْمَاءِ
وكَونُه عَيْنُ كُلِّي عَيْنُ أجْزَائي (بەسیط)

(ب) بِالَّذي قُلْت إنَّهُ عَيْنُ مَا بِي
مِنْ سُؤالٍ ومَنْطِقٍ وَجَوَابِ (خفیف)

(ت) تَوَلَّيْتُ عَنْهَا طَاعَةً حَيْثُ مَلَّت
فَيَا لَيْتَ شِعْري بَعْدَنَا هَلْ تَوَلَّت (طەویل)

(ث) ثَلاثَةُ أسْمَاءٍ تَكَوَّنَ بَيْنَهَا
عَلى مَا تَرَاهُ العَيْنُ شَكْلٌ مُثَلَّث (طەویل)

(ج) جَمِيلٌ وَلاَ يَهْوى جَليٌّ وَلاَ يُرى
لَقَدْ حَارَ فيهِ صَاحِبُ الفِكْرِ وَالحُجَج (طەویل)

(ح) حَمْدُ الإلٰه يُقَدِّسُ الأرْوَاحَا
باللاَّمِ لاَ بِالبَاءِ وَالأشْبَاحَا

(خ) خَبيرٌ بِمَا أبْدَى عَليمٌ بِمَا أُخْفي
عَليٌّ مِنَ التَّفْريغِ مِنْ كَرَمِ السَّخِّ (طەویل)

(د) دَنَا وَتَدَلَّى عَبْدُ رَبٍ وَرَبُّهُ
فَلَمَّا الْتَقَيْنَا لَمْ أجِدْ غَيْرَ وَاحِدِ (طەویل)

(ذ) ذلِكَ وَجودكَ لاَ تَكُنْ ذا عِزَّةٍ
حَتَّى تُصَيِّرَ نَشْأتَيْكَ جُذَاذَا (کامل)

(ر) رميت بأمرٍ لَمْ يعقل مثله
بِمَا أنَا عَلاَّمٌ بِهِ أنَا حَائِرُ

(ز) زهـرة فـي فَـلَـكٍ سـابِحَـة
مَـنْ يَرَاهَا هَامَ فِـيـهَـا ثُـمَّ جَـاز (رمـل)
(س) سَـلاَمُ عَلى قَـومٍ تَبَـاهُوا بِرَبِّهِمْ
عَلَى كُلِّ مَوْجُودٍ مِنَ الجِنِّ وَالإِنْس (طەویل)

خۆزگا هەستیارانی کوردیش لەم جۆرە بوارەدا ئەسپی شیعریان تاو دەدا. هەروەها: (ش، ص، ض، ط، ظ، ع، غ، ف، ... تادوایی).

ب- حیسابی ئەبجەدیش ئەوەیە کە شاعیر بەژمارەی پیتێ، یا کۆمەڵێ پیت، یا بەرستەیێ لە شیعرا، مێژووی رووداوێ، یا مەبەستێ، یا ژمارەی شتێ تۆمار دەکا، چونکە لەسەر ئەم شێوەیە مەبەستەکە لە دڵا باشتر دەچەسپێ، سەرەڕای ئەوەیش کە زۆرترین شیعرە کە - بێجگە لە مێژووەکە، یا ژمارەی شتەکە - مەبەستێکی بەرزی ئەدەبی تریشی هەیە، وەک تەفائول بەخێر، یا باسی فەزڵی خاوەن باسەکە، یا نزای باش بۆی. وەک (رەجەز):

بِكَهْفِ مَـرْيَمَ العُـلاَ (يُحِـيطُ)
بِالفِكْرِ سَـبْـرَ غَـوْرِهِ تُمِـيطُ!

لەم شیعرەدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە سورەتی کەهف، لە قورئاندا یەکسەر وا لەپێش سورەتی مەریەمەوە، ژمارەی سورەتی کەهف دەکاتە نیوەی وشەی (یحیط) کە (یح = ١٨) وە ژمارەی سورەتی مەریەمیش دەکاتە ئەو نیوەی (یحیط) کە (یط = ١٩). لە هەمان کاتدا شیعرەکە مەدحێکی جوانی حەزرەتی مەریەمی وا تیادا، کە لە کەهفە (میحرابە)کەیدا لەوپەڕی سەربەرزی و پایە بەرزیدا بووە!

بگرە زۆر کەس لە سەرەتاوە وا بۆی دەچێ کە ئەم شیعرە بەس باسی مەردی و سەربەرزی مەریەم دەکا و هیچی تر، سڵاو و دروودی خوای لەسەر بێ.

وەک لە خشتەکەدا دەردەکەوێ، هەموو پیتێ هێمای ژمارەیەکی تایبەتە، لە یەکەوە کە ئەلفە، هەتا هەزار کە غەینە، جا چی ژمارەیەکت دەوێ، بچووک یا گەورە دەتوانی بەپیتەکانی ئەبجەدی بینووسی، یا بگاتە چەندین ملیۆنیش.

ئەمەیش شتێکی کۆنی دێرینە، لە عەرەبی و فارسی و تورکی و ئینگلیزیدا هەیە، هەروا لە زۆربەی زمانەکانی تریشدا ئەمە هەیە، وەک فەینەقی و ئۆغارتی و ئەمهەری و عیبری و هیندی و چینی، وا دەردەکەوێ کە ئەمە پاشماوەی بەکارهێنانی زانستی پیتەکان (علم

الحروف) بێ، کە لە کۆن کۆنەوە بۆ نووشتە و جادوو و حیسابگەری و ئەستێرەگەری و زانستی وەفق بەکار هێنراوە، لە سەرەتای سورەتی بەقەرەوە ڕاڤەنووسەکان قسە لەوە دەکەن کە جوولەکەکان لەگەڵ پێغەمبەردا بەحسێبی ئەبجەد شتیان حسێب کردووە و (الم)یان داناوە بە(٧١).

**تێبینی:** لێرەدا چەند خاڵێ گرنگ ڕوون دەکەینەوە:

آ- ژمارەکردن بەحسێبی جومەل، مەرج نییە کە پیتەکان بەپێی خانەی یەکان و دەیان و سەدان و... تاد ڕیز بکرێن، وەک لە خودی ژمارەدا ئەمە مەرجە، هەروەها مەرج نییە کە ژمارە بەیەک پیتی تایبەت ئەدا بکرێ. بۆ نموونە: وشەی (محمد) بەحیسابی جومەل دەکاتە (٩٢) بەڵام (٩٢) دروستە بکاتە (صب) یا (بص) یا (بمن) یا (منب) یا (إنّما) یا (محمد) یا (الله وبروح)... تاد.

ب- ئەم حسێبی جومەلە لە غەیری شیعریشدا بەکار دەهێنرێ.

ج- لە کوردیدا و لە هەندێ زمانی تردا، پیتەکان لە بیست و هەشت پیت پترن یا کەمترن، لەبەر ئەوە ژمارە بەرابەر بەچەند پیتێ دانەنراوە. لە کوردی و زمانی وێنەی کوردیدا، کە بەئەلفوبێی عەرەبی دەنووسرێن، ئەم کێشەیە ئاوا دەکرێتەوە: ژمارەی نزیکترین پیت لە شێوەی نووسین و نوطق پێکردندا دەدرێ بەپیتی هاوشێوەی بێ ژمارەی، وەک:

(پ = ب = ٢، چ = ج = ٣، ژ = ز = ٧، ڤ = ف = ٨٠، گ = ک = ٢٠).

د- پیتی قەڵەو و پیتی لەڕ، وەک لامی قەڵەو و لامی لەڕ، یا ڕێی گەورە و ڕێی بچووک، یا واوی گوشراو و واوی کراوە، هەروا یێ بەهەموو جۆرەکانیەوە، هەریەکەیان بەیەک ژمارە دادەنرێ، جیاوازی لەنێوانی قەڵەو و لەڕ و گەورە و بچووک و گوشراو و کراوەدا نییە. واتە: هەموو لامێ قەڵەو بێ یا لەڕ دەکاتە (٣٠)، هەروەها ڕێ گەورە بێ یا بچووک دەکاتە (٢٠٠). ئەم جۆرە واوانە هەریەکەیان دەکەنە (٦): (ۆ، و). تەنها تێی خڕی تەئنیث، کە نیشانەی مێیە لە ناودا، لەم یاسایە بەدەرە، لەدواوە باسی دەکەین، هەموو (آل)ێ، شەمسی بێ یا قەمەری دەکاتە (٣١).

ه- بۆ نرخی ژمارەیی گشت پیتێ، تەماشای ڕێنووسی زمانەکە دەکەین، نەوەک گۆپێکردنی، مەبەست بەڕێنووس لە کوردیدا، کە هێشتا ڕێنووسەکەی بەتەواوی نەمەییوە، ئەو شێوە نووسینەیە، کە شاعیر لە سەردەمی خۆیدا شیعرەکەی پێ نووسیوە،

کەواتە ئەلفی مەقصوورەی (حُبْلی) و یێی (عیسی) و (موسی) و (یحیی) لە عەرەبیدا هەموو کاتێ هەر بەیێ دەنووسرێن، لەبەر ئەوە نرخە ژمارەییەکەی هەمیشە دەیە، یەک نییە، بەڵام دروستە بەپێی سەردەمی شاعیر لە کوردیدا، بەدوو جۆر بنووسرێن، بەئەلفیش و بەیێیش ئاوا (حوبلا) و (عیسا، موسا، یەحیا) ئەو کاتە شاعیر بەچی نووسی نرخی ئەوەی بۆ دادەنرێ، ئەگەر نووسی (عیسی = ٧٠ + ١٠ + ٦٠ + ١٠ = ١٥٠) وە ئەگەر نووسی (عیسا = ٧٠ + ١٠ + ٦٠ + ١ = ١٤١) ئەوانی تریش هەروەها، هەروەک (آ) بەدوو ئەلف دادەنرێ وەک (آل = ٣٢).

و- هەر پیتێ لە خەتا هەبێ، تەنانەت ئەگەر پیتی بزوێنی کورتیش بێ، ژمارەی بۆ دادەنرێ، با لە گۆپێکردن و خەتی عەرووزیشدا نەبێ (بڕوانە: نووسینی عەرووزی کە لەم کتێبەدا لەپێشەوە ڕابوورد) بەوێنە: (شەوقی = ٣٠٠ + ٥ + ١٠٠ + ١٠ = ٤١٥) بەڵام ئەگەر شاعیر خۆی پیتەکەی نەنووسیبوو ژمارەی بۆ دانانرێ، بەوێنە: (شوقی = ٣٠٠ + ٦ + ١٠٠ + ١٠ = ٤١٦).

ز- تیی خڕی تەئنیث لە کاتی وەصلدا بە(٤٠٠) دادەنرێ، هەروا لە کاتی ئیستیشدا، بەڵام جاروبار بۆ ناچاری لە کاتی لەسەر ڕاوەستانا، دروستە حسێبی هێی بۆ بکرێ، بەپێنج دابنرێ، بەڵام بەمەرجێ بەهێی خڕی بێ نوختە بنووسرێ، وەک (سنه = ١١٥) بەڵام ئەگەر (طلحة) کرا بە(طلحَتْ) هەر نرخی ژمارەی تێی بۆ دادەنرێ. ئەوەتا لەم دوو نموونانەدا جارێ بەپێنج و جارێ بەچوار سەد دانراوە، لە (الجنة)دا بە(٤٠٠) لە (تحفة) بەپێنج:

١- اقبل تحفة الخليل = ١٣٢٧هـ

١٣٣ ٤٩٣ ٧٠١ = ١٣٢٧هـ

٢- الجنة مأوى الصُّفِيِّ = ٧٥٢هـ

٤٨٤ ٥٧ ٢١١ = ٧٥٢هـ

ح- پیتی گوشراو (مُشَدَّد) بەیەک پیت دانراوە، مەگەر خۆی لە ڕێنووسا بەدوو پیت بنووسرێ، بەنموونە (الجنة) دەکاتە: (١ + ٣٠ + ٣ + ٥٠ + ٤٠٠ = ٤٨٤) بەڵام (الله) دەکاتە: (١ + ٣٠ + ٣٠ + ٥ = ٦٦) هەروا (ئومێد) دەکاتە: (١ + ٦ + ٤٠ + ١٠ + ٤ = ٦١) بەڵام (ئوممێد) دەکاتە: (١ + ٦ + ٤٠ + ٤٠ + ١٠ + ٤ = ١٠١). جا وا باشە لە کوردیشدا هەمان یاسا و ڕێسا ڕەچاو بکرێ، تا کاتێ بەتەواوی

ڕێنووسی کوردی دەچەسپێ و دادەمەزرێ و لەم پاشاگەردانییەی ئێستا ڕزگاری دەبێ، خوا یار بێ زۆری نەماوە کە ئەمە سەر بگرێ.

ط- لەم وشانەدا و لە وێنەی ئەم وشانەدا بۆ دانانی ژمارە خەت ڕەچاو دەکرێ، نەوەک خەتی عەرووزی و گۆییکردن، بەوێنە (هذا = ٧٠٦، هذين = ٧٦٥، هؤلاء = ه + ء + و + ل + ا + ء = ٥ + ١ + ٦ + ٣٠ + ١ + ١ = ٤٤، ذلــك = ٧٥٠، طــه = ١٤، رحمن = ٢٩٨، هذه = ٧١٠، لكن = ١٠٠) وێنەی تری ئەمانە، کە لە ڕێنووسا بەبێ ئەلف دەنووسرێن، بەڵام واوی (عــمــرو) و (أولوقــوة) و ئەلفی دوا واوی جەمع وەک (ذهبوا، لن يذهبوا) یا ئەلفی دوا واوی بەشی وشەی معتل اللام، وەک (أدعوا، أغزوا) یا ئەلفی تەبیین وەک (أنَا) نرخی ژمارەیی خۆیان بۆ دادەنرێ. تەنانەت پیتە پچڕ پچڕەکانی سەرەتای سورەتەکانی قورئان بەپێی نووسین ژمارەیان بۆ دادەنرێ، نەوەک بەپێی خوێندنەوەیان، بەنموونە (ق) دەنووسرێ (ق) بەڵام دەخوێنرێتەوە (قاف) لەبەر ئەوە بەژمارە دەکاتە (١٠٠) نەوەک (١٨١ = ق + ١ + ف). وە (ألم) دەکاتە (٧١) وە (طه = ١٤، يس = ٧٠، الر = ٢٣١، حمعسق = ٣٧٨).

لە سەرەتای سورەتی بەقەرەدا بەیزاوی - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - دەفەرمووێ: لە خزمەت پێغەمەردا زانایانی جوولەکە، بەحسێبی جومەل (الم)یان دانا بەحەفتا و یەک، پێغەمەر نەیفەرمووە وا نییە.

ی- هەر وشەیەکی عەرەبی بەڕێنووسی کوردی بەچی نووسرا بوو بەوە نرخی ژمارەیی بۆ دادەنرێ، وەک: صاد و ضاد و ذال و ثی، کە لە کوردیدا بەدوو شێوە دەنووسرێن، یەکەم بەپێی ئەصڵ، دووەم بەپێی لە دەم دەرچوون و گۆییکردن. کەواتە: (ذەم = ٧٤٥) بەڵام (زەم = ٥٢) وە (ذم = ٧٤٠).

ک- تەنوین بەپیت نانووسرێ، لەبەر ئەوە ژمارەی ئەبجەدی بۆ دانانرێ، بەڵام لە حاڵەتی نەصبەدا، ئەگەر بەئەلف نووسرا، ژمارەی بۆ دادەنرێ جا وا بۆ ڕاهێنان ئەم چەند نموونەیە لە کوردی و عەرەبی دەهێنینەوە، مەحوی - بەڕەحمەت بێ - دەفەرمووێ (هەزەج):

دەنیی طەبعیی بەجارێ عالەمی داگرت ئەوا، مەحوی!

درەنگە ئیلتیجابە بەر ڕەئی عالیی جەنابێ زوو

مەحوی لە نیوەی دووەمی ئەم بەیتەدا، کە لەسەر شێوەی فارسی ئامێزی نووسینی

جارانی کوردی، ئاوا نووسیویەتی:

(درنگە إلتجابە برر إعالی جنابێ زو) مێژووی ئەو ساڵەی تیادا تۆمار کردووە، کە سکاڵای لە دەست نامەردی خەڵکەکەی کردووە، کە دەکاتە:

(٤ + ٢٠٠ + ٥٠ + ٢٠ + ٥ + ١ + ٣٠ + ٤٠٠ + ٣ + ١ + ٢ + ٥ + ٢ +
٢٠٠ + ٢٠٠ + ١ + ٧٠ + ١ + ٣٠ + ١٠ + ٣ + ٥٠ + ١ + ٢ + ١٠ + ٧ + ٦ =
١٣١٤ک).

ئیبنو جەزەری - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - لە کۆتایی ئورجوزەی (ذات الشفا)دا بەیەکەم پیتی وشەی (ثوان) ژمارەی بەیتەکانی ئورجوزەکەی دیاری دەکا کە دەفەرموێ (ڕەجەز):

أبيـاتُهَـا جَـاءَتْ (ثَوَان) كُـمَّـلاً
عَـامَ حِسَـابٍ، صَحَّ ذَاكَ جُـمَّـلاً

واتە: ژمارەی دێڕە شیعرەکانی ئەم ئورجوزەیەم دەکاتە (٥٠٠) بەیت، کە بەژمارەی جومەل پیتی ثێم کردووە بەهێما و ڕەمز بۆی[٧]

شێخ مەعرووفی نۆدێیی - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - عەرووزێکی کورتی پوختی هەیە، لە شیعرە ئەصڵەکاندا ئاماژە بۆ لەقەب و ژمارەی ئەجزا و عەرووض و ضەربی هەموو بەحرێ دەکا، ئاوا:

بَسَطْتُ نَحْوَ إله العَرْشِ كَفَّ رَجِيً
وَالمرتَجِي رَبَّهُ مُـسْـتَـاهِلٌ لِمَنَحْ

واتە: بەحری بەسیط - کە بەوشەی بسطت ئاماژەی بۆ کردووە - هەشت جوزئی هەیە، کە بەپیتی (ح) لە کۆتایی هۆنراوەکەوە ئاماژەی بۆ کردووە، وە سێ عەرووضی هەیە، بەپیتی (ج) لە کۆتایی لەتی یەکەما ئاماژەی بۆ دەکا، وە شەش ضەربی هەیە کە بەپیتی (و) لە سەرەتای لەتی دووەمەوە ئاماژەی بۆ دەکا.

بێتووشیش - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - ساڵی تەواوبوونی دانانی کتێبی (صرف العِنَايةِ في كشفِ الكفاية) بەوشەی (أَحْسَنُ الختام) لەم بەیتەدا تۆمار دەکا (ڕەجەز):

---

(٧) ساڵی دانانەکەیشی دەکاتە: (ح ص ذ = ٧٩٨) کە ئەم سێ پیتە سەرەتای ئەم سێ وشەیەن (حساب، صح، ذاک) (صحّ).

وَحِينَ مَنَّ اللهُ بالإتْـمَـــام
أرَّخْتُهَا بـ (أحْسَنِ الْخِتَامِ)

١١٩ + ١٠٧٢ = ١١٩١ك

ئەم بەیتەیش، نیوەی دووەمی، ساڵی کۆچکردنی شاعیرێ بۆ ئەو دنیا تۆمار دەکا کە دەڵێ (کامل):

لِمُصَـابِه جَـزِعَ الزَّمَــانُ مُـؤَرِّخـاً
وبَكى. عَلي. حُرٌّ. نبيـهٍ. فاضل

٣٨ +١١٠ +٢٠٨ +٦٧ +٩١١ = ١٣٣٤ك

شێخ سەلام بەڕەحمەت بێ دەڵێ:

ساڵی تەئریخی ئەپرسی (آل کاک احمد غریب)
کــەوتە عــالەم دڵ حــەزین و دیدەیی غمناکــەوە

| اال | کاک | احمد | غریب |
|---|---|---|---|
| ٣٢ | ٤١ | ٥٣ | ١٢١٢= ١٣٣٨ک |

هەروا لە شیعرێکی دیکەدا دەڵێ:

(شێخ. حسین. پس. لای. باپیری. چو)

٩١٠. + ١٢٨ + ٦٢+ ٤١ + ٢٢٥ + ٩ = ١٣٦٥

قانیع - بەڕەحمەت بێ - ساڵی وەفاتی پیرەمێرد لەم دێڕە هۆنراوەیەدا ئاوا تۆمار دەکا: بەتیپی أبجد هاتە گوفتوگۆ:

(مامۆسای کورد و خاوەن ژینم ڕۆ = ١٣٦٩ک)

زۆربەی ئەو یاسایانەی باسمان کردن، لە شیکردنەوەی ئەم نموونانەوە تەواو ڕوون بوونەوە.

وا بەندەیش بەدوو جۆر هاوبەشی دەکەم لەم بابەتەدا:

١- همزةٌ (قَدْ = ١٠٤ قَادَ = ١٠٥) جَيْشَ الفيلِ
خَانَ الحِمى مَلْعُونُ كلِّ جيلِ

مەبەست لەم شیعرە دوو شتە، یەکەم: پێڕستی سورەتەکانی قورئان، کە سورەتی (هُمَزَة) ژمارەکەی (١٠٤ = قَدْ) وە سورەتی (فیل) کەوا لەدوا ئەوەوە ژمارەکەی (١٠٥ = قَادَ).

دووەم: هەر کەسێ نامەردی و ناپاکی لە گەل و نیشتمانی خۆی بکا و پێش سوپای دوژمن بکەوێ و ببێ بەسووری بەر لەشکری دوژمن، ئەوە ئەبوریغالی سەردەمی خۆیەتی و وەک ئەو بەدگۆ و بەدکردارە و لەبەر ئەوە چیناوچین تف و لەحنەت و نەفرەتی لێ دەکرێ. یا وەک ئەم هۆنراوەیە، کە لەسەر زمانی ئەو شەهیدە کوردە ئیعدامکراوانە دانراوە، کە لە مەیدان رمیەکان گوللەباران دەکران، تەرمەکانیان لە چۆڵەوانی، یەک یەک و کۆمەڵ کۆمەڵ، زۆر بەبێ نازی دەکران بەژێر خۆڵەوە، هەیان بوو زیندەبەچاڵ دەکران، هەیان بوو دەکران بەنیشانە، وە بەهەزار و یەک شێوە دەکوژران و سەرنگوونیان دەکردن، منیش لەسەر زمانی ئەوان گوتوومە:

گوڵاڵە سوورەم لە چۆڵ ڕواوم    دە لە نۆم دەرکە شەهدی تەواوم!

واتە: کوردێکی شەهیدی بەرگ خوێناویم، دوژمن لە چۆڵەوانی تەرمەکەی کردووم بەژێر خۆڵەوە، بەڵام دوژمن خەیاڵی خاوە، تۆوی گوڵاڵە سوورە تا نەکرێ بەژێر خۆڵەوە ناڕوێتەوە، گەرچی ئێستا دوژمن ناهێڵێ من ناوی خۆم بەڕاشکاوی بڵێم، بەڵام بەهێما، بەرەمز پێناسەی خۆمتان بۆ دەکەم من (شهید)م، کە (ی = ١٠) لە بەینی (هـ = ٥ + د = ٤ = ٥ + ٤ = ٩) واتەکە (ی) لە بەینی (هـ) و (د) لە ناوەکەم دەرکرێ ئاوا (شهید)ـــ (شَهْد) دەمێنێ.

٢- بەژمارەی ئەبجەدیش مێژووی ئەمڕۆ دەنووسم:

(حی/ ط / ط ص ظ غ ٧ = ١٨/ ٩ / ١٩٩٩ز).

لە کۆندا زۆربەی مێژووەکان بەساڵی کۆچی دیاری دەکران لەناو وڵاتە ئیسلامییەکانا، بەڵام ئێستە ئەوە مەرج نییە. (بڕ: شیعرەکانی شێخ معروف لە بەحرەکاندا).

## ٢- (المُؤَرَّخ)

بڕوانە بڕگەی (ب) لە (الأبجدیة) کە ڕوونی دەکاتەوە کە مێژووی ڕووداوێ، چۆن چۆنی بەپیتەکانی جومەل تۆمار دەکرێ. شیعری موئەررەخ واتە: هۆنراوێ مێژوویی دیاری دەکات. (تضمین/٢)

## ٣- (الأَبوذِیَّة)

جۆرێکە لە ئەدەبی گەلی عیراقی، دەریایەکە لە دەریاکانی خەلیل بەدەر، زۆرینەی پێیەکانی دەچنەوە سەر هەزەج، خوا یار بێ لە شوێنی خۆیدا دەگەڕێینەوە سەری و، قسەی پتری لێ دەکەین.

### ٤- (التَّأْسِـيس)

تەئسیس ئەلفێکی نەرمە لە سەروادا، نەگۆڕە، واتە: لە سەراسەری دێڕەکانی چامەدا دەچەسپێ و لە ئەستۆ دەگیرێ، با بەم نموونەیە باسەکە تەواو ڕوون بکەینەوە:

كِلِينِي لِهَمٍّ - يَا أُمَيْمَةُ - نَاصِبِ
وَلَيْلٍ أُقَاسِيهِ بَطِيءُ الكَوَاكِبِ

لەم دێڕەدا پیتەکانی سەروا ئەمانەن:

آ- پیتی ڕەوی بێتی کۆتایی (الكَوَاكِبِ)یە.

ب- کافەکەی پیتی دەخیلە، کە ژێردارە و وا لە نێوان پیتی ڕەوی و پیتی تەئسیسا، کە ئەلفەکەی پێشیەتی.

ج- ئەلفی تەئسیس، کەوا لەنێوانی واو و کافی (الكواكب)یدا.

جا دەڵێین: ئەلفی (ناصب) و (الكواكب)ی ئەلفی تەئسیسە، کەواتە: ئەم چامەیە سەرواکەی موئەسسەسی مەوصووڵە، چونکە لە جۆری سەروای ڕەهایە واتە: قافیەی موطڵەقە، چونکە ڕەوی بزوێندارە. ڕەوی ئەو پیتەیە لە سەروادا کە چامەکە دەدرێتە پاڵی و بەناوی ئەوەوە ناو دەنرێ، وە دوا پیتە لە شیعری ومقید دا و، پیتی پێش وەصڵە لە شیعری موطڵەقدا. وەک دەگوترێ: لامية العَجَم، چامەی بانی، چامەی تائی، هەمەزییەی ئیمامی بوصەیری، ڕەحمەتی خودای لێ بێ، مەهموزە. جا هەر کاتێ چامەیێ موئەسسەس بوو، دەبێ لە سەراسەری سەرواکانیدا ئەلفی تەئسیس لەنێوانی پیتی دەخیل و پیتی ڕەویدا هەبێ، چونکە ئەلفی تەئسیس نەگۆڕە، واتە: پێویستە و دەبێ لەم جێگەیەدا لە پێش پیتی دەخیلەوە، لە ئاخری گشت بەیتەکانی چامەکەوە هەبێ و پەیڕەوی بکرێ. بەڵام پیتی دەخیل خۆی بگۆڕە، بەڵام بزوێنەکەی نەگۆڕە، واتە: مەرج نییە لە هەموو دێڕەکانی چامەکەدا پیتی دەخیل یەک پیت بێ، بەڵکو دروستە هەموو پیتەکانی ئەلفوبێ، بەرودوا لە چامەکەدا ببن بەدەخیل، بەڵام بزوێنی دەخیل نەگۆڕە، لە یەکەم بەیتا ژێر بوو دەبێ و لە گشت بەیتەکانی تریشدا ژێر بێ، هەروا ئەگەر بۆڕ، یا سەر بوو، گەرچی وا باشە کە بزوێنی پیتی دەخیل ژێر بێ، جاروباریش بۆڕ دەبێ، بەدەگمەنیش سەر دەبێ، بەڵام دەخیل نابێ زەنەدار بێ، واتە: پیتی وەستاو بێ. ئەوەندە هەیە پابەندبوون بەپیتی دەخیلەوە، ئەگەر هەستیار لە توانایا هەبێ، کارێکی جوانی هونەرییە، بەڵام گەرچی لە عەرەبیدا بزوێنی کورتی ژێر بۆ دەخیل زۆر پەسەندە، بەڵام دروستە کە لە کوردیدا، یا لە فارسیدا وا

نەبێ، بەڵكو سەر و بۆر و ژێر، كامیان پەسەند بێ بۆ دەخیل بەپێی زمان بگۆڕێ. (بڕ: القافیة). ئەلفی تەئسیس بۆیە پێی دەگوترێ: تەئسیس، چونكە لەپێش گشت پیتەكانی سەرواوە دێ و لەم بارەیەوە وەكو بناغەی سەروا وایە، دەبێ تەئسیس و ڕەوی لە یەك وشەدا بن. بزوێنی دەخیل پێی دەگوترێ (إشباع).

**(اَلقَصیدَةُ المُؤَسَّسَةُ)**: بڕوانە (القصیدَة -) بەكورتی ئەو چامەیە بەپێی ڕستەكەیێ دەبێ (یَە)كی دیكەشی بخرێتە سەر كە ئەلفی تەئسیسی تیا پەیڕەوی كرابێ، وەك ڕەحمەتی نالی دەفەرمووێ: (سەروای ڕەهای تەئسیسداری وەصڵدار):

خاڵی بەینی چاو و ئەبرۆت ئینتیخابی كاتیبە

یەعنی نوقطەی فەرقی ئیبنوموقلە و یبنوحاجیبە

ئەوەتا دوا وشەی دێڕەكانی تری ئەم چامەیە بەڕیز ئەمانەن: (لاعیبە، غالیبە، غائیبە، صائیبە...). (ر: التأسیس + القافیة).

### ٥- (أُصُول التَّفَاعیل أَوْ أصول الأَفَاعیل)

ژمارەی ئەو پێیانەی كە تەقطیعی هۆنراویان پێ دەكرێ، بۆ دۆزینەوەی بەحرەكەی، یا بۆ دڵنیابوون لە ڕەوانی و تەواوی كێشەكەی لە كاتی دانان و هۆنینەوەدا، ژمارەی ئەو تەفعیلانە دە تەفعیلن، چواریان ئەصڵن، شەشیان فەرعین، گەرچی ئەم دەیە لە بنەڕەتدا هەشتن، چونكە دووانیان یەكی بەدوو شێوە دەنووسرێن، لەبەر ئەوە لە بنەڕەتدا فەرعییەكانیش بەچوار دادەنرێن.

نیشانەی پێی ئەصڵ ئەوەیە كە بەوەتەدی كۆ، یا بەوەتەدی بڵاو دەست پێ بكا، نیشانەی فەرعیش ئەوەیە كە بەسەبەبی سووك، یان بەسەبەبی قورس دەست پێ بكا، وەتەدیش بەهێزترە لە سەبەب، چونكە كاتێ زیحاف و گۆڕین لە پێیەكانا ڕوو دەدا، ئیعتیماد لەسەر وەتەدە، لەبەر ئەوە ئەو پێیەی بەوەتەد دەست پێ دەكا بەئەصڵ دادەنرێ، وە ئەوەیشی كە بەسەبەب دەست پێ دەكا بەفەرع دادەنرێ.

جا ئەم دە پێیەیە لەسەر ئەم شێوەی دواوە لە سەبەب و وەتەد دروست دەبن، كە پێیان دەگوترێ: ئالەتەكان: ئەدەواتەكان: بنەڕەتەكان (بڕ: ركن):

أ – پێ بنەچەکان (پێ ئەصڵەکان) یا پێیە بنچینەییەکان:

١- فَعُولُنْ = ب – – = فَعُو = وەتەدی کۆ + لُنْ = سەبەبی سووک.

٢-مَفَاعیلن = ب – – – = مَفَا = وەتەدی کۆ + عی = سەبەبی سووک + لن = سەبەبی سووک.

٣- مُفَاعَلَتُنْ = ب – ب ب – = مفا = وەتەدی کۆ + عَلَ = سەبەبی قورس + تن = سەبەبی سووک.

٤- فَاعِ لاتُنْ = – ب – – = فاع = وەتەدی بڵاو + لا = سەبەبی سووک + تن = سەبەبی سووک.

ب – پێ وەچەکان (پێ فەرعەکان) یان پێیە نابنچینەییەکان:

٥- فاعِلُنُ = – ب – = فا = سەبەبی سووک + علن = وەتەدی کۆ. دەق پێچەوانەی (فعولُنْ)ە، لەبەر ئەوە دادەنرێ بەفەرع (وەچە)ی ئەو.

٦- مستفعلن = – – ب – = مُسْ = سەبەبی سووک + تف = سەبەبی سووک + عِلُنْ = وەتەدی کۆ. ڕێک پێچەوانەی (مفاعیلن)ە، کەواتە فەرعی ئەوە.

٧- مَتَفاعِلُنْ = ب ب – ب – = مُتَ = سەبەبی قورس + فا = سەبەبی سووک + عِلُنْ = وەتەدی کۆ. دەق پێچەوانەی (مفاعلتن)ە و فەرعی ئەوە.

٨- مَفْعُولات = – – – ب = مَفْ + عو = دوو سەبەبی سووک + لاَتُ = وەتەدی بڵاو. دەق پێچەوانەی (فَاعِ لاتُن)ە. واتە: فەرعی ئەوە.

٩- فاَعلاتُنْ = – ب – – = فا = سەبەبی سووک + علاَ = وەتەدی کۆ + تن = سەبەبی سووک. ئەمیش دەق پێچەوانەی (مَفَاعیلن)ە، بەڵام دەبێ سەبەبی دووەمی بکرێ بەسەرەتای، واتە (لُنْ) بکرێ بە(فا) ئەوجا بیخەرە پێش (مفا)وە و تەواوی کە دەبێ بە(لُنْ مَفَاعي = فاعلاتُنْ) کەواتە (فاعلاتَنْ)یش دیسان فەرعی (مَفَاعیلُنْ)ە.

١٠- مستفع لن = – – ب – = مُسْ = سەبەبی سووک + تَفْعِ = وەتەدی بڵاو + لُنْ = سەبەبی سووک. ئەمیش فەرعی (مَفَاعیلُنْ)ە، وە دەق پێچەوانەی ئەوە. بەڵام (عیِ) دەکرێ بەسەرەتای، دەبێ بە(عیلُنمفَا – – ب – = مستفع لُنْ) بەشێوەیەکی تر ئاوا ئەصڵەکان بخوێنرێنەوە، فەرعەکانیان لێ دروست دەبێ:

| بنەچەکان | پێچەوانەکەی | وەچەکان |
|---|---|---|
| ١- فَعُولُنْ | لُنْ فَعُو | ٥- فَاعِلُنْ |
| ٢- مَفَاعِيلُنْ | عِيلُنْ مَفَا | ٦- مُسْتَفْعِلُنْ |
| ٣- مُفَاعَلَتُنْ | عَلَتُنْ مَفَا | ٧- مُتَفَاعِلُنْ |
| ٤-فَاعِ لاَتُنْ | لاَتُنْ فَاعِ | ٨- مَفْعُولاَتُ |
| مَفَاعِي لُنْ | لُنْ مَفَاعِي | ٩- فاعِلاَتُنْ |
| مَفَاعِيلُنْ | عِيلنمفا | ١٠- مستفع لُنْ |

ئەو پیتانەی ئەم دە پێیە و پێ موزاحەفەکانیان لێ دروست دەبێ، ئەم دە پیتەن، کە لەم ڕستەیەدا کۆبوونەتەوە: (لَمِعَتْ سُيُوفُنَا). واتە: شمشێرەکانمان دەبریسکێنەوە.

ئەم دەیەیش سیانیان پیتی ڕیشەیی و ئەصڵین، کە فێ و عەین و لامن، کە ماددەی (ف ع ل)ەن، لە هەر دە تەفعیلەکاندا هەن، بەڵام ئەو حەوتەکانی تریان کە (يَمُوتُ ناس)ە، پیتی زائیدەن، بەپێی یاساکانی وشەسازی بوونیان، یا نەبوونیان لە تەفعیلەدا دەبێ یا نابێ.

ئەم دە پێیە بەپێی ژمارەی پیتەکانیان دەبن بەدوو جۆرەوە، دووانیان کە (فعولن) و (فاعلن)ن، هەریەکێ پێنج پیتن، لەبەر ئەوە پێیان دەگوترێ: (تەفعیلەی خوماسی = پێی پێنجی). ئەو هەشتەکەی تریشیان لەبەر ئەوەی کە هەریەکەی حەوت پیتن، پێیان دەگوترێ: (تەفعیلەی سوباعی) واتە: (پێی حەفتی). کە ئەمانەیانن: (مفاعیلن، مُفَاعَلَتُنْ، مُتَفاعِلُنْ، فَاعِلاتُنْ، فاعِ لاتُنْ، مُسْتَفْعِلُنْ، مُسْتَفْعِ لُنْ، مَفْعُولاتُ).

وا ئێستایش لەم لیستانەدا ڕوونی دەکەینەوە، کە هەریەکێ لەم دە پێیە، لە چی بەحرێکا دێ، چ بەساخی، وە چ بەموزاحەفی، وە هەریەکێ لەم دە پێ ئەصڵییانە، کە دەن، بەهۆی زیحافوعیللەوە چەند پێی موزاحەف - واتە: فەرعی -یان لێ پەیدا دەبێ.

یەکەم: (فَعُولُنْ) (فعولُ ب-ب، فَعُولْ ب-ْ، فَعْلُنْ--، فَعْلُ-ب، فَعَلْ ب-، فَعْ-)

١- تەویل: آ- (فعولن - ساخ) ب- (فعولن = مەحذووفی مفاعلین) ج- (فَعُولُ) مەقبووضی (فَعُولُنْ).

٢- موتەقارەب: آ- (فَعُولن - ساخ) ب- (فَعولُ) مەقبووزی (فَعُولُنْ).

٣- هەزەج: آ- (فعولن) مەحذووفی (مفاعیلن) ب- (فعولان) مەقصووری (مفاعیلن).

٤- وافیر: آ- (فعولن) مەحذوفی (مفاعیلن) ب- (فعولن) مەقطووفی (مُفَاعَلَتُنْ).

٥- رەجەز: آ- (فَعُولُنْ) مەقطوعی (مَفَاعِلُنْ).

٦- موخەللەعی بەسیت: آ- (فعولن) مەخبونی مەقطوعی (مَفَاعِلُنْ).

٧- خەفیف: آ- مەخبوونی مەقسووری (مستفع لن = فَعُولُنْ).

٨- سەریع: آ- (فَعُولُنْ) مەخبوونی (مفعولن = فَعُولُنْ) ب- (فَعُولاَنْ) مەخبوونی (مَفْعُولاَنْ = فَعُولاَنْ).

دووەم: (مَفَاعِيلُنْ) (١- مَفَاعِلُنْ ب-ب -، ٢- مَفَاعِيلُ ب--ب، ٣- مَفَاعِيلْ ب--ْ، ٤- فَعُولُنْ ب--، ٥- مَفْعُولُنْ ---، ٦- فَاعِلُنْ - ب -، ٧- مَفْعُولُ -- ن).

١- تەویل: آ- (مفاعیلن - ساخ) ب- (مَفَاعِلُنْ) مەقبووزی (مفاعیلن).

٢- هەزەج: آ- (مَفَاعِيلُنْ - ساخ) ب- (مَفَاعِلُنْ) مەقبووزی (مَفَاعیلن).

٣- وافیر: (مَفَاعِيلُنْ) مەعسووبی (مُفَاعَلَتُنْ = مَفَاعیلن).

٤- موضاریع: آ- (مَفَاعیلن)

سێیەم: (مُفَاعَلَتُنْ) (١- مَفَاعِيلُنْ ب - - -، ٢- مَفَاعِلُنْ ب - ب -، ٣- مَفَاعِيلُ ب - - ب، ٤- فَعُولُنْ ب - -، ٥- مُفْتَعِلُنْ - ب ب -، ٦- مفعولن - - -، ٧- فاعلن - ب -، ٨- مَفْعُولُ - - ب).

١- وافیر آ- (مُفَاعلتن) ساخ ب- (مَفَاعِلن) مەعصووبی (مُفَاعَلَتُنْ).

چوارەم: (فَاعِ لاَتُنْ) (فاعِ لات - ب - ب).

١- موزاریع: آ- (فاعِ لاتُنْ - ساخ) ب- (فاعلات) مەکفووفی (فاع لاتن).

٢- سەریع: آ- (فاعِ لاَت) مەتوی (مفعولات).

٣- مونسەریح: آ- (فاعِ لاَت) مەتوی (مفعولات).

٤- موقتەرەب: آ- (فاعلات) مەتوی (مفعولات).

پێنجەم: (فَاعِلُنْ) (١- فَعِلُنْ ب ب -، ٢- فَعْلُنْ - -).

١- مەدید: آ- (فاعلن = ساخ) ب- (فاعِلُنْ) مەحذووفی (فاعِلاَتُنْ). ج- (فَاعِلاَن

- ب -ْ) موزالی (فاعلن) له موتەدارەکا و مەقصووری (فَاعِلاَتُنْ) له مەدیددا.

٢- موتەدارەک: آ- (فاعِلُنْ - ساخ) ب- (فاعِلاَنْ) موزالی (فَاعِلُنْ).

٣- بەسیط: آ- (فَاعِلُنْ - ساخ).

٤- رەمەل: آ- (فاعِلُنْ) مەحذووفی (فَاعِلاتُنْ).

٥- خەفیف: آ- (فاعِلُنْ) مەحذووفی (فاعِلاَتُنْ).

٦- موجتەس: آ- (فَاعِلُنْ) مەحذووفی (فَاعِلاَتُنْ).

٧- وافیر: آ- (فَاعِلُنْ) ئەجەمی (مُفَاعَلَتُنْ).

٨- سەریع: آ- (فَاعِلُنْ) مەطوی و مەکسووفی (مَفْعُولاَتُ).

٩- هەزەج: آ- (فاعِلُنْ) ئەشتەری (مَفَاعِيلُنْ).

١٠- موزاریع: آ- (فَاعِلُنْ) ئەشتەری (مفاعيلن).

شەشەم: (مستفعلن) (١- مفاعلن ب - ب -، ٢- مُفْتَعِلُنْ - ب ب -، ٣- فَعِلَتُنْ ب ب ب -، ٤- مُسْتَفْعِلُ - - ب ب، ٥- مَفَاعِلُ ب - ب ب، ٦- مَفْعُولُنْ - - -، ٧- فَعُولُنْ ب --، ٨- مُسْتَفْعِلان --ب -ْ، ٩- مَفَاعِلاَنْ ب-ب-ْ، ١٠- مُفْتَعِلاَنْ - ب ب -ْ، ١١- فَعِلَتَانْ ب ب بَ -ْ)

٢- رەجەز: آ- (مستفعلن - ساخ).

٣- سەریع: آ- (مستفعلن - ساخ).

٤- مونسەریح: آ- (مستفعلن - ساخ).

٥- مقتضب: آ- (مستفعلن - ساخ).

٦- کامیل: آ- (مستفعلن) موزمەری (مُتَفَاعِلُنْ).

حەوتەم: (مُتَفَاعِلُنْ) (١- مستفعلن: مضمر ٢- مفاعلن: موقوص ٣- مُفْتَعِلُنْ: مخزول ٤- فعلاتن: مقطوع ٥- مفعولن: مقطوعی مضمر ٦- فَعِلُنْ: أحَذّ ٧- فَعْلُنْ: أحذی مضمر ٨- متفاعلان: سالمی موزال ٩- مُسْتَفْعِلاَنْ: موضمەری موذال ١٠- مَفَاعِلاَنْ: موقوصی مذال ١١- مفتعلان: مذالی مخزول ١٢- متفاعلاتن: ساخی مرَفّل ١٣- مستفعلاتن: مضمری مرفل ١٤- مَفَاعِلاتُنْ: موقوصی مرفل ١٥- مُفْتَعِلاتُنْ: مخزولي مرفّل).

١- كاميل: آ- (متفاعلن - ساخ).

هەشتەم: (مَفْعُولاَتُ):

١- سەریع: آ- (مفعولاتُ - ساخ).

٢- مونسەریح: آ- (مفعولاتُ - ساخ).

٣- موقتەضەب: آ- (مفعولاتُ - ساخ).

نۆیەم: (فاعلاتُنْ):

١- مەدید: آ- (فاعلاتن - ساخ).

٢- رەمەل: آ- (فاعلاتن - ساخ).

٣- خەفیف: آ- (فاعلاتن - ساخ).

٤- موجتەث: آ- (فاعلاتن - ساخ).

٥- سەریع: آ- (فاعلات) مەطوی (مفعولات).

٦- مونسەریح: آ- (فاعلات) مەطوی (مفعولات).

٧- موقتەزەب: آ- (فاعلات) مەطوی (مفعولات).

٨- موتەدارەک: آ- (فاعلاتن) مورەففەلی (فاعلن).

دەیەم: (مستفع لُنْ):

١- خەفیف: آ- (مستفع لن - ساخ).

٢- موجتەس: آ- (مستفع لن - ساخ).

**٦- (ألف)**

ئەلف لە هۆنراودا رۆڵ دەبینێ، وە جۆری کێشزانی زۆرە، لەبەر ئەوە زۆر حوکم و بڕیاری کێشی لە بارەیەوە هەیە. وەک:

١- ئەلفی تەئسیس، لە تەئسیسدا ڕۆیشت.

٢- ئەلفی ریدف ئەلفێکە لە سەروای مقید و موطڵەقدا، ڕێک دەکەوێتە پێش پیتی ڕەوییەوە. وەک ئەلفی (زەبان) لەم شیعرەی سالمدا - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - (رەمەل):

چاوی عـیـبـرەت هەڵـبـڕە ئەی دڵ! لە وەزعی دەهری دوون

سـەیری کـە رۆمی دەڵەک چی کـرد بەزومـرەی کـورد زەبان

٣- ئەلفی خەروج: ئەلفێکە لە ئیشباعی بزوێنی پیتی هێی وەصڵ لە سەروادا، پەیدا دەبێ، نەگۆڕە، پەیڕەو دەکرێ، پێویستە لە سەراسەری سەرواکانی چامەکەدا لە جێی خۆیدا جێبەجێ بکرێ، هەر لە سەروای ڕەها (موتڵەق)دا دەبێ. وەک (کامل):

عَـفَتِ الدِّيَارُ مَـحَلُّهَا فَـمُقَـامُـهَـا

بِمنىً تَأَبَّدَ غُـولُهَـا فَـرِجَـامُـهَـا

لەم چامـەیەی لەبیددا، لە کۆتایی هەموو بەیتێکەوە ئەم هێ و ئەلفە هەیە، لەسەر ئەم شێوەیە: (سِلاَمُهَا، حَرَامُهَا، رِهَامُهَا... تاد).

ئەم جۆرە ئەلفـە لەگەڵ هێی ڕاناوی تاکی مێـیینەدا، لە کـوردیدا، بەزەحـمەت پـیادە دەکرێ، مـەگەر هێکەی بەشی وشە بێ، وەک: (کـارها، فـارهَا، جدارهَا) وەک: (شاها، ماها، جاها، شەها، بەها، مەها، وەها، ئەها، دەها، تەها...) (ر: الخروج).

٤- ئەلفی وەصڵ، ئەلفی صیلەیشی پێ دەگوترێ، ئەلفێکی نەگۆڕە، پەیڕەوی دەکرێ، لە تێرکردن (ئیشباع)ی بزوێنی پیتی ڕەوی لە سەروای ڕەها (مطلق)دا پەیدا دەبێ. وەک (شەوقی - تەویل):

وَدَبَّابَةٍ تَحْتَ العُـبَـاب بِـمكْمن

أمِينٍ، تَـرى السَّـارِيَ وَلَيْسَ يَـرَاهَا

کـە لە دوایەوە (أَخَـاهَا، حَـوَاها...) هەیە. یا وەک ئەم چامـەیەی سـالم کـە ئەمـە سەردێڕەکەیەتی (هەزەج):

ئەگەر ئومێدی دڵ بێنێتە جێ ماهی جیهان ئارا

بەخاڵی هیندوەش بەخشەم سەمەرقەند و بوخارارا

(بڕوانە: الوصل)

٥- ئەلفی لەیینە، یەکێکە لە سێ پیتـەکـانی لین (لین = نەرمی) کـە ئەلف و واو و یێن، وەک ئەلفی (دعاء، أحشاء، مال، قال) لە عەرەبیدا و (دار، شارا، خانم، سامان) لە کـوردیدا، هەمـوو ئەلفێ ئەلفی لینە، ئەم دوو جـۆرە ئەلفـە نەبێ: ئەلفی مـەمـدوودە و هەمـزەی بزوێندار و هەمزەی وەسـتـاو، وەک (نەء) ئەلفی لەیینە ئەلفی طەویلەیشی پێ دەگـوترێ، واتە: ئەلفی درێژ، لە زۆر شـوێنا بۆ ڕاسـتکردنەوەی کـێش دەکـرتێ، یا زیاد دەکرێ، بڕوانە ئەم ژمارانە لە ناچارییەکانی شیعر: (١١، ١٢، ٦٥، ٦٦، ٦٨).

نالی - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - دەفەرمووێ (موزاریعی هەشتی ئەخرەب):

دەستم لە گەردنی خۆت هەڵ مەگرە ئەی (حەبیبە!)

وەبزانە خـوێنی خـۆمـە، یا مـیننەتی ڕەقـیـبـە!!

ئەمە خۆی (وابزانە) بووە، لەسەر کێشی (فَاعِـلاَتُ) بێکەی بزوێندار بووە، بەیاسای: (بۆ ناچاری پیتی بزوێندار بێ بزوێن دەکرێ) بێکەی بێ بزوێن دەکرێ و دەبێ بە(وابزانە) ئەوجا بەیاسای دوو پیتی وەستاو کۆ ببنەوە، بۆ چارەی کێشەکەیان پیتە نەرمەکەیان، کە پێی دەگوترێ پیتی عیللە دەکرتێ، بەم یاسایە و بۆ سافبوونی تەواوی کێشەکە، ئەلفەکەی کرتاوە و بووە بە(وەبزانە = مفعولُ) کە ئەویش پێی پێویستە لەم شوێنەدا.

ئەلفی نەرم (لیّنة) لە هۆنراوی کێشی پەنجەیشدا، بۆ پێویستیی کێش دەکرتێ، وەک (دە بڕگەیی):

تا لە ریسوایی سوالّ (قـوتەرت) بێ

حـــالّ و مـــالێکی ســـەروبەرت بێ

خۆی (قوتارت بێ)یە بووە، بۆ پاراستنی یەکێتیی سەروا کراوە بە(قوتەرت) بێ، هەتا ڕێک بێ لەگەڵ (سەروبەرت بێ).

ئەلفی نەرم بەچەند بایەخێ (ئیـعـتـیـبـارێ: ڕەچاوکـردنێ) دابەش دەکـرێ، وەک ڕەچاوکـردنی درێژی و کـورتی، یا ئەصـڵی و زائیـدی، یا پیـتی سێـیـەم و چوارەم و... لە وشەدا، یا ئەلفی بەدەل و وەجهڵ لە یا و واو، یا... یا... تاد.

بەکورتی ئەلف ئەم جۆرانەی هەیە، وە زۆربەی ئەم جۆرانەیش بڕیاری کێشی و سەروایی لە بارەیانەوە هەیە. پەلەمان نییە، خوا یار بێ لە شوێنی خۆیانا ڕوونیان دەکەینەوە:

١- ئەلفی ئەصڵی، وەک (مَدَی، جَاءَ، مَتَی، عَلی، دار، العَصَا، زام، شارا). بەکوردی پێی دەگوترێ: ئەلفی بنچینەیی، یا ئەلفی ڕیشەیی.

٢- ئەلفی زائیدە، وەک ئەلفی کۆتایی (الرقابا) کە سەروای دێڕێ بێ.

٣- ئەلفی موبەددەل لە تەنوین (بڕوانە: ناچارییەکان - ١٠٢/١١، ١٢).

٤- ئەلفی تەثنیە، وەک: (رجلان، قاما، لم یُقوما). بڕوانە: (وەصڵ، ڕەوی).

٥- ئەلفی تەبیین، وەک (أنا) تا بزانرێ نوونەکە سەری هەیە.

٦- ئەلفی پیتی ئەلفوبێ.

٧- ئەلفی پیتی ئەبجەدییە، کە یەکسانە بەیەک.

٨- ئەلفی تەئنیث، کە پێشی دەگوترێ: پیتی نیشانەی مێیینە، وەک (حُبْلَی، کُبْرى). بڕوانە: (البَدَل/١).

٩- ئەلفی ئیطلاق، وەک: ئەلفی ژمارە دووی ئەم دابەشکردنە (الرقابا).

١٠- ئەلفی وەصڵ.

١١- ئەلفی ریدف.

١٢- ئەلفی خورووج.

١٣- ئەلفی تەئسیس.

١٤- ئەلفی تەرەننوم.

١٥- ئەلفی إغاثە، وەک: (وازیداه).

١٦- ئەلفی مەقصورە وەک: (مَدى، حَجَا، کمثری، عیسی، مصطفی).

١٧- ئەلفی مەمدوودە، وەک: (عطاء، حمراء، جاء).

١٨- ئەلفی فاریقە (جیاکەرەوە) وەک ئەو ئەلفەی کە لەپاش واوی کۆوە دەنووسرێ، هەتا جیای بکاتەوە لە واوی بەشی وشە، وەک: (ضربوا، لم یضربوا).

١٩- ئەلفی ئیعراب وەک: (أباک).

٢٠- ئەلفی تەناسوب، وەک: (سَلاَسِلاَ وَأَغْلاَلاَ).

٢١- ئەلف لە ضەمیرا، وەک (هما، کما، ضربا، ولَدا زیدٍ، لَهَا، عندها).

٢٢- ئەلفی وەجەڵ (بەدەل) وەک (المغزی) ئەلفەکەی لە بنچینەدا واو بووە، وەک (تَعَالَی) لە بنەڕەتدا (تعالب) بووە، وەک (قال) لە بنەڕەتدا واو بووە، وەک (باع) لە ئەصڵا (بَیَعَ) بووە، واتە: یێ بووە.

٢٣- ئەلفی دووەم، یا سێیەم، یا چوارەم، یا... تاد، وەک (ما، متی، العصا، مغزی، مستشفی...).

٢٤- ئەلفی ئیلحاق، وەک (قَلْسی) کە مولحەقە بە(دَحْرَجَ)ەوە، خۆی (قَلَسَ)ە بووە.

٢٥- ئەلفی مەجهوولە (نەزانراو) کە نەزانرێ لە بنچینەدا یێ بووە یا واو بووە وەک ئەلفی (عاج، باج، خاچ).

٢٦- ئەلفی طەرەف، یا متطرفە، ئەوەیە کە دوا پیتی وشە بێ، وەک (مَدَی، دُمی، عَلی، مصطفی).

٢٧- ئەلفی متحرکە مەبەست لێی هەمزەی متحرکەیە، وەک (اکرم، اِجْتَمَعَ).

٢٨- ئەلفی هاویە، هاویە صیـفـەتی کـاشـفـەیە بۆ ئەلف. دەنا هەمـوو ئەلفێ ئەلفی هاوییەیە، وەک (قال، دار، شارا)یا بۆ جیاکردنەوەیەتی لە ئەلفی متحرکە.

٢٩- ئەلفی منقلبـە، ئەلفـێکە لە بنەڕەتدا واو بووە، یا یێ بووە، یا هەمـزە بووە، وەک (قَـالَ = قَـوَلَ، بَاعَ = بَيَعَ، آلحن = ءَالحن، آمن = أَأْمَنَ) وەک ئەلفی (ذا) کـە مەقلووبی یێیە، چونکە مصغەرەکەی (ذُيَي)ەیە.

٣٠- ئەلفی کرتاو لە نووسیندا، وەک ئەلفی (هذا = هاذا، رحمن = رحمـان...) بڕوانە: باسی نووسینی عەرووزی لە پێشەوە.

٣١- ئەلفی بەینە بەینەی مەشـهـوور، وەک (سا ءک) کـە هەمـزەکـەی لە بەینی هەمـزە و ئەلفدا دەخوێنرێتەوە.

٣٢- ئەلفی مـەدد، ئەلف کـە بزوێنی نەبوو، پیـتی مـەدد یا لینی پێ دەگـوترێ، وەک (يُسَاوِم، دار، بار).

٣٣- ئەلفی لەیینە، لەپێشەوە ڕۆیشت.

٣٤- ئەلفی بابي مـسـاجـد، یا بابي عَصَـا، یا بـابي رَحَى. مـەبەست لە یەکـەم وەزنی (مَفَاعِل)ە، وەک (شَوَايا) کە لە بنەڕەتدا (شَوَاوَى) بووە، وەک (مَسَاجِد) مەبەست لە بابی (عَصَا) وشەی مەقصووری مونەووەنە کە ئەلفەکەی لە بنچینەدا واو بێ، مەبەست لە بابی (رَحَى) هەمان شتە کە ئەلفەکەی یائی بێ.

٣٥- ئەلفی کلا و کلتا.

٣٦- ئەلفێ کە لەسەر شێوەی تەنوین دەنووسرێ لەدوا فیعلەوە. وەک (لَنَسْفَعاً بِالنَّاصِيَةِ) کـە لە کـاتی وەصـلا بەنوون دەخـوێنرێتـەوە، بەڵام لە کـاتی ئێـسـتـا بەئەلف دەخوێنرێتەوە.

٣٧- ئەلفی طەویلە، وەک ئەلفی (قال، العصا، غزا) بڕ: ئەلفی لەیینە.

تێـبـینی: لە ئیطلاقی هەندێ لەم زاراوانەدا تسـامح و چاوپۆشی دەکـرێ. بۆ نموونە: (مەمدوودی صەرفی ناوێکە دوا پیتی هەمزەیەکی بزوێنداره، ئەلفێکی هاویەی زائیدە وا لە پێشیـەوە، وەک: حمراء، إعطاء، إرواء، صحراء، کبریاء، خیلاء... تاد). کـەواتە: ئەلفی (يَشَاءُ) و (جَاءَ) کە فیـعلن و ئەلفی (ماء) کە ئەصلـییە و وێنەی ئەمانە ئەلفی مـەمدوودە نین، بەواتای زاراوەیی، بەڵام بەتەسامـوح و بەچاوپۆشی و چاولێ خشـان، بۆ

مەبەستی کێشی، بەر ئەلفی مەمدوودە دەکەون و دروستە لە هۆنراودا کورت بکرێنەوە و پێیان بگوترێ قەصری مەمدوود، وەک (یا) و (جا) کە لەم هۆنراوەدا قەصر کراون، گەرچی مەمدوودی حەقیقیش نین (رەجەز):

وَشَرْطُ ذَا اْلإعْرَابِ أنْ يُضَفْنَ لاَ

(لِيَاكَجَا) أخُو أبيكَ ذَا اعْتِلاَ

لە ناوەکانی پیتەکانی ئەلفوبێ ئەم پیتانە لە هۆنراودا قەصر دەکرێن: (باء = با، تاء = تا، ثاء = ثا، حاء = حا، خاء = خا، راء = را، زاء = زا، طاء = طا، ظاء = ظا، فاء = فا، هاء = ها، یاء = یا).

لە ڕاستیدا ئەم زاراوانە لە عەرووزدا، هەموو بەرچاو دەکەون، وە لە بارەیانەوە بڕیاری کێشی هەیە، لەبەر ئەوە حەزم کرد کە ئەدیبانی کوردیش پێیان ئاشنا بن، وە ئێمەیش وەک گەلانی تر، هۆنراو و شیعر و ئەدەبییاتمان بەپێی یاسا و ڕێسا زانستییەکان دابڕێژین، وە ئەم جۆرە بابەتانە بەناوی فەرهەنگی و زاراوی ڕێسایی ناو ببرێن. جا لەم ڕوانگەیەوە لە هۆنراوی کوردی چەند نموونەیێ لەم بابەتە دەهێنمەوە:

١- قەصری مەمدوود، یا کورتکردنەوەی ئەلفی درێژ. مەحوی - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - دەفەرمووێ (رەمەل):

تورکی من کوشتارخانەی عاشقانی دی، وتی:

من (برنجی بریزید) ئێرە (ایکنجی کربَلاَ)

نالییش - ڕەحمەتی لێ بێ - (إنشاء)ی کردووە بە(إنشا) و دەفەرمووێ، (هەزەجی هەشتی ئەخرەب):

(نالی) نییەتی سیحری بەیان، حیکمەتی شیعرە

ئەمما نییەتی قووەتی دڵ، قودرەتی (ئینشا)

هەروا مامەڵەی کورتکردنەوەی ئەلفی درێژکراوی کردووە بۆ (بقاء) و (فناء) کە دەفەرمووێ:

بۆ ماچی دەمی ڕەنگە لە عیشوەی خەمی ئەبرۆی

جۆیایی (بەقا) خۆی لە دەمی تیغی (فەنا)دا

٢- سالمیش - ڕەحمەتی لێ بێ - بۆ ڕاستکردنەوەی کێش ئەلفی یەکەمی (بابان)ی

کرتاندووه، که دەڵێ (ڕەمەل):

صاعیقه و بەرقی نحووست ظولمەتی دا شەرق و غەرب

بەردەبارانە بەمەخصووصی لەسەر موڵکی (بەبان)

٣- ئەسیرییش - ڕەحمەتی لێ بێ - لە زۆر لە چامەکانیدا ئەلفی ریدف و ئەلفی تری پیادە کردووە، لە چامەی (مودیری جازیبە)دا ئەلفی ریدفی پیادە کردووە، کە دەڵێ (ڕەمەل):

ئەی مودیری جازیبەی کوڕڕات و زەڕڕەی کائینات

شاهیدی بوونی تووە سووڕانی مانگ و ڕۆژهەڵات

٤- نالییش ئەلفی تەئسیسی پیادە کردووە، بڕوانە: (٤- التأسیس/ القصیدة المؤسسة).

## ٧- (ئەلفیّة)

زۆر ئورجوزەی تەعلیمی هەن، ژمارەی دێڕەکانیان دەگاتە هەزار شیعر، لەبەر ئەوە پێیان دەگوترێ: ئەلفییە، واتە: هەزار دێڕی، یا هەزارین، یا هەزارینە، وەک ئەلفییەی ئیبنومالیک و ئیبنوموعط لە زانستی نەحودا.

## ٨- (المُؤْتَلَفْ)

بڕوانە (دائِرَةُ المؤتَلف).

## ٩- (تأنیث المذَکَّر)

بڕوانە (ناچارییەکان/ ٨٦).

## ١٠- (المأنوس)

دەگوترێ: ضەربی یەکەم یا دووەمی ئەم بەحرە، یا ئەم عەرووضە مەئنووسە، یا غەیرە مەئنووسە. مەئنووس واتە: باو، شاعیرەکان بەئاسایی بەو جۆرە ضەربە شیعریان گوتووە، نامەئنووسیش ئەوەیە کە ناباوە و بەدەگمەن شیعری پێ گوتراوە.

بەوێنە: بەحری کامیل لە کوردیدا هەتا ئێستا بەدەگمەن شیعری پێ گوتراوە. کەواتە: دەریای کامیل لە شیعری کوردیدا ناباوە، واتە: غەیرە مەئنووسە، بەڵام شیعر گوتن بەپێی

بەحری هەزەج لە کوردیدا زۆر زۆر باوە، هەروا بەحری رەمەل.

١١- (أَنَا)

وشەی (أَنَا)ی عەرەبی کە بەواتا (من)ی کوردییە، دوو برگەی کورتە، لەسەر کێشی (پەلە = فَعَ = ن ن) سەبەبی قورسە، بەلاّم بۆ ناچاری کێش دروستە بکرێ بەدوو برِگە، یەکەمیان کورت و دووەمیان درێژ کە یەکسان بێ بەوەتەدێکی کۆ، ئاوا: (أنا=فَعُو=ب-).

## (دووەم: پیتی بێ)

ب = ٢. (بڕوانە: دوا تێبینی ئەم پیتە).

(البَأْو): (بڕوانە: جۆرەکانی بەیت/ ١، ٢) و (بڕوانە: ٦ - ئەلف/ ٣٦ - تێبینی).

### ١٢- (بتر = بەتر)

بۆ تێگەیشتنی تەواو لە (بتر، أبتر) بڕوانە خشتەکانی زیحاف و عیللەکان: (نەخشەی چوارەم/ ٥ + لیستی چوارەم/٥ + لیستی - ٥/١٠).

بەتر وشەیەکی عەرەبییە، لە زماندا واتە: دوا بڕین، کلک خشتکردن لەبندا، وەک زاراوە بریتییە لە (قەتع و حەزف). بەتر لە جۆری عیللەی نەگۆڕە، واتە: هەر کاتێ لەسەر دێڕی چامەدا پیادە کرا، دەبێ لە سەرجەمی دێڕەکانی تریدا پیادە بکرێ: (عِلّة لازمة) لە جۆری عیللەی لێکدراوە بەلێکەمکردن، لە بنەڕەتدا دوو عیللەی سادەیە، دەچێتە سەر کێشی مەدید و موتەقارەب (متقارب). لە مەدیددا پێی (فاعلاتُن) لە زەربی سێیەمی عەرووزی دووەمدا، بەحەذف دەبێ بە(فاعلا = فاعلن) لەپاشا بەقەتع دەبێ بە(فاعل = فعلن = --). لە موتەقارەبا (فعولن) دەبێ بە(فع = -) لە زەربی چوارەمی عەرووزی یەکەم و لە زەربی دووەمی عەرووزی دووەما.

### ١٣- (أبتر) یا (مبتور) یا (مبتورة) یا (بتراء)

دەگوترێ: عەرووزی ئەبتەر، یا زەربی ئەبتەر، یا پێی مەبتوور، یا بەیتی ئەبتەر، یا مەبتوور، مەبەست ئەو عەرووز و زەرب و پێ و دێڕە شیعرانەیە کە تووشی دەرد (عیللەت)ی بەتر و دوابڕان بوون.

### ١٤- (بَحْر = بەحر = دەریا = کێش)

بەحر: ئەو کێشە تایبەتەیە کە هەستیار بەپێی پێیەکانی ئەو، هۆنراو دەهۆنێتەوە، بەکوردی بەحر؛ واتە: دەریا. بەوێنە: دروستە لەجیاتی بەحری طەویل بگوترێ: دەریای درێژ. بەحری عەرووزی شازدە بەحرن، بۆیە ناونراون بەحر، چونکە لق و پەلوپۆی زۆر زۆری بێ شوماری لێ دەبێتەوە، لە فرەوانی و بەرینیدا ڕێک لە دەریا دەچێ، کە لە هەزار لاوە چەم و جۆگە و کانیاو و سەرچەشمەی دەچێتەوە سەر و هەر پڕیش نابێ. بۆ نموونە: شێوە جیاجیاکانی هەر دەریایێ بگری، کە بەهۆی جیایی عەرووز و ضەرب و، بەهۆی

تووشبوونی زیحاف و عیللەتەکانەوە دروست دەبن، لە هەزاران تێ دەپەڕن، هەروا دەریای کێشی پەنجەیش، بەهۆی پێش و پاش خستنی بڕگەکانییەوە، هەزاران شێوەی لێ دروست دەبێ. لەبەر ئەوەیە کە دانانی هۆنراو بەپێی کێشی ئەم دەریایانە قەت تەواو نابێ. بۆ ناوی بەحرەکان بڕوانە (نەخشەی بازنەکان...).

دەریای کێش لە زۆر چەشمەندازەوە، بەچەندین جۆر دابەش دەکرێ. وەک:

١- (بەحرە بەسیطەکان: البحور المفردة: البحور البسيطة: البحور الصّافية):

بەکوردی پێیان دەگوترێ: دەریا سافەکان، یا دەریا سادەکان، یا دەرگا یەک پێییەکان. مەبەست ئەو کێشانەیە کە لە یەک جۆرە پێ دروست دەبن، کە بریتین لەم حەوت دەریایانە:

١- هەزەج (مفاعيلن ٣ × ٢)

٢- رەجەز (مستفعلن ٣ × ٢)

٣- رەمەل (فاعلاتن ٣ × ٢)

٤- موتەقارەب (فعولن ٤ × ٢)

٥- کامیل (متفاعلن ٣ × ٢)

٦- وافیر (مفاعلتن ٣ × ٢)

٧- موتەدارەک (فاعلن ٤ × ٢)

٢- (بەحرە تێکەڵەکان: البحور المركّبة: البُحُورُ المُخْتَلَطَةُ: البُحُورُ المُمْتَزِجَةُ: دەریا تێکەڵەکان):

مەبەست ئەو دەریایانەیە کە تێکەڵن لە دوو جۆرە پێ، کە بریتین لەم نۆ بەحرانە:

١- طەویل (فَعُولُنْ مَفَاعيلن ٢ × ٢)

٢- مەدید (فاعلاتن فاعلن ٢ × ٢)

٣- بەسیط (مستفعلن فاعلن ٢ × ٢)

٤- سەریع (مستفعلن، مستفعلن، مفعو لات × ٢)

٥- مونسەریح (مستفعلن مفعو لات مستفعلن × ٢)

٦- خەفیف (فاعلاتن مستفع لن فاعلاتن × ٢)

٧- موزاریع (مفاعیلن فاع لاتن مفاعیلن × ٢)

٨- موقتەزەب (مفعو لات مستفعلن مستفعلن × ٢)

٩- موجتەس (مستفع لن فاعلاتن فاعلاتن × ٢)

٣- (دەریا پێنجییەکان: بەحرە پێنجینەکان: البحور الخماسيَّةُ)

واتە ئەو جۆرە بەحرانە کە بریتین لە چەند پێیەکی پێنجی، کە بریتین لەم دوو بەحرە:

١- موتەقارەب = فعولن ٨ جار.

٢- موتەدارەک = فاعلن ٨ جار.

دیارە کە (فعولن) و (فاعلن) هەردووکیان پێی پێنجین.

٤- (دەریا حەوتییەکان: دەریا حەوتینەکان: البحور السُّبَاعية: دەریا حەوت پیتییەکان):

واتە: ئەو بەحرانەی کە بەنەصڵی وەضعیان پێکهاتوون لە چەند پێیەکی حەوت پیتی، کە بریتین لەم یازدە دەریایە:

١- وافیر = (مفاعلتن ٦ جار)

٢- کامل = (متفاعلن ٦ جار)

٣- هەزەج = (مفاعیلن ٦ جار)

٤- رەجەز = (مستفعلن ٦ جار)

٥- رەمەل = (فاعلاتن ٦ جار)

٦- سەریع = (مستفعلن مستفعلن مفعو: لات ٢ جار)

٧- مونسەریح = (مستفعلن مفعولات مستفعلن ٢ جار)

٨- خەفیف = (فاعلاتن مستفع: لن فاعلاتن ٢ جار)

٩- موضاریع = (مفاعیلن فاع: لاتن مفاعیلن ٢ جار)

١٠- موقتەضەب = (مفعولات مستفعلن مستفعلن ٢ جار)

١١- موجتەس = (مستفع لن فا علاتن فا علاتن ٢ جار)

٥- (دەریا نامێتەکان: البحور الممتزجة: البحور المختلطة):

بەحری مومتەزیج بەمەعنای پێشوو، کە بەواتا بەحری مورەککەب، یان بەحری

موختەلەط هاتووە، بەم واتایەیش بەکارهاتووە کە بەحرێ پێک بێ لە پێی پێنجی و لە پێی حەفتی، کە بریتین لەم سێ دەریایە:

١- طەویل = (فعولن مفاعیلن ٢ × ٢)

٢- مەدید = (فاعلاتن فاعلن ٢ × ٢)

٣- بەسیط = (مستفعلن فاعلن ٢ × ٢)

کەواتە: ٢ پێنجی + ١١ حەوتی + ٣ئامێتە = ١٦ بەحر.

**٦- (دەریا پشتگوێخراوەکان: بەحرە موهمەلەکان: البحور المهملة):**

وەک دەزانین بەحری عەرووزی لە پێنج بازنەی عەرووزی دەردەهێنرێن، دەبن بەدوو وشەوە:

١- دەریا باوەکان: دەریا بەکارهێنراوەکان، کە ئەو شازدە بەحرەن کە خەلیل دیاری کردوون، کە لەپێش سەردەمی خەلیلدا شیعریان پێ گوتراوە.

٢- دەریا ناباوەکان: دەریا پشتگوێخراوەکان: بەحرە موهمەلەکان، بریتین لە کۆمەڵێ دەریا، بەپێی سیستەمی بازنەکانی خەلیل، لەناو بازنەکاندا سەر هەڵدەدەن، بەڵام خەلیل - بەڕەحمەت بێ - هۆنراوی پێ نەدیون، لەبەر ئەوە ناوی ناون کێشی پشتگوێخراو (بەحری موهمەل) وەک (کێشی ١- موستەتیل ٢- مومتەد ٣- موتەوافیر ٤- موتتەرید ٥- موتتەئید ٦- مونسەرید ٧- مەقلووبی بەسیط).

ئەم دەریا پشتگوێخراوانە لەپاش شازدە دەریا باوەکان بەدووررودرێژی - بەپشتی خودا - دێن، بڕوانە ئەوێ و بازنە کێشییەکان.

**٧- (بەحرە نوێکان: بحور مولّدة: بحور جديدة: دەریا دەستکردەکان):**

ئەم جۆرە دەریایە دوو جۆرن:

١- هەر کاتێ شاعیرێ توانی دەریایەکی پشتگوێخراو بەکار بهێنێ و هۆنراوی پێ بهۆنێتەوە، ئیتر ئەو دەریایە دەبێ بەدەریای نوێ. وەک ئەم هۆنراوە کە لە بەحری موستطیلە، کە بریتییە لە (مفاعیلن فعولن × ٤) کە دەق پێچەوانەی طویلە:

لَقَدْ هَاجَ اَشْتِيَاقِي غَرِيرُ الطَّرْفِ أَحْوَرْ

أُدِيرَ الصُّدْغُ مِنْهُ على مِسْكٍ وَعَنْبَرْ

٢- چەند دەریا و کێشێکی تر هەن، ناچنەوە سەر بازنەکانی خەلیل، شاعیران خۆیان دایانهێناون، ئەم جۆرەیش بەپشتی خودا لەپاش بەحرە باو و ناباوەکانەوە دێ. لەم جۆرەیە ئەم جۆرە داهێنراوانەی ناودارن بەحەوت هونەرەکان:

١- بەحری سیلسیلە ٢- دوبیت ٣- قوما ٤- مووەششەحات ٥- زەجەل ٦- الکان وکان ٧- الموالي.

هەروا ئەم جۆرە هۆنراوانەی تریش:

١- الأبوذية ٢- الرباعي ٣- العتابة

٨- (بحور الشعر: دەریاکانی شیعر):

هەر چامەیێ، یا هەر پارچە و غەزەلێ، یا هەر هۆنراوێ، کە کێشی هەبێ، سەر بەبەحرێکە، یا سەر بەکێشێکە و بەپێی ئەو بەحر و کێشە دەگوترێ، وە ناوی خۆی لەو بەحرە وەردەگرێ، بەوێنە: قەصیدەی بوردییە لە بەحری بەسیطە.

ئەوەی کە لێرەدا حەز دەکەم بیدرکێنم لەم تێبینییەدا تۆماری دەکەم.

تێبینی: کێشی هۆنراو بەپێی زمان و تایبەتمەندییەکانی دەگۆڕێ، لەبەر ئەوە خۆ بەستنەوە بەچەند کێشێکی تایبەتەوە هەتا هەتایە ڕاست نییە، چونکە بەری بەرهەمی هەستیار تەسک دەکاتەوە، لە هەمان کاتا شت بەبێ سیستەم و ڕێسا و یاسایش سەر دەکێشێ بۆ گەڕەلاوژێ و پاشاگەردانی، ئەوەیش نابێ، کەواتە:

وا باشە دەریای نوێی زۆر دابهێنرێ، وە یاسا و ڕێسا و ئاوا و دەستوورەکانیان زەبت بکرێ و بلاو بکرێنەوە، چەند هەستیارێ شتی وایان کردووە، بەزۆر شێوە، وەک ئەم دەریا نوێیانەی کە باسمان کردن، وەک موستەزاد، وەک تێکەڵکردنی دەریاکان، وەک زیادکردنی پێیەک یا پتر لە بەحرێ، یا زیادکردنی بڕگەیێ لە پێیەکا، لە هەندێ کێشا، بۆ نموونە: نازک مەلائیکە پێی (فاعِلُ = - ب ب) لە هەندێ چامەی بەحری موتەدارەکا زیاد کردووە، وەک دەڵێ:

كَانَ المغربُ لَوْنَ ذَبيحٍ

وَالأفق كَآبةَ مجروحٍ

کە ئەمە کێشەکەیەتی:

| کانل | مغرب | لَوْنَدَ | بیحی |
| --- | --- | --- | --- |
| فعلن | فاعِلُ | فاعل | فعلن |
| - - | - ب ب | - ب ب | - - |
| وَلأفُ | قَكَاَ | بَتُحَجْ | روحي |
| فعلن | فَعِلُنْ | فَعِلُنْ | فَعْلُنْ |
| - - | ب ب - | ب ب - | - - |

خودا یار بێ ئەم بیردۆزەیە لە جێگەی خۆیدا بەجوانی طەرح دەکەین.

٩- (بەحری شەش پێیی، یا بەحری هەشت پێیی):

لە بنەڕەتدا ئەو کێشانەی کە لە بازنەکان دەردەهێنرێن، یا هەشت پێیین، یا شەش پێیی. شازدە دەریاکە پێنجیان هەشت تەفعیلەییین کە ئەمانەن، کە لە بازنەی یەکەم و بازنەی پێنجەم دەردەهێنرێن:

١- طەویل ٢- مەدید ٣- بەسیط ٤- موتەقارەب ٥- موتەدارەک

وە یازدەشیان هەشت پێیین، کە لە بازنەی دووەم و سێیەم و چوارەم پەیدا دەبن کە ئەمانەن:

١- وافیر ٢- کامیل ٣- هەزەج ٤- رەجەز ٥- رەمەل ٦- سەریع ٧- مونسەریح ٨- خەفیف ٩- موزاریع ١٠- موقتەزەب ١١- موجتەس.

(بڕوانە: بەیتی تام، بەیتی مەجزوء، بەیتی مەشطوور، بەیتی مەنهووک، بەیتی مووەحەد).

١٠- (ئەو بەحرانەی کە پێویستە مەجزووء بن):

(بڕ: بەیتی مەجزووء).

١١- (بەحری شەقیق): (- شەقیق).

١٥- (إِبْتِدَاء)

ڕۆڵی زیحاف و عیللە یەکێکە لەم چوار شتە:

١- ئیبتیدا، ئەو گۆڕانەیە کە دەگات بەیەکەم پێی دێڕ، بەلاَم لەناواخن و عەرووز و

زەربیدا ڕوو نادات، وەک ثەلم لە طەویلا و عەصب لە وافیردا و خەرم لە هەزەجدا. یەکەم پێی نیوەی دووەمیش لە شیعردا پێی دەگوترێ (ئیبتیدا = سەرەتا) = یەکەم پێی نەتی/٢.

٢- فەصل، ئەو گۆڕانەیە کە دەبێ لە عەرووزدا پەیڕەو بکرێ، وەک (مفاعلن) لە یەکەمی تەویلدا، کە پێویستە هەمیشە قەبز بکرێ، وەک (فَعِلُنْ = ب ب -) لە عەرووزی مەدیددا، کە دەبێ هەمیشە مەخبوون بێ، وەک نموونەی تری لەم بابەتە.

٣- ئیعتیماد: ئەو جۆرە گۆڕانەیە کە لە جوزئی پێش ضەربدا شیبهی واجبە، وەک کرتاندنی نوونی وەستاوی (فعولن) لەپێش ضەربی سێیەمی تەویلدا، کەوا باشە ئاوا بێ: (فعولن مفاعیلن فعولُ فعولُنْ). بۆیە پێی دەگوترێ ئیعتیماد، چونکە سەبەبی سووکی کۆتایی (فعولن) لەم شوێنەدا ئیعتیمادی کردۆتە سەر دوو وەتەدی کۆ، یەکێکیان وا لەپێشیەوە و ئەویتریان وا لەپاشیەوە. ئەم جۆرە ئیعتیمادە بەپێچەوانەی ئیعتیمادە لە بەحری موتەقارەبدا، چونکە لەودا ئیعتیماد ئەوەیە کە پێی پێش پێی سەروا سەلامەت بێ لە گۆڕان (ر: بەحری طەویل و بەحری موتەقارەب).

٤- غایە: ئەو جۆرە زیحافانەیە کە لە زەربدا نەگۆڕە، بەڵام لە ناواخندا بگۆڕە وەک قەطع و قەصر و کەسف و قەطف.

## ١٦- (مَبْدَء): (حسن المطلع) و(حسن المقطع):

١- سەرەتای دەستپێکردنی هۆنراو لە چامەدا، لەسەر شێوەیەکی جوانی دڵهەژێنی دڵگیر، وەک (امرئ القیس) سەردێری لامییەکەی بەم دێڕە شیعرە دەست پێ دەکات کە دەڵێ (طەویل):

قِفَا نَبْكِ مِنْ ذِكْرى حَبِيبٍ وَمَنْزِلِ... تاد (بڕ: مطلع)

چەندە سەرەتایەکی شیرین و جوانە، شاعیر لەسەر لوتکەی چیای بیرەوەری ڕاوەستاوە و، لە دەرگای گەنجینەی یادگارەکانی خۆی و یاری دەدا و، هەواری خاڵی لەیل دەلاوێنێتەوە و دەڵێ: (ئەی خەڵکە! ئەگەر خاوەن رەحم بن دێن لەگەڵ مندا دەگرین. یا چەند جوان و قەشەنگە ئەم سەرەتایەی ئەحمەد هەردی کە دەڵێ لە ڕازی تەنیاییدا (هەزەج):

بەسەرسامی لەسەر لوتکەی بڵندی گەنجی وەستاوم
شەریتی عەمری ڕابووردووم وەکو خەو دێتە بەرچاوم

٢- سەرەتای هەموو بەحرێکیش لەناو بازنەکەی خۆیدا ئەو وەتەدەیە، یا ئەو سەبەبەیە، کە بەحرەکە لەوێوە دەست پێ دەکا، کە پێی دەگوترێ: مبدء السیر، یا مبدء الفک وەک:




بڕوانە: (دائیرە عەروزییەکان = بازنە کێشییەکان). وەک دەگوترێ: مەبدەئی طەویل لە بازنەی جیاوازدا پێشی دەگوترێ: ئیبتدا.

١٧- (البدل):

١- گۆڕینی پیتی ڕەوی بەشێوەیێ جیابێ لە ئیکفاء، وەک (ڕەجەز):

يا قَبَّحَ اللهُ بَنِي السَّعْلاَتِ

عَمْراً وقَابوساً شِرَارَ النَّاتِ

لَيْسُوا بِأَخْيَارٍ ولاَ أكْيَاتِ

ئەوەتا هۆنەر (ناس) و (اكياس)ی کردووە بە(نات) و (اكيات) هەتا هاوسەروا بن لەگەڵ (سعلات)یدا، یا وەک ئەمە هەستیار قەلبی هەمزەی (غطاء) و (نداء) و (شفاء)ی کردووە بەیێ هەتا لەگەڵ (مَنَايا)دا لەم هۆنراوەدا هاوسەروا بن (وافر):

فَـذَاكَ الـهَمُّ لَيْـسَ لَهُ دَوَاءُ

سوَى المَوْتِ المنطّقِ بالمَنَايا

بەڵام ئەم شیعرەی موفتی زەهاوی - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - لەم بابەتە نییە کە دەڵێ:

گەر دەڵێی چییە ئەو کێرە سیسە

پێی باوەڕ مەکە ئەلفی تەئنیثە!

ئەمە لە چەشنی ئەو بابەتەیە کە لەم وشانەدا باسمان کرد: (حرف الراء، حرف الذال) هەروا ئەم شیعرەی ئەسیرییش لەم بابەتی بەدەلە نییە کە دەڵێ (هەزەج):

کەسێ میللەت پەرستی کا مەلوول و مات و غەمناکە

زەعیف و چاوی نمناکە، چ ئەندامی وەکو داڵە

مەبەست لە (داڵ) پیتی دالە، نەک داڵی باڵندە، بۆیە شاعیر (دال)ی کردووە بە(داڵ) هەتا هاوسەروا بێ لەگەڵ (زاڵە) و (ئاڵە) و (حاڵە)دا، لە دێڕە هۆنراوەکانی تردا، ئەمیش هەر لەو بابەتەیە کە لامی لەڕ و لامی قەڵەو، لە سەروادا هاوسانن و بەرابەری یەکتری دەکەن و دروستە بێن بەهاوڕەوی بۆ یەکتر.

٢- (عَلَى البَدَلِ) دەگوترێ ئەم دوو پیتە لەسەر شێوەی بەدەل نۆرەکرتێ دەکەن، یا دەبن بەڕەوی، یا شتێ تری لەم بابەتە، مەبەست لە بەدەل نۆرە و موعاقەبەیە (بڕ: البری = بڕوانە: البریْ).

٣- (إبدال وتبديل) ابدال يا تبديل واته: گۆڕین و گۆڕینەوە، وەک گۆڕینی هەمزە بەواو، یا بەیێ، وەک عطاءاً بکرێ بەعَطَایا، وەک گۆڕینی هەمزەی وەصڵ بەهەمزەی قەطع، یا بەپێچەوانەوە (بڕ: ناچارییەکان/ ١٠١، ١٠٢) یا گۆڕینی (أل)ی شەمسی، کە لامەکەی دەگۆڕێ بەپیتێ لە چەشنی پیتەکەی پاشی.

١٨- (البریئ)

واتە: ساخ، ئێمە زۆرینەی کات، ئەو بابەتانەی کە پەیوەندییان بەچەند شوێنێکەوە هەیە، لە شوێنی یەکەمیاندا باسیان دەکەین و لە جێگەکانی دواوە ئاماژەی بۆ دەکەینەوە. جا لەسەر ئەم بنیاتە دەڵێین:

سەبەبی سووک لە دێڕە شیعردا، یا بەرابەری و مقابلە لەگەڵ سەبەبێکی سووکی تردا دەکا، یا نایکا، بەوێنە (فا)ی (فاعلن) لە سەرەتای دێڕەوە بەرابەری لەگەڵ سەبەبێکی تردا ناکا، بەڵام (عیلن) لە (مَفَاعیلن)دا، دوو سەبەبی سووکن، لە هەندێ کێشدا نۆرەکرتێ و موعاقەبە و تەقابولیان لە نێواندا هەیە. قسەمان لەو جۆرە دوو سەبەبەیە کە بەرابەری و نۆرەکرتێیان لە نێواندا هەیە، جا ئەو دوو سەبەبانەی کە بەرابەری و نۆرەکرتێیان لە نێواندا هەیە یا وان لە یەک جوزئدا، یا وان لە دوو جوزئدا، مەبەست لە جوزء تەفعیلەیە، واتە: پێ. (بڕ: ١٨٢ - المعاقبة).

جا ئەوانەی کە وان لە یەک پێدا، یا وان بەیەکەوە، وەک (عیلن) لە (مفاعیلن)دا و (مستف - -) لە (مستفعلن)دا یا بەیەکەوە نین، وەک (فا) و (تن) لە سەرەتا و کۆتایی (فاعلاتن)دا.

یەکەم: ئەوانەی کە وان لە یەک پێ دا و بەیەکەوەن دەبن بەم دوو جۆرەوە:

آ- سقوطی هەردووکیان دروست نییە، هەروەک ثبوتی هەردووکیان دروست نییە، واتە: دروست نییە کە پیتی وەستاوی هەردوو سەبەبەکە پێکەوە بکرتێن، هەروەک دروست نییە هەردووکیان بەیەکەوە بچەسپێن و بمێنن، بەڵکو پێویستە هی یەکێکیان بکرتێ و هی ئەویتریان بمێنێ، بەپێی یاسای موعاقەبە و نۆرە سەرە، ئەم جۆرە پێی دەگوترێ (مراقبە: تراقب: چاوەنواڕی: چاودێری) کە بریتییە لە دوو سەبەبی سووکی تەنیشت یەکتر لە یەک (پێ)دا، کە بەنۆرە زیحاف بکرتێن، ئەمەیش تەنیا لە دوو بەحردا ڕوو دەدا، وەک (عیلن) لە (مفاعیلن)ی موضاریعدا، کە دەبێ یا مەقبوض بێ ئاوا (مَفَاعِلن) یا مەکفوف بێ ئاوا (مَفَاعِیلُ) بەبێ تەنوین، وە نابێ (مَفَاعِیلُنْ) وەک خۆی بمێنێ بەبێ قەبز و کەف، یا

پێکەوە قەبز و کەف بکرێ و ببێ بە(مَفَاعِل ب – ب ب). وەک (مَفْعُو – –) لە (مفعولات – – [illegible]ی بێ تەنوینی موقتەزەبدا، کە دەبێ یا مەخبوون بێ، ئاوا (مَفَاعِیل ب – – ب) بەبێ تەنوین، یا مطوی بێ ئاوا (فاعِلاَت – ب – ب) بەبێ تەنوین، بەلاَم دروست نییە کە هەردوو سەبەبەکان بەساخی بمێنن ئاوا (مَفْعُولاَتُ – – – ب) یان هەردووکیان بکرتێن پێکەوە و ببێ بە(فَعُلاَت ب ب – ب) = (فعلات).

ب– جۆری دووەم: دروستە کە هەردوو سەبەبەکە پێکەوە بمێنن، بەلاَم دروست نییە کە هەردوو پیتە وەستاوەکانیان بەیەکەوە بکرتێن، بەلاَم دروستە وەستاوی یەکێکیان بەنۆرە بکرتێن. وەک (شیل[illegible]ە طەویل و هەزەج و وافری مەعصووبدا، کە دروستە (مفاعیلن) لەم بەحرانەدا قە[illegible] یا [illegible]ەقل بکرێ و ببێ بە(مفاعلن ب – ب –) وە دروستیشە کەف یا نەقص بکرێ وە ببێ بە(مفاعیل = ب – – ب) بەبێ تەنوین، بەلاَم دروست نییە عەقل و نەقص بکرێ و ببێ بە(مَفَاعِلُ ب – ب ب) بەبێ تەنوین و بەبێ یێ. وەک (مُسْتَفْ) لە کامیلی موضمەردا کە دروستە وەک خۆی بمێنێ ئاوا (مستفعلن) وە دروستیشە خەبن بکرێ و ببێ بە(مفاعلن) یا طەی بکرێ و ببێ بە(مفتعلن) بەلاَم دروست نییە کە خەبن و طەی بەیەکەوە بکرێ و ببێ بە(فَعِلَتُنْ = ب ب ب –) کە مەخبوولە. وەک (مُسْتَفْعِلُنْ)ی ضەرب لە (مونسەریح)دا، کە دروستە خەبن یا طيّ بکرێ، بەلاَم دروست نییە کە خەبل بکرێ، چونکە پێشی وەتەدی بلاَوە ئاوا (مفعو لات مستفعلن) جا ئەگەر خەبل بکرێ دەبێ بە(مفعولاتُ فعلتن – – – ب ب ب ب –) پێنج پیتی بزواو بەسەر یەکەوە کۆ دەبنەوە، شتی وایش نادروستە!

پوختەی ئەم جۆرەیان ئاوایە: (بێ بزوێنی هەردوو سەبەبەکان یا هەردوو دەمێنن، یا بەنۆرە و سەرە یەکێکیان دەکرتێ، بەلاَم هەردووکیان دروست نییە بەیەکەوە بکرتێن. ئەم جۆرە بەشێکە لە موعاقەبە).

دووەم: ئەوانەی کە وان لە یەک پێدا، بەلاَم بەیەکەوە نین، بەڵکو یەکێکیان وا لە سەرەتای جوزئەکەوە و ئەویتریان وا لە کۆتایەوە، ئەمانە لەگەڵ خۆیانا موعاقەبە و نۆرەکرتێ ناکەن، بەڵکو ئەوەی پێشەوەیان لەگەڵ سەبەبی سووکی پێش خۆیەوە، نۆرەکرتێ دەکا، ئەوەی دواشەوە لەگەڵ سەبەبی سووکی پاش خۆیەوە، کەوا لە پێیەکی ترا، نۆرەکرتێ (معاقبە) دەکا. وەک (فاعلاتن فاعلاتن فاعلن) و (مستفع لُنْ فاعِلاَتن)

سێیەم: ئەوانەی کە وان لە دوو جوزئدا، دوو جۆرن:

آ- یەک سەبەبی سووکی واتیادا، وەک (فاعلن).

ب- دوو سەبەبی سووک کە لە نێوانیاندا وەتەدێ هەبێ، وەک (فاعِلاَتُنْ) و (مُستَفْعِ لُنْ).

چوارەم: چۆنێتیی کۆبوونەوەی دوو سەبەبی خەفیف لەم دوو جۆرەدا کە موعاقەبەیان لە نێواندا بێ، ئاوا دەبێ:

آ- جوزئێ کە دوو سەبەبی تیا بێ بکەوێتە پێش پێیەکەوە، کە لە سەرەتاکەیەوە یەک سەبەبی تیا بێ، وەک (فَاعِلاَتُنْ فَاعِلُنْ) لە مەدیددا، کە لە نێوانی نوونی (فاعلاتن) و ئەلفی (فاعلن)دا موعاقەبەی بەبێ موراقەبە هەیە.

ب- جوزئێ کە دوو سەبەبی سووکی تیا بێ و بکەوێتە پێش یا پاش جوزئێکەوە کە دوو سەبەبی سووکی تیا بێ، یا بکەوێتە نێوانی دوو جوزئی دوو سەبەبییەوە. وەک: (مستفع لن فاعِلاَتن) و (فاعلاَتن. مستفع لُنْ) لە موجتەثدا، کە لە نێوانی کەفی (مستفعلن) و خەبنی (فاعِلاتن)دا و لە نێوانی کەفی (فاعلاتن) و خەبنی (مستفع لن)دا موعاقەبە هەیە. وەک موعاقەبەی نوونی (فاعلاتن) و سینی (مستفع لن) و موعاقەبەی نوون و ئەلفی (مستفع لن فاعلاتن) و موعاقەبەی نوون و ئەلفی (فاعلاَتن فاعلاتن) لە خەفیفدا. یا وەک معاقبەی صەدر و عجز و طەرەفەین لە (فاعلاتن فاَعلاتن فاعلاتن)دا، لە رەمەلدا.

موعاقەبە لەم بەحرانەدا هەیە: (١- رەمەل ٢- وافیر ٣- هەزەج ٤- خەفیف ٥- طویل ٦- موجتەث ٧- مەدید ٨- کامیلی موضمەر ٩- مونسەریح).

موراقەبە و موعاقەبە تەنیا لە جوزئی تەواودا - واتە - لە پێی تەواودا، ڕوو دەدەن و بەس.

جا لە پاش ئەم ڕوونکردنەوەیە دەڵێین:

١- ئەگەر بێ بزوێنی سەبەبی پێشەوە، بەپێی یاسای نۆرەکرتێ، کرتاو بێ بزوێنی سەبەبی پاشی ما، چ هەردووکیان لە یەک جوزئدا بن، وە چ لە دوو جوزئدا بن، بەم جۆرە زیحافە دەگوترێ، موعاقەبەی عەجز، واتە: پاشەکرتێ، چونکە کرتاوەکە لەگەڵ پاش خۆی نۆرەکرتێی کردووە، وەک (مَفَاعِلن) لە (مفاعیلن)دا، وەک (فاعِلاَت) لە (فاعلاَتُ فاعلن)دا.

٢- ئەگەر بەپێچەوانەوە بوو، پێی دەگوترێ: موعاقەبەی صەدر، واتە: (پێشەنۆرە: پێشەکرتێ) چونکە کرتاوەکە لەگەڵ پێش خۆی نۆرەکرتێ دەکات، وەک (مَفَاعِيلُ) لە (مَفَاعِيلن)دا، وەک (فَعِلُن) لە (فاعلاتن فَعِلُنْ)دا.

٣- ئەگەر پێیەک دوو سەبەبی سووکی تیادا بوو، وە بەیەکێشەوە نەبوون، وە بەپێی یاسای موعاقەبە و نۆرەکرتێ سەبەبی یەکەمی لەگەڵ سەبەبی پێش خۆی و سەبەبی دووەمی لەگەڵ سەبەبی پاش خۆی، نۆرەکرتێیان کرد، وەک (فَعِلاَتُ) بەبێ تەنوین لە (فاعلاتن فَعِلاَتُ فَاعِلاَتُنْ)دا، بەم جۆرە زیحافە دەگوترێ: موعاقەبەی طەرەفەین، واتە: دوو سەرە نۆرە!.

٤- جا ئەو جوزئەی لەم موعاقەبەیە ڕزگاری ببێ پێی دەگوترێ: (بەریء: ساخ: ساخلەم: ڕزگار) وەک (فاعلن) لە سەرەتای بەیتەوە، چونکە سەبەبی تر لە پێشیەوە نییە، کە نۆرەکرتێی لەگەڵ بکا و تەنانەت ئەگەر ئەلفەکەیشی لە سەرەتای دێڕەوە بکرتێ، پێی دەگوترێ خەبن، نەک موعاقەبە وەک نوونی (فَعولُنْ) لە (فَعولُنْ مَفَاعِيلُنْ) و (فَعولُنْ فَعولُنْ)دا، چونکە پێش و پاشی وەتەدە. بەنموونە لەم هۆنراوەدا (رەمەل):

إنَّ سَعْداً بَطَلٌ مُمَارِسٌ
صَابِرٌ مُحْتَسِبٌ لِمَا أصَابَهْ
فَاعِلاَتن فَعِلاَتُ فَاعِلن
فَاعِلاَتُنْ فَعِلاَتُ فَاعِلاَتُنْ

ئەلفی (فاعلاتن)ی سەری دێڕ بەرییە لە موراقەبە و موعاقەبە، هەروا نوونەکەیشی، چونکە ئەم پێیە دەبێ سالم بێ و نوونەکەی بمێنێ، لەبەر ئەوەی کە سەبەبی سووکی پێیەکەی پاشی موعاقەبەی کردووە لەگەڵیدا، (فَعِلاَتُ ب ب – ب)یش لە ناوەڕاستی هەردوو نیوە دێڕەکانیدا موعاقەبەی طەرەفەینیان وا تیادا.

بێ بزوێنی سەبەب، کە بەری بوو لە موعاقەبە بکرتێ و نەکرتێ هەر بەرییە لە موعاقەبە، وە (بەری) لە هەموو دەریاکانا ڕوو دەدا.

٥- ئەگەر دوو سەبەبی سووک لە یەک جوزئدا کۆبوونەوە، وە بڕیارەکەیان جیاواز بوو لە بڕیاری معاقبە و مراقبە، ئەوە موکانەفەیە، لەم دەریایانەدا ڕوو دەدا: لە سەریع و مونسەریح و ڕەجەز و بەسیت. موکانەفەیش – ڕێک وەک موراقەبە و موعاقەبە – تەنیا دەچێتە سەر پێی تەواو (جوزئی کامیل). لە (مستفعلن)ی سەرەتای دێڕ و سەرەتای نیوە

دێڕی دووەمدا، لە دەریای مونسەریحدا، موکانەفە هەیە، چونکە خەبن و طەی و خەبلی دروستە، هەروا (مستفعلن)ی ضەربیش، وە دروستیشە ئەم موستەفعیلانە لەم بەحرەدا بەساخی بمێنن و نە خەبن و نە طەی و نە خەبل بکرێن. وەک (مونسەریح):

| وَبَلَدٍ | مُتَشَابِهٍ | سَمْتُهُ | قَطْعَهُ | رَجُلٌ عَلى | جَمَلِه |
|---|---|---|---|---|---|
| فعلاتن | فعلاتُ | مستفعلن | فعلتن | فَعِلاَتُ | مفتعلن |
| ب ب ب- | ب ب-ب | --ب- | ب ب ب- | ب ب-ب | -ب ب- |

هەروا هەموو (مستفعلن)ێ لە بەحری سەریع و رەجەز و بەسیتدا خەبن و طەی و خەبلی دروستە، وە دروستیشە بەساخی بمێنێ، نە خەبن بکرێ، نە طەی، نە خەبل.

نموونەی پێشەکرتێ (معاقبەی صەدر) لە کوردیدا، وەفایی - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - دەفەرمووێ (رەمەل):

بۆ لەبی جانان - بەچاوت - من ئەوا بوومە کەباب

بۆ لەبی جا + نانبەچاوت + من ئەوا بوو + مە کەباب

فاعلاتن + فاعلا تن + فاعلا تن + فعلن

- ب -- + - ب -- + - ب -- + ب ب -

## ١٩- (بسیط):

دەریایەکە لە شازدە دەریاکەی خەلیل - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - بۆ (البحور البسیطة) بڕوانە: (١٤/١ = البحور البسیطة...) بۆ (مخلّع البسیط) بڕوانە (مخلّع البسیط) بۆ (حەزمی مونبەسیط) بڕوانە: (٥٦ - الحزم).

## ٢٠- (عروض البَلَد)

جۆرە بەحرێکە لە بەحرە تازەکان، خوا یار بێ لەوێ قسەی تەواوی لێ دەکەین.

## ٢١- (البَنْد)

کێشێکی تریەییە، لە کێشە نوێکاندا - خوا یار بێ - باسی دێ.

## ٢٢- (البیت)

بەیت: دێڕ، بیتُ الشعر: دێڕە هۆنراو،: دێڕە هەڵبەست: دێڕە شیعر.

پێناسەی بەیت: بریتییە لە دوو لەتە دێڕ، کە لە چەند پێیەک پێکهاتبن، کە بەسەروا کۆتایی دێ، وە بەمەبەستی شیعر هۆنرا بێ.

**١- (زاراوەکانی ناو دێڕە هۆنراو):**

١- میصراع = میسراع = شەطر = لەت = نیوە = لەتە دێڕ. دەگوترێ میسراعی یەکەم = شەطری یەکەم = نیوەی یەکەم = نیوە دێڕی یەکەم = لەتی یەکەم = لەتە دێڕی یەکەم.
هەروا دەگوترێ: میسراعی دووەم = شەتری دووەم = نیوەی دووەم = نیوە دێڕی دووەم = لەتی دووەم = لەتە دێڕی دووەم.

٢- صەدر (سەدر): نیوە دێڕی یەکەم لە دێڕ (سینگ = بەرۆک).

٣- صەدر: پێی یەکەم لە لەتی یەکەم = پێی یەکەم لە صەدر.

٤- عەجز = عەجوز: لەتی دووەمی دێڕ = شەتری دووەم = دوایی = کلکە.

٥- ابتداء (ئیبتیدا = سەرەتا) پێی یەکەمی لەتی دووەم.

٦- عەرووز: دوا پێی لەتی یەکەم.

٧- زەرب: دوا پێی لەتی دووەم.

٨- حەشو: ناواخن: بریتییە لە سەرجەمی پێیەکانی دێڕ بێجگە لە پێی عەرووز و زەرب، گوتراویشە: حەشو بریتییە لە پێیەکانی نێوان سەدر و عەرووز و نێوان إبتدا و ضرب.

٩- جوزء: پارچە: بریتییە لە یەکە یەکەی ئەو پێیانە کە دێڕیان لێ پێک دێ.

١٠- پێ: تەفعیلە: بڕوانە (أصول التفاعیل).

١١- سەروا (بڕ: القافیة).

١٢- پیتی ڕەوی: پیتێکی تایبەتە لە پیتەکانی سەروا، هۆی سەرەکی هاوئاوازی و هاوئاهەنگی کۆتایی دێڕەکانی هۆنراوە (بڕ: پیتەکانی سەروا).
جا وا لە دواوە هێلکاری بەیتێ دەنووسین، هەر بەشەی ناوی خۆی لێ دەنێین، وە بەژمارە چەندیی پێ و تەفعیلەکانی دیاری دەکەین، تەفعیلە و پێ و جوزء و پارچە لەم شوێنەدا چوار ناون بۆ یەک شت، جارێ با ناوەکانی ئەجزای بەیت بنووسین.

**٢- لەقەب و ناوەکانی جوزنەکان و بەیت:**

بەجوزء و عەرووز و زەرب دەگوترێ: سالم، صەحیح، مەوفوور، وەکی تریش چەند زیحاف و عیللە تووشی پێ یا بەیت بن بەوانیشەوە ناو دەبرێن. وەک: خەبن و تەی و

ئیضمار و عەصب و قەبز و عەقل و وەقص و کەف و خەبل و شەکل و خەزل و جەزل و نەقص و حذف و خەرم و خەرب و ثرم و شتر و بتر... بەنموونە دەگوترێ: پێی مەقطوع، تفعلەی مخبونە، بەیتی مەخبون، یا مطوی، مشکول، مخبول، موقوص، مضمر، محذوف، مجزوء، مخروم، أخرم، أخرب، أثرم، آشتر، ابتر، مقطوف، مقصور، مشعّث، أحذ، أصلم، مکسوف، موقوف، معصوب، مکفوف... تاد. بڕوانە ئەم زاراوانە لە شوێنی خۆیانا. هەروا دەگوترێ: عەرووزی مەقطوع، مەخبون، مطوی... تاد، یا ضەربی صەحیح، سالم، مخبون... تاد.

سەدر= شەتری یەکەم= میسراعی یەکەم= لەتی دووەم= نیوە دێری یەکەم     پیتەکانی سەروا

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ژمارەی پێ / ژمارە پیتەکانی | ١- دَ رُ و نيِ (٥) | ٢- لِدارِشْبشَا (٧) | ٣- رَ زُ و رِ ي (٥) | ٤- وَ بَ رْ د هِي (٦) | ب ر د هـ ی |
| | سەدر | حەشو=ناواخن (حەشو) | حەشو | عەرووز | س ر د هـ ی |
| | ژمارەی پێ / ژمارە پیتەکانی | ٥- کَفَرْ صِْ (٥) | ٦- سَکِنْ گَرْمِنْ (٥) | ٧- إلِی آ (٥) | ٨- وسَرْدهِيَ (٦) سەروا |
| | | ئیبتیدا= سەردتا | حەشو | حەشو | ضەرب |

حەشو

عەجز=کلکە = شەتری یەکەم= میسراعی یەکەم= لەتی یەکەم = نیوە دێری یەکەم

(هێلکاری دێرێکی هەشت پێیی وافیی سەروادار لە دەریای تەویل لە جۆری شیعری مطلق)

٣- جۆرەکانی بەیت:

بەیت جۆری زۆرە:

شیعر ئەگەر یەک دێڕ بێ پێی دەگوترێ: (یتیم: تاقانە: تاک: فەرد) ئەگەر دوو دێڕ بێ، یا سێ دێڕ بێ پێی دەگوترێ: (نُتْفَة: دووانە: بەرکوڵ) هەندێ جۆری دوو شیعری پێی دەگوترێ: (چوارینە: روباعی) لە سێ زیاتر تا دەبێ بەچامە، پێی دەگوترێ: (قطعة: پارچە). دروستتر ئەوەیە: چامە دە شیعرە، یا زیاتر کە هەموو لە یەک جۆری یەک بەحر بن، هەندێ دەڵێن: ئەگەر هۆنراو لە شەش تێپەڕ بکا بەهەمان مەرج چامەیە، هەندێ تر دەڵێن: لە هەشت.

غەزەل یا چامە مەرج نییە تاک بێ، وا دەبێ دێڕەکانی جووت دەبن وەک: دە، بیست. وا باوە لە ئاخر دێری چامەدا هەستیار نازناوی خۆی دەڵێ، جاری وایش دەبێ لە ناو چامەکەدا ناوی شاعیرەکەی تیادا نییە.

هۆنراوە بەیاسای غەزەل بێ، هەر ئەوەندە پێویستە کە ئاخری نیوە دێری یەکەم و ئاخری نیوە دێری دووەم، لە گشت شیعرەکانی غەزەلەکەدا یەک بن.

هەستیار دەڵێ:

دڵم عاشق بەچاوی جوانت

سەرگەردانە بۆ تاتای زوڵفانت

لە چامەدا یەکێتیی سەروا مەرجە، بەڵام یەکێتیی بابەت مەرج نییە، وەک گشت چامەکانی دیوانی مەحوی و نالی و معلقاتی سبعە.

(بەیت = دێڕ) بەزۆر ئیعتیبار جۆری جیاجیای هەیە، وەک:

١- بەیتی تام (دێڕی تەواو): ئەوەیە کە هەموو جوزئەکانی، بەپێی بەحرەکەی، لە بازنەی کێشی - دائیرەی عەرووزی - خۆیدا چەند بێ و چۆن بێ، ئاوابێ بەبێ زیاد و کەمی، نابێ مەجزووء و مەشطوور و مەنهووک بێ، هەروا تووشی زیحاف و عیللە و گۆڕانیش نەبوو بێ، وەک ئەم شیعرە کە شەش پێی تەواوە، وە هەر شەش پێیەکەیشی ساخن و ڕزگارن لە هەموو جۆرە گۆڕانێ (کامیل):

وَإِذَا صَحَوْتُ فَمَا أُقَصِّرُ عَنْ نَدَىً

وَكَمَا عَلِمْتِ شَمَائِلِي وَتَكَرُّمِي

ئەم دێرە کێشەکەی شەش (متفاعلن ب ب - ب -) بەبێ زیاد و کەمی.

٢- بەڵام ئەگەر ژمارەی پێیەکانی ڕێک بەقەد ژمارەی پێیەکانی دەریاکەی خۆی بوو لە بازنەکەیدا، بەڵام هەندێ لە پێیەکانی تووشی هەندێ گۆڕان بووبوون، ئەوە پێی دەڵێن: (بەیتی وافی: دێڕی تەواوکار) وەک سالم - ڕەحمەتی لێ بێ - دەفەرمووێ (ڕەمەل):

ئەلوەداع ئەی موڵکی بابان ئەلوەداع

ئەلوەداع ئەی ئەهلی ئیمان ئەلوەداع

ڕەمەل خۆی شەش (فاعلاتن)ە، ئەمیش وایە، بەڵام عەرووز و زەربەکەی تووشی عیللەتی حەذف بوون کە عیللەتێکی نەگۆڕە، لە (فاعلاتن)ەوە بوون بە(فاعلن).

هەندێ دەڵێن: فەرقی تام و وافی نییە، هەندێ تر دەڵێن: فەرقی تام و وافی ئەوەیە: تام یا هەر گۆڕانی تیادا نییە، یا ئەگەر گۆڕانیشی تیادا بێ، گۆڕانەکە بگۆڕە نەگۆڕ نییە، بەڵام وافی ئەوەیە کە گۆڕانی نەگۆڕی تیادا بێ.

بەیتی تام: وەک زەربی یەکەمی کامیل و زەربی یەکەمی ڕەجەز و زەربی یەکەمی خەفیف و زەربی یەکەمی موتەدارەک.

بەیتی وافیش وەک: هەرسێ زەربەکەی طەویل و زەربی یەکەم و دووەمی بەسیت و یەکەمی وافیر و دووەم و سێیەم و چوارەم و پێنجەمی کامیل و دووەمی ڕەجەز و یەکەم و دووەم و سێیەمی ڕەمەل و یەکەم و دووەم و سێیەم و چوارەم و پێنجەمی سەریع و یەکەم و دووەمی مونسەریح و دووەم و سێیەمی خەفیف و دووەم و سێیەم و چوارەمی موتەقارەب.

تام و وافی ئەگەر لە نەنگی سناد ڕزگاربوون پێیان دەگوترێ: (بەئو و نەصب).

٣- (بەیتی مەجزووء): دێڕی پێکرتاو: ئەوەیە کە لە دێڕەکە پێی عەرووز و پێی زەرب کرتا بێ. کەواتە: ئەگەر بەیتەکە لە بازنەکەی خۆیدا لە شەش پێکهاتبێ، لە پاش پێکرتێ (جەزء) دەبێ بەچوار پێ، پێی دووەمی دەبێ بەعەرووز و پێی چوارەمی دەبێ بەضەرب. پێکرتێ (جەزء) لە مەدید و هەزەج و موضاریع و موقتەضەب و موجتەثدا پێویستە، واتە: واجبە، لە طەویل و سەریع و مونسەریحدا نادروستە و قەدەغەیە، لە بەحرەکانی تردا دروستە، واتە: نە پێویستە و نە قەدەغەیە، کە ئەمانەن: بەسیط، وافیر، کامیل، ڕەجەز، ڕەمەل، خەفیف، موتەقارەب، موتەدارەک. مەجزووء لە دەریای شەش پێیی و هەشت پێییدا ڕوو دەدا، تاک و چامە و غەزەل و جۆرەکانی تری شیعری هەیە.

٤- (بەیتی مەشطور): دێڕی دوو کەرت: کەرتە دێڕ: ئەوەیە کە دێڕەکە نیوەی لێ فڕە بدرێ و نیوەی بمێنێ، لە پاش نیوەکرتێ (تشطیر: شەطرکردن) ئەگەر دێڕەکە لە بنچینەدا شەش پێ بێ، ئەوا سێ پێی دەمێنێ، پێی سێیەمی هەم عەرووزە و هەم زەربە، وەک (لەتکراوی رەجەز: مەشطوری رەجەز):

تَحِيَّةٌ كَالوَرْدِ في ٱلأَكْمَامِ

أَزْهَى مِنَ الصِّحَّةِ في ٱلأَجْسَامِ

يَسُوقُهَا شَوْقٌ إِلَيْكُمْ نَامِي

تَقْصُرُ عَنْهُ هِمَّةُ الأَقْلاَمِ

لەم هۆنراوەدا، پێیەکانی (أَكْمَامِي، أجسامي، كُمْ نَامِي، أَقْلاَمِي) کە دوا پێن، دەبن بەعەرووز و بەزەربیش. بەڵام ئەگەر دێڕەکە هەشت پێ بێ، ئەوە چوار پێی دەمێنێ، وەک: (دوو لەتی مەدید: مەشتووری مەدید):

وَٱلْمَنَايَا رَصَدٌ لِلْفَتَى حَيْثُ سَلَكْ

بەحری شەش پێیی لە پاش نیوەکرتێ (تەشطیر) بەمەشتووری ناکرێ بەمەجزووء. (بڕ: مشّطر) بۆ چۆنێتی نووسینی هۆنراوی مەشتور و منهوک بڕوانە: (نووسینی عەرووزی/ نموونەیێ/٣ - ٤).

٥- (بَيْتُ القَصِيد: شا دێڕ: شا بەیت): ئەو دێڕەیە لە چامەدا کە لە چاو دێڕەکانی تریدا، وەک پاشایان وایە، یا وەکو مانگ و ئەستێرە وان.

٦- (بەیتی مەنهووک): دێڕی هەڵتەکاو: سێیەکە دێڕ: ئەوەیە کە دێڕەکە لە بنەڕەتەوە هەڵتەکا بێ، لە سێ بەش دوو بەشی نەما بێ، لەبەر ئەوە تەنیا لە دەریای شەش پێییدا، بەیتی مەنهووک دروست دەبێ، چونکە بەحرەکان لە بنچینەدا، بەپێی بازنەکانیان، یا شەش پێیین، یا هەشت پێیی، دەی هەشت دابەش ناکرێ بەسەر سێدا، لە مەنهووکیشدا ڕێک وەک مەشتوور دوا پێ لە دێڕدا هەم عەرووزە و هەم ضەرب نموونەی بەیتی هەڵتەکاو وەک (مەنهووکی رەجەز):

إِنْ تُقْبِلُوا نُعَانِقُ أَوْ تُدْبِرُوا نُفَارِقِ

فِرَاقَ غَيْرِ وَامِقِ

یا وەک ئەم چامەیە:

إلهَنَا مَـا أعْـدَ لَكْ

مليـكَ كُلٍّ مَنْ مَلَكْ

لبَّيْكَ قَـدْ لَبَّيْكَ لَكْ

مَا خَابَ عبدٌ سَألَكْ

أنْتَ لَهُ حَيْثُ سَلَكْ

لَوْلاَك يا رَبِّي هَلَكْ

٧- (بەیتی مودەووەر: بەیتی موتەداخیل: بەیتی مودمەج: بەیتی مەوصوول: دێڕی تێهەڵکێش): ئەو جۆرە دێڕە هۆنراوەیە، کە وشەیێ لە ناوەڕاستیدا، دابەش دەبێ بەسەر هەردوو نیوەکەیدا، بەشێکی بەشێ دەبێ لە پێی عەرووز و ئەو بەشەکەی تری بەشێ دەبێ لە پێی زەرب. وەک (مەحوی - مضارعی مکفوفی ئەخرەبی محذوفی هەشتی):

گوێ کەڕ دەبێ لە غولغولی (سُبْحَانَ مَاعَرَفْ

نَاکَ)ەی عەنادیلی چەمەنستانی ئاسمان

مەبەست لە وشە، یا کەلیمە، لەم جێگەیەدا کەلیمەی نەحوی نییە، بەڵکو ئەوەیە کە بەعورف پێی دەگوترێ: وشە، یا کەلیمە، ئەمە لە هەموو بەحرێکا، ڕوو دەدا، هەتا لە هۆنراوی کێشی پەنجەیشدا شتی وا دروستە، گەلێ جار وەک هێما و نیشانەی بەیتی مودەووەر، لە نێوانی هەردوو لەتە دێڕەکەدا پیتی (م) دەنووسرێ، کە کورتکراوەی (مدوّر)ە وەک (معرّی - خەفیف):

خَفِّفِ الوَطْءَ مَا أظُنُّ أدِيمَ الـ (م) أرْضِ إلاَّ مِنْ هذهِ الأجْسَادِ

لە کوردیدا ئەگەر شتی وا بکرێ، هەقە (ت) بنووسرێ، کە کورتکراوەی (تێهەڵکێش) بێ، هەروەک لە زانستەکانی تردا، هێماکانیان بەهێمایەکی کوردی نووسیوە، بەوێنە لە عەرەبیدا ڕەمزی صەلاوات (ص)ە، ئەوەتا لە کوردیدا (د) کراوە بەنیشانەی دروود.

٨- (بەیتی سالم: بەیتی صەحیح): بەچەند واتایەک دێ:

آ- هەموو پێیەکانی ساخ بێ، بەهیچ جۆرێ گۆڕانکاری تیادا نەبێ، وەک شیعرەکەی بەیتی تام: (وَإذَا صَحَوْتَ... الخ).

ب- دەگوترێ: المسَدَّسُ السَّالِمُ، یان: اَلْمُثَمَّنُ السَّالِم، مەبەست موقابیلی مثمَّنِی مزاحف و مسدَّسی مزاحفە. وەک (بەسیطی هەشتی سالم):

يَـا حَـــارِ لاَ أُرْمِيَنْ منكم بــداهِيَةٍ    لَمْ يَلْقَهَا سُــــوقَةٌ قبــلي وَلا مَـلِكُ

مستفعلن، فاعلن، مستفعلن، فعِلُنْ    مستفعلن، فاعلن، مستفعلن فاعلن

موثەممەنی موزاحەفیش، وەک (بەسیتی هەشتی موزاحەف):

لَقَدْ مَضَتْ حِقَبٌ صُرُوفُهَا عَجَبٌ    فَأَحْدَثَتْ عِبَراً وَأَعْقَبَتْ دُوَلاَ

مَفَاعِلُنْ فَعِلُنْ مَفَاعِلُنْ فَعِـــلُنْ    مَفَاعِلُنْ فَعِلُنْ مَفَاعِلُنْ فَعِلُنْ

بڕوانە: (سالم، صحیح).

٩- (بەیتی مُصَرَّع): دێڕی سەروادار: ئەوەیە کە عەرووز و زەرب لە چامەدا، کێشیان لە یەکتر جیا بێ، بەڵام هەستیار لەسەر دێڕی چامەکەدا، بەهۆی لێ پترکردنەوە یا بەهۆی لێ کەمکردنەوە، کێشی یەکەم هۆنراوی چامەکە، بەنیازی تەصریع و سەرواداری، بباتە سەر کێش و سەروای ضەربی شیعرەکانی تری چامەکە، وە لە شیعرەکانی تری دوا سەرەتای چامەکەدا، کێشی عەرووزی دێڕەکان بباتەوە سەر کێشی ئاسایی خۆیان. بەوێنە دەریای درێژ یەک عەرووزی هەیە کە (مَفَاعِلُنْ)ی مەقبووزە، وە سێ ضەربی هەیە ئاوا:

١- (...... مفاعلن    ......... مفاعیلن)

٢- (...... مفاعلن    ......... مفاعلن)

٣- (...... مفاعلن    ......... فعولن)

جا کاتێ شاعیر چامەیێ لە نەوعی دووەمی ئەم بەحرە دابنێ، سەردێڕی چامەکەی پێویستی بەتەصریع نییە، چونکە عەرووز و زەربی ئەم نەوعەی طەویل یەک شتە کە (مفاعلن)ە، جا لە دووەمی تەویلا، ئەگەر عەرووز و زەرب هاوکێش و هاوسەروا بوون ئەوە تەقفییەیە (هاوسەروایی) یە، نەک تصریع، چونکە بەبێ دەسکاری کێش و سەروای عەرووز و زەرب وەک یەکن، وەک (تەویلی دووەم):

لِخَـــوْلَةَ أَطْلاَلٌ بِبَـــرْقَـــةِ ثَهْـــمَـــدِ

تَلُوحُ كَبَــاقِي الْوَشْمِ فـِي ظَاهِرِ الْيَـدِ

لە کوردیدا وەک (عبدالکریمی مودەڕڕیس - طەویل):

صەڵات و سەلامی حەق لەسەر ذاتی ئەنوەری

دڵ و ڕۆح و ڕوخساری سەراسەر مونەووەری

بەڵام کاتێ هەستیارێ ویستی هۆنراوێ، یا چامەیێ، لە جۆری یەکەمی تەویل، یا سێیەمی طەویل دابنێ، ئەوە وا باوە سەردێڕەکەی سەروادار (موصەررەع) بێ، لە جۆری یەکەمی تەویلدا، کە بەمەبەستی تەصریع، لە یەکەم شیعری هۆنراودا، (مفاعلن)ی عەرووز، بەزیادەی (ی)ێ بکرێ بە(مفاعیلن) لە هەمان کاتا عەرووز و زەرب هاوکێش و هاوسەروا بن، ئەوە پێی دەگوترێ تەصریع بەزیادە، وەک (تەویلی یەکەم):

وَرَوْضَــةِ وَرْدٍ حُفَّ بالسَّــوْسَنِ الغَضِّ
تَحلَّتْ بِلَوْنِ السَّـامِ وَالْذَّهَبِ المَحْضِ
رَأَيْتُ بِهَـا بَدراً عَلَى الأَرْضِ مَـاشِـيَـا
وَلَمْ أَرَ بَدْراً قَطُّ يَمْشي عَلَى الْارْضِ

ئەوەتا لەم دوو شیعرەدا، عەرووزی دێڕی یەکەم، لە (مفاعلن)ە، کراوە بە(مفاعیلن = سَنِلْغَضْضِي) بەڵام لە شیعرەکانی دوا ئەمەوە عەرووزەکە چووەتەوە سەر باری ئاسایی خۆی ئاوا (ضِمَاشِيا = مَفَاعِلُنْ × عَلَلأَرْضِي = مفاعيلن).

لە جۆری سێیەمی تەویلدا، زەرب (فعولن)ە، کە مەحذووفی (مفاعیلن)ە، وە عەرووز (مفاعلین)ی ساغە، جا کاتێ شاعیر لە سەردێڕدا عەرووزیش بکا بە(فعولن) و لە هەمان کاتدا عەرووز و زەرب هاوسەروا بن، بەوە دەگوترێ: تەصریع بەلێکەمکردن (بەنەقص) وەک:

أَيَقْــتُلُني دَائِي وَأَنْتَ طَبِـيـــبي
قَــرِيبٌ وَهَلْ مَنْ لأيُرى بِقَــرِيـبِ
وَسَاحِـبَـةٍ فَضْلَ الذُّيُول كَـأَنَـهَّـا
قَضِـيبٌ مِنَ الرَّيْحَانِ فَوْقَ كَثِيبِ

عەرووز و زەربی دێڕی یەکەم: (طبیبی × قریب = فعولن × فعولن) بەڵام شاعیر لە شیعری دووەمەوە چووەتە سەر عەرووزی زەربی سێیەم کە (مفاعلن)ە، چونکە عەرووز و زەربی شیعری دووەم ئاوایە:

(کأنها × کثیب = مفاعلن × فعولن).

تێبینی: ١- تەقفیە و تەصریع لە کوردیدا زۆرن وەک زۆربەی چامەکانی دیوانی نالی و دیوانی مەحوی، هەروا شیعری موزدەوەج هەمووی مقفایە، چ بەکوردی بێ، چ بەعەرەبی بێ.

٢- هەروا تەقفیە و تەصریع مەرج نییە کە هەر لە مەتلەع (سەردێڕ)ی چامەدا بن، بەڵکو دروستە تاقە دێڕێ تەقفیە یا تەصریع بکرێ، وەک ئەوە بەیتێ (تاقە دێڕێ) لە بەحری طەویل بێ عەرووز و زەربەکەی (مفاعیلن × مفاعیلن) بێ، یا (فعولن × فعولن) بێ، دیارە کە ئەوە تەصریعە، دەنا بەبێ تەصریع، عەرووزی تەویل لەسەر کێشی (مفاعیلن) و (فعولن) نابێ.

٣- هەروا دروستە لە یەک چامەدا چەند بەیتێکی مُقَفَّى، یا مصرَّع بن، بەڵام تەصریع لە غەیری هەڵاتگە (مەتلەع = سەردێڕ)ی چامەدا زۆر زۆر کەمە، لە چاو تەقفیەدا، بەڵام ئەگەر لە چامەیەکا چەند جارێ دووبارە ببنەوە، دانانرێ بەنەنگ، بەڵکو نیشانەی توانایی هەستیارە. بەنموونە أمرئ القيس لە چامەیەکا، ئەم دوو بەیتە موصەررەعەی گوتووە (طەویلی سێیەم):

ألاَ أنْعِمْ صَبَاحاً أيُّهَا الطَّلَلُ البَالي
وَهَلْ يَنْعُمَنْ مَنْ كَانَ فِي العُصُرِ الخَالي
ألاَ إنَّنِي بَالٍ عَلى جَمَلٍ بَالٍ
يَقُودُ بِنَا بَالٍ وَيَتْبَعُنَا بالِ

لە هەمان چامەدا عەرووزی دێڕەکانی تری (مفاعلن)ە، وەک:

وَلَوْ أنَّنِي أسْعى لأدْنَى (معيشة = مَفَاعلن)
كَفَانِي وَلَمْ أطْلُبْ قَلِيلٌ (مِنَ المالِ = مَفَاعِيلُنْ)

٤- لە چامەدا کاتێ شاعیر لە بابەتێکەوە دەگوێزێتەوە بۆ بابەتێکی تر، مافی هەیە تەصریع دووبارە بکاتەوە، چونکە ئەوە وەک هەڵاتگە (مطلع)ی چامەیەکی تازە وایە، بەتایبەتی ئەمە زۆر پەسەندە، کاتێ هۆنەر لە چیرۆکێکەوە دەگوێزێتەوە بۆ چیرۆکێکی تر.

٥- تەصریع لە هەموو بەحرێکا دەبێ، وەک (دووەمی بەسیط):

بَانَ الخَلِيطُ وَلَوْ طُوِّعْتُ مَابَانَا
وَقَطَّعُوا مِنْ حِبَالِ الْوَصْلِ أقْرَانَا
يَا أُمَّ عَمْرٍو جَزَاكِ اللهُ مَغْفِرَةً
رُدِّي عَلَيَّ فُؤَادِي كَالذي كَانَا

٦- دروستیشە چامە، یا شیعر تەصریع نەکرێ، وەک سەرەتای معلقەکەی حارثی الیشکری، کە دەڵێ (خەفیف):

آذَنَتْنَا بِبَیْنِهَا أَسْمَاءُ
رُبَّ ثَاوٍ یُمَلُّ مِنْهُ الثَّوَاءُ

چونکە ئەوەتا عەرووز (أسمائو = فالاتن)ی مشعّثة و ضەرب (هلثوائو = فاعلاتن)ی ساخە، بەڵام ئەم سەردێڕە مقفایە. دروستە تقفیە و تەصریعیش نەکرێ. وەک مەطڵەعی چامەیەکی احمد شوقی کە دەڵێ (دووەمی طەویل - عەرووز = مفاعلن، زەرب = فعولن):

هَنِیئاً أمیرَ المُؤْمِنِینَ فَانَّمَا    نَجَاتُكَ لِلدِّینِ الحَنیفِ نَجَاةُ

٧- تەصریع دروستە لە پاش هەموو حەوت بەیتێ دووبارە ببێتەوە، وەک بڵێی ئەوە سەرەتای چامەیەکی نوێ بێ، دروست نییە کە لە چامەدا هەموو بەیتێکی موصەرردع بێ، مەگەر لە رەجەزی موزدەوەجا (ر: المزدوج/٢).

٨- مصراع واتە: لاشیپانی دەرگا، مصراعین: دوو لاشیپانە، یا دوو لایی دەرگا، وەک بڵێی یەکەم دێڕی چامە دەرگایەکی دوولایی چامەکە بێ وایە.

١٠- (بەیتی موصمەت): ١- ئەوەتا عەرووز و زەربەکەی پیتی ڕەوییان جیاواز بێ، وەک (بەسیط):

إنْ تَوَسَّمْتَ مِنْ خُرْقَاءَ مُنْزِلَةً
مَاءَ الصَّبَابَةِ مِنْ عَیْنَیْكَ مَسْجُوُمُ

٢- موصمەت جۆرێکیشە لە جۆرەکانی سەروا، کە ئەوەیە دوو پیتی بێ بزوێن لە کۆتایی سەروادا بەیەکەوە بن، بەڵام بەمەرجێ کە پیتی ساغ بن و پیتی لین نەبن، وەک (پێنجەمی سەریع):

رَفَّعْتَ أزْیَالَ الحَفِیِّ وَأرْبَعْنْ
مَشِیِ حَیِیَّاتٍ كَأن لَمْ یَفْزَعْنْ

(بڕوانە: تخمیع) و (بەیتی مقفی) و (القافیە/ یەکەم/ پیتەکانی سەروا/ آ). لە کوردیدا وەک (خانی):

بێرێتە سەما و ساز و گۆڤەند    شیرین و شەکەر لەب و شەکەرخەند

١١- (بەیتی موزدەوەج): بڕوانە (المزدوج).

١٢- (بەیتی مُوَحَّد: دێڕی یەک پێیی): گەلێ جار دێڕی هەڵتەکاو (بەیتی مەنهووک) نیوەکرتێ (شەطر) دەکرێ پێی دەگوترێ: بەیتی مووەحەد: دێڕی یەک پێیی، کە بریتییە لە یەک پێ، ئەو تاقە پێیە دەبێ بەعەرووز و بەزەربیش، بەیتی وا حەشوی نییە. وەک بەحری رەجەز، کە شەش پێیە، بەنەهک دەبێ بەدوو پێ، بەشەتری مەنهووکەکەی یەک پێی دەمێنێ، وەک (رەجەز):

موسى المَطَرْ غَيْثُ بَكَرْ
ثُـمَّ انْهَـمَرْ خَيرُ البَشَرْ
فرعُ مُضَرْ

شیعری یەک پێیی لە کوردیدا، چی عەرووزی، چی پەنجەیی، هەر زۆر زۆرە، عەرووزی وەک (رەجەز):

وا هات بەهار * درەخت و دار * چەم و ڕووبار * چلوور و چنار * گوڵی سەلار * هەزار هەزار * شەونم لە زار * بەبێ ژمار * بەبێ دەوار * دەچنە هەوار * دەق وەکوو پار * هەوای بەهار دەمژن بەزار * وەک ماچی یار.

(نوری فارس)

١٣- (بەیتی موقەففا: دێڕی هاوسەروا): تەقفیە و هاوسەروایی ئەوەیە: کە بەبێ دەسکاری، عەرووز و زەرب پیتی ڕەوییان یەک بێ و هاوسەروایش بن، وەک (طەویل):

قِـفَـا نَبْكِ مِنْ ذِكْـرى حَـبِـيبٍ وَمَنْزِلِ
بِسِـقْطِ اللِّوى بَيْنَ الدُّخُـولِ فَـحَـوْمَلِ

جیاوازی نێوانی تەصریع و تقفیە ئەوەیە: لە تەصریعدا بەدەسکاری دەبرێتە سەر صیغەی زەرب، بەڵام لە تەقفیەدا، بەبێ دەسکاری عەرووز و زەرب چوون یەکن و هاوسەروان.

شیعری کێشی پەنجەی کوردی زۆربەی هاوسەروان، وەک شیعرەکانی مەولەوی و گۆران و... تاد. تەقفیە لە غەیری بەیتی یەکەمیشا، لە چامەدا زۆرە، وە دانانرێ بەنەنگ و کەمی (ر: بەیتی موصەررەع).

١٤- (بەیتی تەوئەم): (بڕ: تەوئەم لە پیتی تێدا).

تێبینی: پیتی (پێی) کوردی له حیسابی ئەبجەددا یەکسانە بەبێ. (ر: الأبجدية).
هەموو چامەیێ کە پیتی ڕەوییەکەی بێ بێ، پێی دەگوترێ: بائییە، ئەگەر دال بێ پێی دەگوترێ: دالییە، هەروا لامییە، یان میمییە، ئەوسا بەهۆی ناوی شاعیرەکەوە لە هی کەسێکی تر جیا دەکرێتەوە، وەک: لامیة العرب، لامیة امرئ القیس، دالیة النابغة. میمیة زهیر... هەروا... لە کوردیشا هەروای پێ دەبێژن.

پیتی پێی کوردی لە سەروادا کەمە کەمە دەکرێ بەهاوسەروای پیتی بێ، وەک نالی - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - دەفەرمووێ لە چامەیەکی بائیدا:

سەهم و نەصیبی ئەصلییە، بەحثی گیاه و گڵ نییە

تووتنە خەرجی سووتنە، موودنە ماچی لەب دەکا

لەومەی زەمان دەکەی کە بۆچ خوا ڕێی ڕاستیی دەوێ؟

غافڵی دەستی ڕاستی خۆت خزمەتی دەستی چەپ دەکا

لەم چامەیەدا بەریز ئەمانە سەروان: (سەبەب، ئەدەب، طەلەب، لەهەب، لەب، چەپ، طەرەب، گەپ). لە هەشت وشە، شەشی بێیە و دووی پێیە ڕەنگ بێ ئەمە جۆرێ بێ لە سەروای تێکەڵ (بر: ٢٧ - ثێ، حرف الذال) + (ئەنگەکانی سەروا - یەکەم/ ٤ - تێبینی). بۆ زانینی دروستبوونی قەصری کام پیت لە پیتەکانی ئەلفوبێ، بڕوانە دوا تێبینی پیتی ئەلف = ٦ - الف - ٣٦ - تێبینی).

باء لەو ناوانەی ئەلفوبێیە کە قەصری دروستە.

١٥- بەیتی موزاحەف: ئەوەیە کە هەموو پێیەکانی زیحافی تیا بێ وەک (تەویل):

سَمَاحَةَ ذَا وَبِرَّذَا وَ وَفَاءَ ذَا

وَنَائِلَ ذَا،إذَا صَحَا وَإذَا سَكَرْ

## سێیەم: پیتی تێ: حرف التَّاءِ

ت = ٤٠٠

### ٢٣- (تێ: التاء):

تێ جۆری زۆرە:

١- تێی خڕی نیشانەی مێیینە. بڕوانە: (ناچاریەکان/ ١٠٢/ تێبینی - ٧، ٨، ١٠). پیتی تاء لە شیعردا قەصر دەکرێ بڕوانە (ألف/ ٣٥ - تێبینی).

٢- تێی خڕی نیشانەی مێیینە لە کوردیدا دەبێ بەبزوێن بۆ پیتی سەرداری پێش خۆی. نالی - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - دەفەرمووێ:

ساقی! بەمەیی کۆنە لەسەر عادەتی نەوبە

بشکێنە بەیەک (نەوبە) دوو سەد ماتەمی (تەوبە)

٣- دەبێ بەتێی وەستاو و لەسەر شێوەی تێی درێژ دەنووسرێ و دەخوێنرێتەوە مەولەوی - ڕەحمەتی خوای گەورەی لێ بێ - دەفەرمووێ:

تێپەڕکەم ئەینا ڕێی گوزەر تەنگە

قافڵەم تا ڕۆژی (قیامەت) لەنگە

٤- هەر چامەیێ پیتی ڕەوییەکەی تێ بێ پێی دەگوترێ: چامەی تائی، یا تائیە (بڕ: چی پیتێ دەبێ بەرەوی «تێ»).

٥- طێ هەر کاتێ بەتێ نووسرا، حیسابی تێی بۆ دەکرێ نەک طێ، لە کاتی بوون بەرەوی و لە کاتی حیسابی جومەل و لە هەموو کاتێکی تردا.

### ٢٤- (بەیتی تەونەم):

دێڕی دووانە: تەوئەم - یا دووانە - ئەوەیە کە شێوەی بێژەکانی لە نووسیندا لە یەک بچن، بەڵام بەخاڵ - بەنوختە - لە یەک جیا بکرێنەوە، جا کاتێ ئاڵوگۆڕێ لە نوختەکانا بکرێ واتای وشەکان دەگۆڕێ. وەک:

(التخلّی) و (التجلّی) و (التحلّی) زۆربەی کات ئەم جۆرە وشانە لە پاڵ یەکدا دەبن. وەک (خەفیف):

زُيِّنَتْ زَيْنَبُ بِقَــدٍّ يَقُــدُّ

وَتَـلاَهُ وَيْـلاَهُ نَـهْــدُ يَـهُــدُّ

جُنْدُهَا جِيـدُهَا وَظَرْفٌ وَطَرْفٌ

تـاعِسٌ نَـاعِسٌ بِحَـدٍّ يَحُـدُّ

ئێستا ئەم دوو هەڵبەستە بەم شێوەیەی پێشەوە دەخوێنرێتەوە، بەڵام ئەگەر جێگۆڕکێ بەنوختەکانی بێژەکانی بکرێ، واتاکەی دەگۆڕێ، ئاوا:

زينَبُ زُيِّنَتْ تَقُــدُّ بِقَــدٍّ

وَيْلاهُ وَتَـلاَهُ يَـهُــدُّ نَـهْــدُ

جِـيـدُهَا جُندُهَا وَطَرْفٌ وَظَرْفٌ

نَاعِسٌ تَاعِسٌ يَحُـدُّ بِحَـدْ

بەهەمان کێش و سەروای پێشوو، تەنیا واتەکەی دەگۆڕێ.

٢٥ - (بەیتی تام):

بڕوانە (بەیتی -).

٢٦ - (تاء النفس):

تێی موتەکەللیم: ڕاناوی تاکی کەسی یەکەم، ئەم تێیە دەست دەدا بۆ پیتی ڕەوی یا نا؟ بڕوانە (چی پیتێ دەبێ بەڕەوی).

٢٧ - (المتند):

(بڕ: وتد). تا ء لەو ناوانەی ئەلفوبێیە کە قەصریان دروستە.

## چوارەم: پیتی ثێ: حرف الثاء

ث = ٥٠٠

**٢٧ - (ثێ):**

لە کوردیدا پیتی (ثێ) نییە، لە هەندێ زاراوەی ناباودا ڕەنگە هەبێ، مەحوی لە دیوانەکەیدا پارچەیەکی ثائی هەیە، شەش دێڕە، نالیش پارچەیەکی پێنج دێڕی لە دیوانەکەیدا هەیە، سەرواکانی هەردوو پارچەکان وشەی عەرەبین. پیتی ثا ء قەبوولّی قەصر دەکا (الف/ ٣٥ - تێبینی).

پیتی ثێ لەمەولا بەسێ بنووسرێ لە کوردیدا باشترە، مەگەر لە کاتێکا، کە هێما و ڕەمزی ژمارەیێ بێ، یا مەبەست لێی ئەوە بێ کە وشەکە لە بنەڕەتدا عەرەبییە، یا کوردی نییە، وەک: ثری: Three).

موفتی زەهاوی - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - لە دێڕە هۆنراوێکا، پیتی ثێی تەکرید کردووە و کردوویەتی بەهاوڕەوی سێ، وەک دەڵێ:

گەر ئەڵێی چییە ئەو کێرە سیسە

پێی باوەڕ مەکە، ئەلفی تەئنیثە!

(بڕوانە: ذال) لە پیتی ذالدا.

(ثبوت): چەسپاندن، مان، دەگوترێ: (الثابت السَّاقطُ): (بڕ: - السَّاقط).

**٢٨ - (ثرم، أثرم):**

کاتێ (فَعُولُنْ) خەرم دەکرێ دەبێ بە(عولن - -) بەوە دەگوترێ (ثەلم) بەو پێیەی ئەم کارەی تیا ئەنجام بدرێ دەگوترێ: (أثلم) هەروا بەبەیتەکەیشی دەگوترێ: (بەیتی ئەثلەم) جا ئەگەر (فعولن) هەم خەرم و هەم قەبض کرا دەبێ بە(عول - ب) لەسەر کێشی وەتەدی بلاو، بەم کردارەیش دەگوترێ (ثرم) بەپێکەی، یا بەیتەکەی دەگوترێ: (أثْرَمْ) (ثەلم) و (ثەرم) تەنها لە طەویل و موتەقارەبدا ڕوو دەدەن: (خەرم).

**٢٩ - (المثْفَاة):**

سەروای شیعر پێنج جۆری هەیە: متکاوس و متراکب و متدارک و متواتر و مترادف (بڕوانە: ئەم وشانە و جۆرەکانی سەروا لە سەروادا) جا جاری وا هەیە لە چامەی ڕەجەزدا،

سێ جـۆر - بگرە چوار جـۆر - لەم پێنج جـۆرە کـۆ دەبنەوە، چونکە وا ڕێ دەکـەوێ لە چامەیەکی ڕەجەزدا، دوا پێی دێڕێ (مستفعلن) یا (مفاعلن) بێ، ئەمە متدارەکە، وا دەبێ (مفتعلن) دەبێ ئەمەیش متراکبە، وا دەبێ (فَعِلَتُنْ) دەبێ، ئەمەیش متکاوسە، وا دەبێ (مفعولن) دەبێ، ئەمەیش متواترە، جا هەر چامەیەکی هاوسەروای ڕەجەز، لە دوو پتر بوون، بەو چامەیە دەگوترێ: (قەصیدەی میثفاة) واتە: چامەی فرەشوو.

### ٣٠- (تثقیل المخفَّف):

بڕوانە: (ناچاریەکان/ ٣، ٤).

### ٣١- (المثلّث):

موثەللەث - یا سێیینە - جۆرێکە لە (مُشَطَّر). دوو جۆری سەرەکی هەیە:

١- سێ لەت سێ لەت یەک سەروایان هەبێ، لەسەر ئەم شێوەیە:

ا ا ا - ب ب ب - ج ج ج - د د د... تادوایی.

٢- پارچەیێ هۆنراوی سێ لەت سێ لەت، هەمـوو سێ لەتێ، لەتی یەکـەم و لەتی دووەمی هاوسەروا بن، هەموو کۆمەڵەکانیش لەتی سێهەمیان هاوسەروا بن، ئاوا:

ا ا ا - ب ب ا - ج ج ا - د د ا - هـ هـ ا... تاد. (بڕ: مشطّر) و (- العَین).

### ٣١- (ثَلْم):

(بڕ: ثرم) و (٧٠ - خرم).

### ٣٢- (المثمّن):

(بڕوانە: البیت - بەیتی سالم) و (المربَّع).

### ٣٣- (الثوانِی):

بەم واتایانە دێ:

١- بەپێیتی دووەم لە پێ (جوزء)دا، دەگوترێ ثانی، کە کۆکەی ثوانییە وەک دەگوترێ (ثَوَانِی سَبَب).

٢- واو و یێی ریدف لە سەروادا، پیـتی پێشـیان ئەگـەر سـەری هەبوو، وەک (بَوْن) و

(بَيْن) هەروەک پێیان دەگوترێ: (حەزمی مونبەسیط) پێشیان دەگوترێ: (الثَّوَانِی). (بڕ: الحَزْم).

٣- (مثنوی): یا مەسنەوی بەو جۆرە هۆنراوانە دەڵێن: کە ئاخری هەردوو نیوەکەیان هاوجووتن، مثنوی واتە: دوو نیوەیی یا دوو تاکی، یا هاوجووت، یا جووت سەروا، وەک هەڵبەستەکانی مەولەوی و ئیقبالنامە و ئەلفییەی ئیبنو مالیک (بڕوانە: المزدوج). بەم جۆرە شیعرە دەگوترێ: سەروا مەسنەوی.

ثاء لەو ناوانەی ئەلفوبێیەکە قەصریان دروستە.

## پێنجەم: پیتی جیم: حرف الجيم

ج = ٣

**٣٤- (المجتثّ):**

دەریای موجتەس، یەکێکە لە بەحرەکانی خەلیل، بڕوانە (بەحری موجتەس).

**٣٥- (جَدْوَل):**

خشتە، نەخشە، نموونەی زۆرە لە کێشزانیدا، لەم پەڕاوەدا بەهرەی زۆر لە نەخشە و خشتە وەرگیراوە، وەک ئەم هەموو نەخشە و خشتانەی کە وان لەم کتێبەدا.

**٣٦- (التجريد):**

واتە: ڕووت: پەتی، هەروا (مجرَّد) واتە: ڕووت: پەتی. جا تەجرید و موجەررەد، لە کێشزانیدا بەم زاراوانە هاتوون:

١- سەروا یا موئەسسە، یا مەردووفە، یا موجەررەدە لە تەئسیس و ریدف، دەگوترێ: هۆنراوی موئەسسەس، هۆنراوی موردەف، چامەی تەئسیسدار، چامەی ریدفدار، چامەی پەتی، چامەی ڕووت لە ریدف و تەئسیس، قصيدة مجردة. جاروبار دێڕێ، دوو دێڕی موجەررەد لە ناو چامەیەکی تەئسیسدار یا ریدفداردا دەبێ. سەروای بێ ریدف و تەئسیس:

- واتە: قافیەی موجەڕڕەدە - وەک (جَمَعْ) یا وەک ئەم چامەیەی حەریق - ڕەحمەتی لێ بێ - کە ئەمە سەردێڕەکەیەتی (ڕەمەل):

حوزنی من وەک حوسنی تۆ ئیشکالە تا ئاخر نەفەس

بۆ چ زەکاتی حوسنی تۆ، یا حوزنی من، ناگا بەکەس!

٢- هەندێ جار تەجرید و موجەررەد، بەواتا زمانییەکەیان بەکاردەهێنرێن، وەک دەڵێن:

آ- زەربی مەقطووعی موجەررەد لە طەی وەک (مەجزووئی بەسیط):

يَا مَنْ دَمِي دُونَهُ مَسْفُوك    وَكُلُّ حُرٍ لَهُ مَمْلُوكُ

ب- قافیەی موئەسسەسەی موجەررەد لە وەصڵ وەک (العالم، السالم).

ج- سەروای ریدفداری پەتی، وەک (زحام، نور، نیر، نار).

٣- بەواتا (اختلاف البحر في الضروب) لە (التحريد)دا باسی دێ، چونکە خۆی (تحريدە) بەحێی بێ خاڵ، بەڵام بازێ تەصحیفی دەکەن و دەیکەن بەتەجرید بەجیم. منیش ئەمەم ڕوون کردەوە بۆ ڕاستکردنی ئەم هەڵەیە. (بڕ: ١٧٦ - المعرّي).

٣٧- (المجرى):

بزوێنی پیتی ڕەوییە، لە سەروای موطلەقا، چی سەر بێ، یا ژێر بێ، یا بۆر بێ، کە یەکێکە لە شەش بزوێنە پێویستەکانی سەروا، لە سەروای موطلەقەی مەوصولەیشدا، بەبزوێنی ڕەوی هەر دەگوترێ مەجرا، وەک ژێری دال لەم چامەیەی نالیدا (طەویل):

تَرَی دَشتەتەن بالوَرْدِ کَانَتْ بەهەشتەتەن

ثُمُ الوَرْدِ بارانُنْ عَلی خَاكُ بەردهی

بۆیە پێی دەگوترێ: مەجری، چونکە ڕەوی پیا دەڕوا و ئاوەڕۆگەی ڕەوییە. واتە: گوڵبێن: دەروو: ئاوەڕۆگە.

٣٨- (جزء):

واتە: پارچە، پار. بەم واتایانە هاتووە:

آ- هەموو دێڕێ لە چەند جوزئێ - واتە: لە چەند پارچە و پاژێ - دروست دەبێ، کە پێشیان دەگوترێ: تفعلە: پێ. بەوێنە دەریای درێژ هەشت جوزئە، واتە: هەشت پێیە، چوار جار (فعولن مفاعیلن)، هەروا.

ئەجزای بەحرەکان هەشتن، یان دەن، بەدووروودرێژی لە (أصول التفاعیل)دا باسیان ڕابورد.

ب- جەزء: واتە کرتاندنی پێی عەرووز لە نیوە دێڕی یەکەم و کرتاندنی پێی زەرب لە نیوە دێڕی دووەم. (بڕ: ٣ - بەیتی مەجزووء) لە (٢٢ - البیت)دا.

٣٩- (الجزل): یان: (الخزل):

(بڕ: خشتەی (٢) زیحافە لێکدراوەکان): دەگوترێ: بەیتی مەجزوول یا مەخزوول، یا پێی مەجزوول.

### ٤٠- (التجميع):

(بڕ: التخميع). د. خلوصی پێشنیار دەکا، کە لە چامەدا چەند ضەربێ لە یەک بەحر بەکار بهێنرێ، کە ئەمە جۆرێکە لە (تحرید) وە بەمە دەڵێ: (مجمع الأضرب).

### ٤١- (الجمم):

کوڵی، الجَمَّاء ئاژەڵی کوڵە، جەمەم لە خەرم و عەقل دروست دەبێ، واتە: خەرم + عەقل = جەمەم، کەواتە: بەیتی ئەجەم، واتە: دێڕی کوڵ. (بڕ: خشتەی/٥، عیللەی تایبەت بەوەتەد و بەحەشو). بڕوانە (دەریای وافیر) و (خەرم).

### ٤٢- (الجمل الجامعة العروضية):

وەک: ١- (لَمْ أرَ عَلَى جَبَلٍ سمكةً): (ر: بڕگەی عەرووزی، دووەم/٧).

٢- (لمعت سُيُوفنا): (ر: أصول التفاعيل).

٣- (بَرِعَتْ حُرُوفُنَا)... تاد.

### ٤٣- (جَمَالُ القَوافي):

ناسکی و جوانی سەروا بەسراوە بەپەیوەندیکردنی یاساکانی سەرواوە، بەپشتی خودا لە باسی سەروادا ڕوونی دەکەینەوە، وەک ئەوە موردەف بێ، یا موئەسسەس بێ، یا مەوسوول. (بڕ: حِسَابُ الجُمَل).

### ٤٤- (الإجازة):

بەچەند مەبەست هاتووە:

١- لە هونەرە پاشکۆیەکانی شازدە بەحرەکەیەوە، وەک ئەوە هەستیارێ نیو دێڕ، یا دێڕێ دەڵێ، هەستیارێ تر نیوە دێڕەکەی تری دەڵێ، یا شیعرێ تر لەسەر کێش و سەروا و مەبەستی شیعرەکەی ئەو دەڵێ، ئەمە لە کوردیشدا هەر زۆر زۆرە. مەرج نییە کە تەواوکەری هۆنراوەکە هەستیار بێ. دەڵێن: إمامی بصیری - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - کاتێ ئەم نیوە دێڕە دادەنێ (بەسیط):

(فمبلغ العلم فيهِ أنَّهُ بَشَرٌ)

بۆی تەواو ناکرێ، لە خەوندا بەخزمەت حەزرەت - دروودی خودای لەسەر بێ -

دەگات، عەرزی دەكات، ئەویش - دروودی خودای لەسەر بێ - ئاوا بۆی تەواو دەكا:

(وَأَنَّهُ خَيْرُ خَلْقِ اللهِ كُلِّهِم)

دەڵێن: ئەبو نەوواسیش بەکۆمەڵێ هەستیار دەڵێ: ئەم نیوە دێڕەی من تەواوکەن: (عَذْبُ الماءُ وَطَابَا...). بەبێ ئێست ئەبول عوتاهییە دەڵێ: (حَبَّذَ الماءُ شَرَابَا)

جارێکیش کە نیزیکی گۆرانیبێژ ئەم شیعرە دەڵێ (تەویل):

أُناسٌ مَضَوا، كَانُوا إذا ذُكِرَ الأُلى

مَضَوْا قَبْلَهُمْ،صَلُّوا عَلَيْهِمْ وَسَلَّمُوا

ئەحمەدی کوڕی یوسفی هەستیاریش بەإجازە دەڵێ (طەویل):

وَمَـا نحن إلاّ مـثلهم غـيـر أننا

أقَـمْنَا قَلِيـلاً بَعْـدَهُمْ وَتَقَـدَّمُـوا

٢- یەکێکە لە نەنگەکانی سەروا، وەک ئەوە لە چامەدا پیتی ڕەوی لە مەخرەجدا و لە گۆپێکردندا زۆر لە یەکتر دوور بن، وەک ڕەوی دێڕی (عادل) بێ و هی دێڕێ تر لە هەمان چامەدا (حسن) بێ. هەروەها (عبید - عریق - شارب - قاتل). هەندێ تر دەفەرموون: جیاوازی بزوێنی تەوجیهە لە دێڕەکاندا وەک (ئەفیر، صوبور، قەر). (ر: عیوب القافیة/٢).

٣- جیاوازی عەرووزی چەند دێڕێ لە یەک هۆنراودا (ر: نەنگەکانی سەروا/٢).

٤٥- (جِنس):

دەگوترێ: لە تێرکردنی بزوێنی فیسارە پیت، پیتێکی مەدد لە (جنس)ی بزوێنەکەی دروست دەبێ. ئەم سێ پیتە لە جینسی ئەم سێ بزوێنەن: یێ لە جینسی کەسرەیە، واو لە جینسی بۆرە، ئەلف لە جینسی سەرە. بەوێنە: لە تێرکردنی ژێر (ی) پەیدا دەبێ، وەک ژێری لامی (حَوْمَلِ) کە ئیشباع بکرێ دەبێ بە(حَوْمَلِي). لە تێرکردنی بۆر (و) پەیدا دەبێ وەک (نَعْبُدُ) دەبێ بە(نَعْبُدُو) لە تێرکردنی سەر ئەلف پەیدا دەبێ وەک (العالمين) دەبێ بە(العالمينا). (بڕ: إشباع).

(تێبینی): پیتی چیمی کوردی لە حیسابی ئەبجەددا یەکسانە بەجیم کە یەکسانە بەسێ، بەوێنە: چل = ٣ + ٣٠ = ٣٣، ئەمە بۆ مەتەڵیش دەست دەدا، دەگوترێ: (ئەوە چییە چل دەکاتە سی و سێ، یا صەد یەکسانە بە(٩٩) یا دوو دەکاتە (١٦) یا سێ یەکسانە بە(٧٠)؟).

## شەشەم: پیتی حێ: حرف الحاء

ح = ٨ (بڕوانە: الف/ ٣٥ - تێبینی)

### ٤٦- (حَدّ الشعر):

پێناسەی هەڵبەست: هۆنراو گوتاری خاوەن کێش و سەروایە کە بەمەبەستی هۆنراو گوترا بێ.

ماددەی (ح د د) لە زانستی کێشدا، چەند زاراوەیەکی لێ داتاشراوە، وەک:

آ- حَدّ الشِّعْر.

ب- حدود القافِية:

سنوورەکانی سەروا (ر: القافیە).

ج- حدّ المطبوع وحدّ المصنوع.

### ٤٧- (المحدث):

بەحری موحدەث - کە بەکوردی پێی دەڵێین: (دەریای نوێ) - ئەو بەحرەیە کە ئەخفەشی ئەوسەط زیادی کردووە لە بەحرەکانی خەلیل، ئەم ناوانەی تریشی هەیە: بەحری موتەدارەک و موتەدانی و ضەربی خەیل و غەریب و شەقیق و خەبەب و رەکضی خەیل و دقە الناقوس و موختەرەع و موتتەسیق (ر: دەریای موتەدارەک).

### ٤٨- (الحُدَاء):

جۆرێکە لە گۆرانی، یا لە شیعری گۆرانی، وەک هۆرەی جافەتی، هۆرەکەر سەروا و پیتەکانی بزوێن تەواو تەواو درێژ دەکاتەوە. زۆرینەی کات ئەم جۆرە گۆرانییە لەسەر کێشی رەجەز بووە بۆ لێخوڕینی حوشتر بەسوود بووە.

### ٤٩- (الحَذّ):

(بڕ: ئەخشەی چوارەم: عیللەی کەمی هاوبەش ژمارە/٦).

(حذّ) و (حذذ)ی پێ دەگوترێ. دەگوترێ: عەروضی حذذاء و ضەربی ئەحەذذ، چونکە وشەی عەروض موئەننەسە و وشەی ضەرب موزەککەرە. حەذەذ عیللەتە بەنەقص تایبەتە بەپێی عەرووز و پێی زەربەوە لە کامیلدا و بەس.

٥٠- (الحذف):

بەم واتایانە هاتووە:

١- کرتاندن و لابردنی پیتێ یا پتر یا وشەیێ، لەبەر ناچاری، ئەمە جۆری زۆر بوو، لە ناچاریەکاندا، لە جۆری لێ کەمکردندا، باسی ڕابورد.

٢- زۆربەی زیحاف و عیللەکان جۆرێکن لە حەذفی بەواتا لێ کەمکردن و لێ کرتاندن.

٣- زاراوێکی تایبەتی عەرووزییە، عیللەتێکی نەگۆڕە بەلێکەمکردن، بریتییە لە لابردنی بڕگەی دوایی، کە سەبەبێکی سووکە لەم پێیانەدا:

آ- (مَفَاعیلن) لە وافیر و هەزەج و طەویلدا، بەحەذف دەبێ بە(مفاعی) دەگوێزرێتەوە بۆ (فَعُولن).

ب- (فاعلاتن) لە مەدید و ڕەمەل و خەفیف و موجتەسدا، بەحەذف دەبێ بە(فاعلاَ) دەگوێزرێتەوە بۆ (فاعلن).

ج- (فعولُنْ) لە موتەقارەبدا بەحەذف دەبێ بە(فَعُو = فَعَلْ ب - = وەتەدێکی کۆ).

کەواتە: حەذف لە سێ پێدا و لە هەشت بەحردا ڕوو دەدا. وە تایبەتە بەعەرووز و زەربەوە، لە حەشودا ڕوونادات، چونکە عیللەتە، زیحاف نییە. (بڕ: نەخشەی/٤ عیللەی کەمی هاوبەش).

دەگوترێ پێی مەحذووف، زەربی مەحذووف، عەروضە محذوفە، مەبەست ئەو پێ و ضەرب و عەرووزانەیە کە تووشی عیللەتی حەذف بوون.

٥١- (حَذْو):

یەکێکە لە بزوێنەکانی سەروا: بزوێنی پیتی پێش پیتی ریدفە، لە سەروای موردەفا، ئەگەر پیتی ریدف ئەلف بێ، حەذو سەرە، ئەگەر ریدف واو بێ حەذو بۆرە، ئەگەر ریدف یێ بێ حەذو ژێرە، جاروبارێش وا دەبێ، ریدف واو، یا یێ دەبێ، بەڵام حەذو سەر دەبێ، وەک (طَوْر - نَوْر، خَیْر - دَیْر) (ر: حذو، لە سەروادا).

٥٢- (تجرید):

ئەوەیە کە هەستیار لە بەحرێکی فرە زەربدا، لە پارچەیە هۆنراودا خۆی نەبەستێتەوە بەیەک زەربی ئەو بەحرەوە، بەڵکو لە زەربێکیەوە بگوێزێتەوە بۆ زەربێکی تری، ئەمە

دادەنرێ بەنەنگی سەروا، وەک ئەم هەستیارە لەم دوو دێڕەدا زەربی یەکەم و دووەمی تێکەڵ کردووە: (طەویل):

إذا أنت فَضَّلْتَ اْمَرأً ذَا نَبَاهَةٍ
عَلَى نَاقِصٍ كَانَ الَمدِيحُ مِنَ النَّقْصِ
أَلَمْ تَرَ أَنَّ السَّيْفَ يَنْقُصُ قَدْرُهُ
إذا قِيلَ هذَا السَّيْفُ خَيْرٌ مِنَ العَصِي

بەڵام ئەمە ئەگەر بەشێوەیەکی لێزانانە بێ، من بڕوام وایە کە شتێکی دروستە بڕوانە (التجميع - مجمع الاضرب).

٥٣- (حُرّ):

شیعری حوور: شیعری ئازاد (ر: شیعری حورر)، لە ماددەی (ش ع ر)ێدا. هەروا هونەرە نوێکان.

٥٤- (حرف):

حەرف - یا پیت، یا تیپ - لە کێشدا جۆری زۆرە، زۆربەیان رۆڵ دەبینن، چونکە هەیانە بەپێی پێویستیی کێش دەکرێ، یا دەسوێ، یا دەکرێ بەپیتێ تر. لەبەر ئەوە پێویستە کێشزان بەباشی ئەو جۆرە پیتانە بناسێ، کە لە زانستی کێشدا ئەرکی خۆیان دەبینن.

ناشنایان بەکێشزانی لە ناو هەموو نەتەوەکاندا باری حەوت وشتر کتێب و پەڕاویان لەسەر ئەم زانستە نووسیوە، وە بەردەوام پترتریشی لەسەر دەنووسن، کەچی هێشتا ئەوپەڕی نەکەوتوون. بەندەییش - وەک دڵسۆزێکی نەتەوەی خۆم - مەبەستم ئەوەیە بەپێی توانای سنوورداری خۆم لەم بوارەدا ئەسپی خۆم غار بدەم، وە ئەوەی بەسوودی بزانم بۆ ئەدەب و وێژەی کوردی، لە بابەتەکانی کێشزانی بینووسم، هەتا هەستیارانی کورد، بەبێ منەت و شاباش لە کارەکە شارەزا بن. جا وا چەند نموونەیێ لە بابەتەکانی پیت دەنووسین:

١- بەوێنە مەحوی -ڕەحمەتی خودای لێ بێ- لە سەراسەری دیوانەکەیدا (دەی) نیشانەی کاری موزاریعی، بەکارهێناوە، نەک (ئە) مەگەر لە دوو کاتا (ئەی) بەکارهێنا بێ:

أ- كاتێ بۆ ڕاستکردنەوەی کێش، پێویستی بەکرتاندنی هەمزە بووبێ، لە کاتی واذا ئەجیاتی (دە)ی موضاریع (ئەی) بەکارهێناوە.

ب- کاتێ لە پاش (دە)ی موضاریعەوە پیتی دال بووبێ، وەک (ئەدا، ئەدووم، ئەدینم...) لەبەر قورسی دووبارەبوونەوەی دال، (ئەی) موضاریعی نووسیوە.

فەرموو سەرنجی ئەم چەند دێڕانە بدەین، تا بزانین مەحوی بۆ ناچاریی کێش چەند پیتی کەم کردووە، یا پتر کردووە، یا بەهرەی لە چەند یاسای کێشزانی ڕەسەن بۆ هاوسەنگیی شیعرەکانی وەرگرتووە.

لە هەندێ ئەدیبان دەبیستم کە کێشی شیعرەکانی مەحوی قورسە، ساف نییە، لە ڕاستیدا (إنشاد) لە شیعردا خۆی هونەرێکی تری سەربەخۆیە، دەق لە چەشنی زانستی (تجوید) بۆ خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز، ئینشادیش بەبێ شارەزایی تەواو لە عەرووزدا جێبەجێ ناکرێ، دەنا کێشی شیعرەکانی مەحوی لە سافی و ئاوازداریدا دەڵێی ئاوازەی شمشاڵی خۆشە.

مەحوی لە چامەیەکا دەفەرمووێ (ڕەمەلی موستەزاد، یا ڕەمەلی هەشتی مەحذووف):

نووری عومری صەرف (ئەکا) بۆ کەشفی تاریکی لەخەڵق

وەک چرا هەرکەس بەشۆخی مەجلیس (ئارایی) بکا

گەر لە دنیا چاکەیێ صادر بوو تەفرەی پێ نەخۆی

ڕووسپی هەر ڕووڕەشە گەر بێ صەد (ئازایی) بکا

بۆ (دوکانی) موشتەری گر (حەوڵ ئەدا) کاڵافرۆش

دینی وا دێنێتە قیمەت خواجە (ئەعضایی) بکا

دڵ لە ئیدراکی حەقیقەت بێ بەشە داغی عیشق

(موحویا) دانا دەبێ بەم چاوە بینایی بکا

لە چامەیەکی تردا دەفەرمووێ (هەزەجی هەشتی):

موسەببیب حەز نەکا، پڕ عالەم ئەسبابت پەڕێ کایە

فەقەط چاری نییە قەت یەک دوو بینینی مام ئەحوەل

مەحوی لەم شیعرانەدا بۆ سافی و بێ قورتی شیعرەکانی، بەهرەی لە یاسای کرتاندنی هەمزە لە پاش گواستنەوەی بزوێنەکەی بۆ پیتی پێش خۆی، وەرگرتووە، وەک (صەرف

ئەکا بۆ = -ْب--)ی کردووە بە(صەرفەکا بۆ = فاعلاتن =-ب--) و (مەجلیس ئارا = ---- = مفعولاتن) بۆ (مەجلیسا را = - ب -- = فاعلاتن) و (بێ صەد ئازا = مفعولاتن) بۆ (بێ صەدا زا = فاعلاتن) و (بۆ دووکانی = مفعولاتن) بۆ (بۆ دوکانی = بۆ دُکانِی = فاعلاتن) و (حەول ئەداکا) بۆ (حەولەدا کا = فاعلاتن) و (لەم ئەسبابت) بۆ (لەمەسبابت = مفاعیلن) و (نی مام ئەحوەل) بۆ (نیمامەحوەل = مفاعیلن).

بەوێنە گەلێ جار مەحوی، یا نالی، یا شاعیرانی تر، لە دوای چامەوە، دەڵێ: (مەحوی) یا (مەحویا) یا (نالی) یا (نالیا) یا (قانیع) یا (قانیعا) ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ پێویستی کێش، بەپێی جێ و ڕێ، چونکە وشەی (مەحوی) یەکسانە بە(فعلن = - -) و (مەحویا = فاعلن) هەروا (نالی) و (نالیا) و (قانِعْ) و (قانِعًا).

ئەمە لە کێشی پەنجەییشدا هەر وایە، گەلێ جار هەمزە دەکرێ، یا تێی ڕاناوی کەسی دووەم گۆ ناکرێ، یا پیتی بزوێنی کورت دەکرێ بەپیتی بزوێنی درێژ، وەک مەولەوی - ڕەحمەتی خودای لێ بێ- نازناوی خۆی (مەعدوم =--) دەکا بە(مەعدومی =---) تا برگەیێ زیاد بکا لەم شیعرەدا:

جەکۆ؟ مەعدوومی ئەو تاقەت دارۆ

ســـاتێ وەبێ دین بالآت بویارۆ

بەڵام کاتێ کاری بەزیادکردنی برگەیێ نەبوو، ڕێک دەڵێ:

ئیــمســـاڵ نەووەهار چوون خــەزان ســەرد

بەرگ وەردباغ (مەعدووم) بەرد پەی هەرد!

جا لەم ڕوانگەوە هەستیاری کورد دەبێ زۆر بەباشی لە کون و قوژبنی زمانەکەی خۆی شارەزا بێ، وە ئاشنا بێ بەڕێزمان و ڕێنووس و بەنەحو و صەرفی کوردی، دەنا تووشی هەڵەی گەورەی کێشی و زمانەوانی و ئەدەبی دەبێ و، بگرە سەر لە پسپۆڕانی ئەم بوارانەیش دەشێوێنێ، چونکە شاعیر و ئەدیب و نووسەر نوێنەری سەردەمی خۆیانن، کە شتێ دەڵێن، پاش ماوەیێ فاکتەری دێرینی، ئەو گوتەیە بەنرخ دەکا و، بەقسەی پێشینان لە قەڵەم دەدرێ.

لەبەر ئەمە من وا بەباش دەزانم کە بەڵگەسازی و نموونە هێنانەوە، لە شیعر و ئەدەب و کەلتووردا، تەنیا بەنموونەی ڕەسەن و سەردەستە بکرێ، دەنا لەمەیش پتر سەرمان لێ دەشێوێ.

٢- (حەرفی صەحیح): پیتی ساخ: پیتی دروست، چونکە ئەم زاراوە لە عەرەبیدا بەرابەر بە(حەرفی عیللە)یە، کە بەواتا پیتی ناساخ و نەخۆش و دەغەزارە. کەواتە: حەرفی صەحیح سەرجەمی پیتەکانی ئەلفوبێیە، جگە لە پیتە نەخۆشەکان کە ئەلف و واو و یێن.

٣- (حەرفی عیللە): واتە: ئەلف و واو و یێ، لەسەر هەر شێوەیێ بن، بزواو بن یا وەستاو.

٤- (حەرفی لین): بریتییە لە ئەلف و واو و یێ، بەمەرجێ واو و یێ کە بێ بزوێن بن و بزوێنی پیتی پێشیان لە توخمس (جینس)ی خۆیان نەبن، وەک (قال، ماڵ، ساڵ، شار، قەول، قەیل، مەیل، هەور، وەی، دەی).

٥- (حەرفی مەدد): بزوێنی درێژ، کە بریتییە لە ئەلف و واو و یێ، بەمەرجێ واو و یێ بێ بزوێن بن و بزوێنی پیتی پێشیان لە چەشنی خۆیان بێ، وەک: (ناڵ، مۆر، شێر، موو، توو، میر، شیر، قیر، ثوم، جاء، قیل، سوء).

کورت و پوخت و بەکوردی پەتی:

آ- ئەلف هەمیشە هەم پیتی عیللەیە، هەم لین، هەم مەدد.

ب- هەموو واو و یائێکیش، بزوێندار بن یا بێ بزوێن پیتی عیللەن وەک (سۆل، دیل، مەیل، هەو، نەو، وەرە، کەوەر، هەیەر، هەی هەی).

ج- واو و یێی زەنەداریش، ئەگەر بزوێنی پیتی پێشیان لە چەشنی خۆیان بوو پیتی مەددن، دەنا پیتی لینن، وەک نموونەکانی ئێستای پێشەوە.

٦- (حەرفی صامیت): پیتی بێ دەنگ: حەرفی صەحیح.

٧- (حەرفی صائیت): پیتی دەنگدار: حەرفی مەدد: بزوێنی درێژ.

٨- (حەرفی ئەصلی): پیتی ڕیشەیی، پیتی چاووگی، ئەو پیتەیە کە لە بنەڕەتدا بەشێ بێ لە وشەکە، وە لە کێشدا بەفێ و عەین و لامی (فَعَلَ) بکێشرێن، وەک نوون و صاد و ڕێی (نَصَرَ) کە لەسەر کێشی (فَعَلَ)ەیە. ئەمە بەپێی وەضعی لوغەتە، نەک بەپێی کێشی عەرووزی، چونکە لە عەرووزدا مەرج نییە هەر پیتێ بە(فێ) و (عەین) و (لام) بکێشرێ ئەصلی بێ، وەک (ڕەجەز):

وَآكَـدُ الأذكَـارِ بالتَّـوكِـيـدِ

تِـلاَوَةُ القُـرآنِ بالتَّـجْـوِيدِ

ئەوەتا کاتێ ئەم دێڕە دەکێشین، دەبینین جاری وا هەیە پیتی زیادەی صەرفی بە(ف ع ل) کێشراوە و پیتی ئەصڵیش بەغەیری (ف ع ل) کێشراوە.

٩- (حەرفی زائید): پیتی زیادە، یا لاوەکی، ئەو پیتانەیە کە لە وشەدا لەسەر پیتە ڕیشەییەکان زیاد کرا بن، وە لە کێشا بەخودی خۆی بکێشرێ، نەوەک بەفێ و عەین و لام، وەک (ا، م، و، س، ت، ی) لە (ناصـر = فـاعل) و (منصـور = مـفـعـول) و (استنصار = استفعال) و (نصیر)دا، کە لە هەموو ئەم وشانەدا تەنیا (ن ص ر)ێکە ئەصڵین، ئەوانی تر (ا س ت و م ی)ێکە نائەصڵین و زائیدن. (ر: أصول التفاعیل).

١٠- (حەروف التقطیع): پیتەکانی پارە پارەکردن، بریتین لەم دە پیتەی کەوان لەم ڕستەیەدا: (لَمِعَتْ سُیُوفُنَا). (ر: أصول التفاعیلْ).

١١- (حروف القافیة): پیتەکانی سەروا، ئەم شەشەن:

١- ڕەوی ٢- وەصڵ ٣- خروج ٤- ریدف ٥- تەئسیس ٦- دەخیل

ئەمانە بەپێی هەلومەرجی خۆیان لە سەروادا نەگۆڕن (ر: حروف القافیه لە قافیه)دا.

١٢- (حروف الوصل): پیتەکانی وەصڵ، ئەم چوارەن:

١- هێی ڕاستەوخۆی پاش پیتی ڕەوی ٢- ئەلف ٣- واو ٤- یێ

مەرجەکە ئەم سێ پیتی عیللەیە لە تێرکردنی بزوێنی پیتی ڕەوی، لە سەروای (مطلق) ڕەهادا پەیدا بووبن.

١٣- (حروف الترنم): ئەو پیتە مەددانەن کە دەنگیان پێ درێژ دەکرێتەوە.

١٤- (حەرفێ لە عەرەبیدا نەبێ): (بڕ: الأبجدیة/ ج).

١٥- (الحرف الساقط فی التلفظ): پیتێ لە نووسیندا هەبێ و لە گۆپێکردندا نەبێ. (بڕ: خەطی عەرووزی).

١٦- (حەرفێ بەدوو حەرف): پیتی گیراویدار بەدوو پیت دەچێ، هەروا پیتی تەنویندار و پیتی تێرکراو، یا درێژەوەکراو، بەدوو پیت دەچن، ئەمانە لە عەرەبیدا زۆرتر لە ڕێنووسی ئاساییدا بەیەک پیت دەنووسرێن، بێجگە لە کاتی مەنصووبی تەنوین، لە هەندێ کاتیدا، وەک ئەو هەموو نموونانەی کە لە پێشەوە ڕۆیشتن، بەڵام لە کوردیدا بەچەند جۆر دەنووسرێن:

آ- پیتی گیراویدار بەدوو پیت دەنووسرێ (نالی - وافیر، یا هەزەجی مەحذووف):

لە سایەی (قەددی) مەوزوون و دوو زوڵفی

لە نالی و شیعر و تەسویدی نەما باس!

ب- تەنوین لە کوردیدا نییە، بەڵام ئەگەر دنیابوو کەسێ دروستی کرد، ئەوە دروستە بەدوو پیت بنووسرێ، یا بەیەک پیت (نالی - تەویل):

تَری وَرْدَهُ قوتاً وَجووتاً وسایقاً

فیا قووتتي من جووتهِ ثُمَّ فَرْدِهِ

ئەوەتا (قوتا) و (جووتا) بەدوو پیت نووسراون، چونکە حاڵەتی نەصبەیە، لە عەرەبیشدا ناوی موعرەب لە کاتی منصوبیدا بەدوو پیت دەنووسرێ، پیتە تەنویندارەکە خۆی چی بوو بەوە دەنووسرێ، بەڵام تەنوینەکەی لە حاڵەتی وەصڵ و وەقفدا بەئەلف دەنووسرێ، کوردییەکەیش هەروا باشە لەسەر شێوەی عەرەبییەکە بنووسرێ، بەڵام لە حاڵەتی رەفعە و جەررەدا، هەندێ بەنوونی وەستاو دەینووسێ و هەندێ وەک عەرەبی دەینووسن، قانیع - رەحمەتی خوای لێ بێ - دەڵێ:

وَآوِ کَآوِ سَارْدِ سَرْچَنَار بِهَاوِینْ

وَدَاسٍ وَتَوْراسٍ وَیَاجٌ وَمَشَارِنَا

هەندێ تر لە رێنووسی ئاساییشدا وەک رێنووسی کێشزانی دەینووسن (بڕ: نووسینی عەرووزی لە سەرەتای کتێبەکەوە).

١٧- (حەرفی خەروج): (بڕ: خەروج).

١٨- تەحریف: گۆڕین و دەسکاریکردنی دەق بەنیازی ناپاک: (بڕ: تصحیف).

**٥٥- (حرکة):**

بزوێن، جووڵە، سێ جۆرە: سەر، ژێر، بۆر، لە کوردیدا (بڕ: برگەی درێژ لە (آ)وە تا (ە).

حەرەکە یا بزوێن لە عەرووزدا بەزاراوی زۆر هاتووە:

آ- (حەرەکاتی قافیە): بزوێنەکانی سەروا: شەشن:

١- مەجری: بزوێنی پیتی رەوی: (بڕ: المجری).

٢- توجیە: بزوێنی پیتی پێش رەوی لە سەروای موقەییەد بەزەنە.

٣- نەفاذ: بزوێنی پیتی وەسڵ لە سەروادا.

٤- ئیشباع: بزوێنی پیتی دەخیل.

٥- حەذو: (بڕ: حذو).

٦- رەسس: بزوێنی پیتی پێش ئەلفی تەئسیس (بڕ: قافیە و بزوێن و پیتەکانی لە (ق ف ی)یدا.

ب- لە جینسی حەرەکەکەی (بڕ: جنس).

ج- (إشباعی حەرەکە): تێرکردنی بزوێن (بڕ: ناچاریەکان/١١، ١٢).

د- (حرکة الروي): بزوێنی ڕەوی: (بڕ: روی).

ه- (حەرەکە لە کێشدا): بزوێن لە کێشدا (بڕ: بڕگەی درێژ لە بڕگەدا).

و- (حەرەکە لە میزان و موزوندا): (بڕ: بڕگەی درێژ).

ز- (حەرەکەی دەخیل، حەرەکەی حەرفی ماقبل، حەرەکەی... تاد).

ح- (متحرك): پیتی بزاو، جووڵەدار، بزوێندار، بەرابەری پیتی وەستاوە.

ط- (تحریک الساکن): بڕوانە ناچاریەکان/١٩. (تسکین المتحرک)یش هەروا

ی- (تحریک میم الساکن): (بڕ: ناچاریەکان/١٩).

ک- (اجتماع الحرکات): لە شیعردا، لە چوار بزوێن پتر بەیەکەوە کۆ نابنەوە.

ل- (حروف الحرکة): پیتە بزوێن، دەیشگوترێ: حەرەکەی بەحەرفە، وەک بزوێنەکانی شەش ناوەکە (أسماء ستة).

م- (حرکة مجانسة، حرکة غیر مجانسة): (بڕ: حەرفی مەدد و لین).

٥٦- (الحزم):

(بڕ: الثوانی). پیتی ریدف ئەگەر واوی پێش بۆردار بوو، وەک (يَصُوبُ، تَنُوبُ، بۆر، خۆر، توون، روون) یا یێی پێش ژێردار بوو، وەک (حَمید، مَجید، سَعید، أغَارید، شیر، بیر، سیر، قیر، فێر، خێر، تێر) ئەوە پێی دەگوترێ: (حەرفی مورسەل: جڵەوی شل). بەڵام ئەگەر خۆیان وەستاو بوون و پیتی پێشیان سەردار بوو، وەک (بَوْن) و (بَیْن) و (سەیر) و (تەیر) و (هەور) ئەوە پێی دەگوترێ: (حەزفی مونبەسیط: جڵەوی بەرەڵا). یا (حەزفی مونبەسیط: پشتینەی کراوە).

**٥٦- (حسن المطلع):**

(بڕ: - المطلع) (حسن المقطع بڕ: - المقطع).

**٥٧- (الحساب الأبجدي: حساب الجُمَّل):**

(بڕ: الأبجدية).

**٥٨- (حَشْو):**

ناواخن: (بڕ: ٢٢/بيت - هێڵكاری). (حاشية: پەراوێز).

**٥٩- (حمار الشعراء):**

نازناوی بەحری ڕەجەزە، بۆیە پێی دەڵێن: گوێدرێژی هەستیاران، چونکە بەحرێکی خۆش و ئاسانە، هەموو هەستیارێ پێی دەوێرێ.

هەموو شاعیرێ دەتوانێ هەڵبەستی پێ بهۆنێتەوە، چونکە نزیکترین بەحرە لە پەخشانەوە، لەم دیدەوە هەق وایە لە کوردیدا هۆنراوی بێ کێش ناوبنرێ بەحری کەر!

**٦٠- (الشعر الحالي):**

واتە: شیعری ڕازاوە، یا هەڵبەستی خشڵدار، ئەو جۆرە هۆنراوەیە کە گشت پیتەکانی هەموو وشەکانی خاڵدار بێ، واتە: نوختەدار بێ، ئەم جۆرە شیعرە لە کوردیدا، بەڕێنووسی نوێی ئەمڕۆ زۆر ئەستەمە، چونکە کەم وشە هەیە کە پیتە بزوێنی تیادا نەبێ، پیتە بزوێنەکانیش کە ئەم سیانەن (ا، و، ی) دووانیان بێ نوختەن، وەک (دە برگەیی):

ژینی بێ ژنی بچێژی چێن چێن

چنیت بێ زیزی، چینی شینی ژین

واتای ئەم هەڵبەستە ئاوایە:

ژینی بێ ژنی بچێژی چێن چێن

ژیانت دەبێ بەشێوەنی ژین

مەبەست لەم جۆرە هونەرە لایەنە بەدیعییەکەیەتی، دەی ئەگەر ئینساف بدەین دەبینین ئەم نموونە کوردییە سەرکەوتووترە لەم نموونە عەرەبییە، کە لە هەمان بابەتە:

ثَبَّـتَتْ فِيَّ غِشٍّ جَـيْبِ بِتَـزْيِينِ
خَـبِـيثٍ يَبْـغِي تَـشَـفِّي ضِـغْنِ

(تێبینی): مەبەست لە پیتی خاڵدار ئەوەیە لە بنەڕەتدا لە پیتە نوختەدارەکان بێ، با لە هەندێ کاتیشدا بەبێ نوختە بنووسرێ، وەک (یبغی) و (بێ) و (بچێژی) و (زیزی). (بڕ: شیعری عاطل).

٦٠- (الـذُّلُل والـنُّفُر والحُـوشُ):

موعەرری - ڕەحمەتی لێ بێ - دەڵێ: سەروا بەپێی ڕەوی سێ جۆرە: زولول: ئەوەیە لە کۆن و نوێدا زۆر بەکارهێنرا بێ، نوفور: ئەوەیە کە سرک بێ، واتە: وەک پیتە باوەکانی ڕەوی بەزۆری بەکار نەهاتبێ، وەک جیم و زێ و ئەمانە، حووش: ئەوەیە کە بەدەگمەن بەکار بهێنرێ.

## حەوتەم: پیتی خێ: حرف الخاء

خ = ٦٠٠ (بڕوانە: الف/٣٥ - تێبینی).

٦١- (الخبب):

واتە: لۆقە. بەحری خەبەب بەحری موتەدارەکە (بڕ: المحدث).

٦٢- (خبل):

کۆبوونەوەی خەبن و تەی (بڕ: نەخشەی/٢ زیحافە لێکدراوەکان) دەگوترێ: پێی مەخبوول، یا زەربی مەخبوول، یا بەیتی مەخبوول، بۆ عەرووزیش دەگوترێ: (عروضة مخبولة).

٦٣- (خبن):

هەڵپێچانی جل و دوورینی.

زیحافێکی سادەیە، بریتییە لە لابردنی پیتی نەبزێوی دووەم، لە پێدا، واتە: کورتکردنەوەی یەکەم برگەی درێژ لە تەفعیلەدا، لە بەسیط و کامیلی موزمەر و ڕەجەز و موخەللەعی بەسیت و ڕەمەل و مونسەریح و سەریع و مەدید و موقتەضەب و خەفیف و موجتەس و موتەدارەکا ڕوو دەدا. (بڕ: خبن - نەخشەی/١ - زیحافە تاکەکان).

لابردنی پیتی دووەمی سەبەبی سووک - کە بەمە دەگوترێ خەبن - لەم پێنج پێیەدا:

١- (مستفعلن) بەخەبن، دەبێ بە(مفاعلن) لە ڕەجەز و بەسیت و سەریع و مونسەریح.

٢- (مستفع لُنْ) دەبێ بە(مَفَاعلن) لە خەفیف و موجتەسدا.

٣- (فاعلن = فَعِلُنْ) لە مەدید و ڕەمەل و بەسیت و موتەدارەکا.

٤- (فاعلاتن - فعلاتن) لە مەدید و ڕەمەل و خەفیف و موجتەسدا. بەڵام (فَاعِ لاَتن)ی خاوەن وەتەدی بڵاو لە موضاریعدا خەبن ناکرێ.

٥- (مَفْعُولاَتُ) بەخەبن دەبێ بە(مَفَاعیلُ) لە مونسەریح و موقتەزەبدا، لە سەریعیشدا بەخەبل و بەکەسف، دەبێ بە(فَعِلُنْ ب ب -) بەخەبن و کەسفیش دەبێ بە(فَعولُنْ) بەخەبن و وەقفیش دەبێ بە(فَعُولاَنْ).

تێبینی: دەبێ ئەوەیش بزانین کە یەک جۆرە (مفعولات ---ب)مان هەیە کە ئاوایە:

سەبەبی سووک + سەبەبی سووک + وەتەدی بڵاو، کە لەم سێ بەحرەدایە: موقتەزەب و مونسەریح و سەریع، بەڵام دوو جۆرە (مستفعلن) و (فاعلاتن)مان هەیە (بڕ: أصول التفاعیل، ژمارە/ ٥).

زۆرینەی کێشزانەکان بەخەبنی (مستفعلن)ی موزمەر لە کامیلدا دەڵێن: وەقص (بڕ: بەیت).

## ٦٤- (خرب):

خەرب عیللەتێکە تایبەتە بەوەتەدەوە، بریتییە لە خەرم و کەف، بەس دەچێتە سەر (مفاعیلن) لە هەزەج و موزاریعدا، بەمەرجێ لە سەرەتای سەردێڕەوە بێ، دەبێ بە(فاعیل ـــ مفعول = - - ب) لە عەرەبیدا، بەس لە سەدری صەدری سەردێڕدا دروستە، بەڵام لە کوردیدا دروستە لە سەرەتای گشت دێڕەکانی چامەکەوە دووبارە ببێتەوە، وە دروستیشە دووبارە نەبێتەوە، لە کوردیدا لە سەرەتای صەدر و لە سەرەتای عەجزەوە دروستە، وەک گشت دێڕەکانی ئەم چامەیەی نالی - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - (مضارعی أخرب):

ئەی ساکنی ریاضی مەدینەی منەووەرە    لوتفێ بفەرموو: مەدینەی منەووەرە

دەگوترێ بەیتی ئەخرەب، موزاریعی ئەخرەب، هەزەجی ئەخرەب، پێی ئەخرەب.

یا وەک ئەم چامەی تری کە ئەمە سەردێڕەکەیەتی: (موزاریعی هەشتی ئەخرەب):

دەستم لە گەردنی خۆت هەڵمەگرە ئەی (حەبیبە)

وەبزانە خوێنی خۆمە، یا مینەتی ڕەقیبە

(بڕ: کێشی برگەیی/٧) و (بەیتی مودەووەر - شیعرەکەی مەحوی). لە عەرەبیدا خەرب لە هەزەجدا ناپەسەندە.

## ٦٥- (تخریج القوافي):

دەرهێنانی سەروا: ئەوەیە ڕوون بکرێتەوە، کە ئایا سەرواکە لە چی جۆرێکە موتەواترە، موتەدارەکە... وە پیت و بزوێنە پێویستەکانی تیادایە یا نا، وە بێ نەنگە، یا نەنگدارە، وە ئەگەر نەنگی تیادایە چییە... تاد.

## ٦٦- (خروج عن الوزن):

دەرچوون لە کێش: لەنگیی شیعر، دەگوترێ: شیعری خاریج لەسەر وەزن، واتە:

هۆنراوی لەنگ، کە کێشـەکـەی لە سنووری دەریاکـەی دەرچوو بێ، وەک ئەوە لەتێکی دە بڕگـەیی بێ و ئەو لەتەکـەی تری نۆ بڕگـەیی بێ، یا یازدە بڕگـەیی بێ، یا پێـیـەکی هەقی (مفاعیلن) بێ ئەو (مفاعلتن) بێ.

### ٦٧- (الخروج):

ئەلفی خەروج لە سەروای موتەڵەقا: (قافیە/ الخروج).

یەکێکە لە شەش پیتەکەی سەروا، پیـتێکی نەرمە (لین)ە، لە تێرکردن و درێژکردنەوەی بزوێنی هێی صیلەی بزێو، لە زۆرینەی کاتا، پەیدا دەبێ، جا ئەگەر بزوێنی هێـیـەکە سەر بوو، پیـتی خـروجـەکـە ئەلف دەبێ، ئەگـەر بۆر بوو واو دەبێ، ئەگـەر ژێر بوو، یێ دەبێ، وەک: (إجمالُهَا، إجمالُهُو، إجمالِهِی).

پیتی خەروج نەگۆڕە، لە سەروای سەردێڕەوە تا دێڕی قڕە، کە دوا دێڕە لە چامەدا دەبێ ڕەچاو بکرێ، وەک ئەلفی پاش هێی وەسڵ، لە سـەرجـەمی سـەرواکـانی ئەم چامـەیەدا (کامیل):

عَـفَتِ الدِّيَارُ مَـحلُّهَا فَـمَقَـامُـهَـا
بِمِنىً تَأَبَّدَ غُـولُهَـا فَـرِجَـامُـهَـا

ئەوەتا سەرواکانی تری ئەم چامەیە تا کۆتایی ئەم جۆرە وشانەیە: (سِلاَمُهَا، حَرَامُهَا، رِهَامُهَا...).

لە کوردیدا وەک چامەکەی نالی، کە سەردێڕەکەی دەڵێ:

دەروونی لداری (بڕ: هێلکاری لە -البیت-دا).

شیعر هەیە خاڵییە لە وەصڵ و خەروج، ئەگەر هێی وەصڵ نەبوو بەناچاری پیتی خەروج نییـە، بەڵام مەرج نیـیـە کە هێی وەصڵ هەبوو، پیـتی خـەروج هەبێ، چونکە دروسـتـە کە هێی وەسڵەکە وەستاو بێ وەک (أَبَهْ + مَعَهْ) بەزەنەی هێ.

### ٦٨- (الخرجـة):

دوا قفڵ لە موشحدا (بڕ: موشح، لە دەریا نوێکاندا).

### ٦٩- (اختـراع):

بەم چەند زاراوە دێ:

١- بەحری موختەرەع واتە: بەحری موتەدارەک (بڕ: محدث): (دەریای داهێنراو).

٢- ئیخیتراعی کێشێکی تایبەتی، کە زیاد بێ لەسەر شازدە بەحرەکەی خەلیل، بەڵام بەدەسکارییەوە پێ و بەحرەکانی شیعری عەموودی - هۆنراوی ستوونی - بەکار بهێنێ، یا هەر هیچ نەبێ سوودیان لێ وەربگرێ، وەک: بەند و دوو بیت و چوارینە و... تاد.

لە ڕاستیدا لە پاش خەلیل - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - لە دەریاکانی خەلیل. گەلێ کێشی نوێ داهێنراوە، عەرەب و کورد و عەجەم و تورک و گەلانی تریش، تەنانەت گەلە ناموسوڵمانەکانیش، کە لە ناوچەی موسوڵمانانا دەژین، لەم کێشە نوێیانەدا هاوبەشییان کردووە. بەوێنە: بەحری موزاریع لە بنەڕەتا بریتییە لە:

(مفاعیلن فاع لاتن مَفَاعیلن × ٢)

بەڵام لە کۆندا هەر بەمەجزووئی بەکارهێنراوە، وە یەک چەشنی بووە و بەس، کە ئەمە بووە:

(مَفَاعیلن فاعِ لأَتُنْ × ٢)

وە نموونەی لە شیعری عەرەبی کۆندا ئێجگار کەمە، کەچی ئەم دەریایە لە کوردیدا زۆر باوە، نالی لە دیوانەکەیدا زۆر چامەی بەم کێشە داناوە، وە لە کوردیدا چەندین لکیان لەم دەریایە دروست کردووە، وەک موزاریعی مەکفووفی مەخرووم، یا موزاریعی مەکفووفی ئەخرەب، خانی - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - دەفەرمووێ:

خۆش وەزنە بێ مەلالە گەر بت مضاریع ئەخرەب

کە ئاوا پارە پارە دەکرێ:

خۆش وەزنە + بێ مەلا لا + گەر بَتْ مُ + ضاریعەخرەب

مَفْعُولُ + فاعلاتن + مفعول + فاعِلأتن

دەشێ بەیاسای کرتاندنی هەمزە، هەمزەی (أخرب) لەم شیعرەی خانیدا بکرتێ. باس لە لکەکانی تری بۆ جێگەی خۆی.

٣- داهێنانی کێشێکی نوێ، وەک هەڵبەستی ئازاد و شتی تری وا.

٧٠- (خرم):

بەڕێی بێ نوختە، بریتییە لە لابردنی یەکەم پیتی وەتەدی کۆ، لە سەدری سەدری سەردێڕی چامەدا و بەس، ناچێتە سەر سەبەب و فاصیلە بەهەردوو جۆرەکەیانەوە، لە

یەکەم پێی نیوەی یەکەمی دێڕدا، چ لە تاکە دێڕدا، چ لە پارچە و شتی تری وادا، چ لە چامەدا ڕوودەدا، زۆرتر وەک گوتمان لە عەرەبیدا لە سەدری سەردێڕی چامەدا دەبێ، بەڵام هەر لە عەرەبیدا دروستە، لە هەمان شوێنا، لە دێڕەکانی تری چامەیشدا دووبارە ببێتەوە، جاروبار تەنیا لە پێی سەرەتای نیوەی دووەمی دێڕدا دەبێ، ئەمە لە عەرەبیدا وایە، بەڵام لە کوردیدا وەک لە (خرب)دا ڕابورد بەجۆرێکی ترە.

خەرم دەچێتە سەر ئەم سێ پێیە و بەس:

١- (فَعُولُنْ)ی یەکەم لە (تەویل) و (موتەقارەب)دا، هەروا (فَعُولُنْ)ی سەرەتای لەتی دووەم لەم دوو دەریایەدا، بەخەرم دەبن بە(عُولُنْ = --) دەبرێ بۆ (فَعْلُنْ --) چونکە لە کێشی سەرفی عەرەبیدا (عُولُنْ) نییە بەڵام (فَعْلُنْ --) هەیە.

٢- (مُفَاعَلَتُنْ) لە وافیردا، چی پێی صەدری صەدر بێ، وە چی پێی سەرەتای عەجز بێ، بەخەرم دەبێ بە(فاعلتن ـــــ مفتعلن = -ب ب-) بەخەرم لە وافیردا دەیشگوترێ (عەزب = عەضب).

٣- (مَفَاعیلن) لە سەدری سەدری وافیر و هەزەج و موضاریعدا بەخەرم دەبێ بە(فاعیلن) هەروا لە سەرەتای عەجزدا، دەگوێزرێتەوە بۆ (مفعولن = ---). کەواتە: خەرم لەم پێنج دەریایەدا ڕوودەدا: (طەویل و وافیر و هەزەج و موزاریع و موتەقارەب). خەرم و قەتع بەس لە وەتەددا دەبن.

(تێبینی): مەرج نییە کە هەموو کەمییەکی سەرەتای دێڕ خەرم بێ، چونکە وەک گوترا: خەرم لابردنی پیتی یەکەمی وەتەدی کۆی پێی سەدرە، لە سەبەبا ڕوونادات، هەروا لە فاصیلەدا، چونکە هەردوو جۆرەکەی فاصیلە بەسەبەبێکی قورس دەست پێ دەکا. ئەمەیش چەند نموونەیەکە لە خەرم (تەویلی مەخرووم):

لَمَّا رَأَيْتُ الأَرْضَ قَدْ سُدَّ أَرْضُهَا     وَلَمْ تَرَ إلاَّ بَطْنَهَا لَكَ مَخْرَجَا

بەم جۆرە دێڕە تەویلی ئەثلەمیشی پێ دەگوترێ.

(تەویلی ئەثرم = تەویلی مەخرومی مەقبوض):

هَاجَكَ رَبْعُ دَارِسُ الرَّسْمِ باللوى     لأَسْمَاءَ عَفَّى آيَهُ الْمُورُ وَالقَطْرُ

(موزاریعی ئەثردم = موزاریعی ئەخرەمی مەقبووز):

قُلْتُ سِدَاداً لِمَنْ جَاءَنِي     فأَحْسَنْتُ قَوْلاً وَلاَ أحْسَنْتُ رَأيَا

(موتەقارەبی ئەثلەم = موتەقارەبی ئەخرەم):

لَوْلاَ خِدَاشُ أخَذْتُ جَمَالا    تِ سَعْدٍ وَلَمْ أُعْطِهِ مَا عَلَيْهَا

(وافیری ئەثلەم = وافیری مەخروم):

إنْ نَزَلَ السَّمَاءُ بِأرْضِ قَوْمٍ    رَعَيْنَاهُ وَإنْ كَانُوا غِضَابَا

(هەزەجی مەخروم):

أدُّوا مَا استَعَارُوهُ    كَذَاكَ العَيْشُ عَارِيَة

نموونەی خەرم کە لە پێی سەرەتای عەجزدا بێ و بەس، وەک (تەویلی مەخرووم):

خَـرَجْتُ بِهَـا مِنْ بَطْنِ يَبْـرِينَ بَعْـدَمَـا

(نَادَى) مُنَـادِي بِالصَّـلاَةِ فَـأعْـتَـمـا

خەرم عـیللەتە چونکە دەچێـتـە سـەر وەتەد، بەڵام لە حوکـمی زیحافدایە، چونکە بگۆڕە نەگۆڕ نییە. هەندێ دەڵێن: ئەمەی ناونراوە خەرم یاسایەکی کێشزانی نییە، بەڵکو هەڵەی نووسیارە، نووسەرەوەکان بەڕێکەوت پیتێکیان لە سەرەتای هەندێ پێیەوە لە بیر چووە، بەرە بەرە ئەو هەڵەیە لە لای کـێشزانەکان بووە بەزاراوەیێ، بەناوی خەرم، بەڵام خەرم و خەرب لە کوردیدا باوە و یاسایە.

لە کوردیدا وەک لە خەرەبیشـدا ڕابورد، دێڕی مەخرووم زۆرە، وەک زۆر لە دێڕەکانی ئەم چامەیەی نالی، کە موزاریعی ئەخرەبی هەشتییە، گەرچی زۆربەی دێڕەکانی تری ئەخرەبن: واتە: مەخرووم و مەکفووفن پێکەوە:

ئەشخاصی خاصـە (تَشْخَصُ أبْصَارُهُمْ) هەموو

(وَأنفـسي)یانە هەریەکـە بۆ خـۆی مـوحـەییـەر

کێشی ئەم دێڕە دەقاودەق ئاوایە:

(مفعولن + فاعلات + مفاعیل + فاعلن × ٢)

خـەرم لە زمـانـا واتە: لووت کـەل، یا لووت کرتـاو، یا لووت خوراو، یا لووتە کـرتێ، یا کەپوو خوراو، مەخروم و ئەخرەم ئەو پێیەیە یا ئەو دێڕەیە کە خەرم کرابێ و تووشی کەپوو خوراوی بووبێ.

نموونەی دێڕێ یەکـەم پێی هەردوو نیـوەکەی مەخرووم بێ ئەم دێڕەیە، کە وافـیری هەردوو لەت خەرم کراوە:

بْدَلَني   بِتَيْمِ اللاّتِ رَبّي    حَنْظَلَةَ   الّذي أحْيَا  تَميماً
مُفْتَعِلُنْ + مفاعيلنْ + فعولَن + مفتعلن + مفاعيلن + فَعُولُنْ

كەواتە: نالي و خاني و مەحوي و هەستیارە کوردەکانی تر کە ئەخرەمی (صەدر و ابتداء)یان بەکارهێناوە، سەرمەشقیان لە یاسایەکی عەرووزی ڕەسەنی ڕەسا وەرگرتووە.

خەرم لە (مفاعلتن)ی وافیردا ئەم چەند جۆرەی هەیە:

١- بەخەرم (مفاعلتن) دەبێ بە(فاعلتن ــــ مفتعلن) پێی دەگوترێ (أعْضَب).

٢- بەعەصب و خەرم دەبێ بە (فاعیلن ــــ مفعولن) بەخەرمەکە و عەصبەکە دەگوترێ (قصم) بەپێ و دێرەکەیش دەگوترێ: (أقْصَم).

٣- بەکەف و خەرم و عەصب دەبێ بە(فاعِیلُ ــــ مفعول = -- ب) پێیان دەگوترێ (عەقص) و (ئەعقەص).

٤- بەعەقل و خەرم (مُفَاعلتن ــــ مفاعیلن ــــ مفاعلن ــــ فَاعِلُنْ) پێی دەگوترێ جەمەم و ئەجەم.

دەگوترێ: بەیتی مەخرووم، پێی مەخرووم، هەزەجی مەخرووم.

### ٧١- (خەزل):

(بڕ: جەزل).

### ٧٢- (خەزم):

بەزێی خاڵدار، واتە: لووتەوانە (بڕوانە: ناچاریەکان/٤١).

### ٧٣- (اختصار):

تەخفیفیشی پێ دەگوترێ. لە عەرەبی و لە کوردیدا، ئەدیب یا هەستیار، بەپێی خوازەی بار و موقتەزای حاڵ، جار جارە و کەمە کەمە، جۆرە گۆڕانکارییەکی نائاسایی دەکا. تەنانەت شتی وا لە فەرموودەیشدا هەیە، پێغەمەری خۆشەویست و نازدار - لەم شەوی هەینییەدا، کە شەوی ئیسرا و میعراجە، هەزاران هەزار درووود و ڕەحمەت و سڵاوی لەسەر بێ - لە فەرموودەیەکا دەفەرمووێ: (کَفَى بِالسَّيْفِ شَا...)

مەبەستی (د) لە نیوە وشەی (شا) (شاهداً)یە. ئەوەتا پێغەمەر (د) لەبەر هۆی ڕەوانبێژی و مەبەستێکی ئەدەبی بەرز، وشەی (شاهد)ی کورت کردۆتەوە، نالیش -

ڕەحمەتی خوای لێ بێ - لەم بابەتە شیعرێکی هەیە (قیامەت)ی کورت کردۆتەوە و کردوویەتی بەقیا. لە ناچاریەکانا، لە (ژمارە/٦٢ - ب)دا ڕابورد.

گۆرانیش -بەڕەحمەت بێ- دەڵێ (کێشی دەیی):

هەر چۆک دادان بوو، هەڵسانەوە و (هەی!)

سۆز و هاواری ناکا (وەی، وەی، وەی)

(ناکا) کورتکراوەی (ناکاو)ی بەواتا کوتوپڕە.

جار جاریش کرتان و کورتکردنەوەکە، لە ناوەڕاستی وشەوە دەبێ. وەک (گۆران - هەزەجی ئەخرەب):

ئێوارەیە وا، هەڵگرە ساگۆزەیێ تازە

ڕێی کانی -قوبان- مونتەظیری جیلوەیی نازە!

گۆران بۆیە سووککراوی قوربانی بەکارهێناوە، تا کێشەکە ڕاست بێ و لەنگ نەبێ، چونکە (قُبَانْ = فَعَلْ = وەتەدی کۆ) بەڵام (قربان = فعلن = دوو سەبەبی سووک).

شیعرەکە ئاواشی دەکرێتەوە:

(ڕێی کانِ = مفعولُ + قُبَانْ مُنْتَ = مفاعیل + ظِرِی جِلْوَ = مفاعیل + یِنَازە = فَعولُنْ)

ئەگەر قوربانی بەکار بهێنایە (مَفَاعیل)ی یەکەم دەبوو بە(مفعولاتُ) شتی وایش لە هەزەجدا نابێ. بەڵام (ناکاو)ی بۆیە کورت کردۆتەوە، چونکە هاتنی واوی زۆر بەشوێن یەکتریدا ناپەسەندە و لەسەر زمان قورسە، زەدە لە سافی دێڕەکە و ڕەوانبێژی وشەکانی دەدا، دەنا لەبەر ڕاستکردنەوەی کێش نییە، چونکە ئەگەر ناکاویش بێ شیعرەکە لەنگ نابێ، کەواتە: سووک کردنی قوربان لەبەر ناچاری کێشە، بەڵام پاشەکرتێ لە (ناکاو)دا لەبەر بایستی هونەرییە، نەوەک کێشی. فَتَأَمَّلْ. دەگوترێ (مختصر) بەمەعنا (مەجزوء).

## ٧٤- (خطّ العَرُوض):

بڕوانە (نووسینی عەرووزی) لە پاش ناچاریەکانەوە یەکسەر دێ. لە ڕێنووسی کێشی کوردیدا، دەبێ ئەم خاڵانە ڕەچاو بکرێ:

١- لە پێشدا خودی پێیەکان بەڕێنووسی کێشی عەرەبی پچڕ پچڕ دەکرێن، لە چەند سەبەب و وەتەد دروست بوون، دیاری دەکرێن، مەرج نییە کە ئەمە لەسەر کاغەز بکرێ،

تەنیا لە زەینا بەسە، وەک (فاعلن) یەکسانە بەسەبەبێکی سووک و وەتەدێکی کۆ (مفاعیلن = وەتەدێکی کۆ و دوو سەبەبی سووک)... وە هەروەها...

٢- لە پلەی دووەما بەپێی یاساکانی بڕگە و سەبەب و وەتەد و فاسیلەی کوردی، وشەکانی شیعرەکە، لە سەرەتاوە دابەش دەکرێ، بەسەر پێیەکاندا، پیتە بزوێن و هەموو ئەو پیتانەی کە لە بڕگەکاندا گۆیان پێ دەکرێ، لە بەرابەر بڕگەکانی پێیەکانی کێشەکەوە دادەنرێ، جاری وا دەبێ موزونە کوردییەکە و میزانەکە دەقاودەق دەردەچن و کەم و زیادیان نییە، بەڵام زۆربەی کات بڕگە کوردییەکان بەپیت زیاترن لە پیتەکانی میزانەکە.

٣- دەبێ ئەوە بزانرێ کە پیتی بزێو لە دەقی کێشراوە کوردییەکەدا، بزوێنەکەی هەرچی بێ، لە هەموو پێیەکا، دەق بەقەد پیتە بزێوەکانی تەرازووەکەیە، بەڵام پیتە نەبزێوەکان (وەستاوەکان = زەنەدارەکان) لە کوردیدا، گەلێ جار مەرج نییە وابن، جاری وا هەیە، بەرابەر یەک پیتی بزوێن یەک پیت هەیە، وەک (گەورە کچ = گَوْرَ کَچْ = فاعِلُن = - ب -) چونکە پیتە بزوێنەکانی (ـە، ە) و هەروا ڕەبوودەکەی (کچ) لە چەشنی سەر و بۆر و ژێری عەرەبییەکە وان. جاری وا هەیە بەرابەری یەک پیتی وەستاوی تەرازوو (میزان) دوو پیتی وەستاو هەیە، وەک (مَامْ هَتْزَارْ = فاعِلُنْ = - ب -) یا سێ پیت هەیە وەک (مانگ هەڵات = فاعِلُنْ = -°° ب -ْ). ئەمەیش نموونەیەکی نموونەییە لە شیکردنەوەی کێشی کوردی (ڕەجەزی هەشتی تەواو، ئیبنولحاج - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - دەفەرموێ):

ئەی موقتەدایی خاس و عام، بەشمان دەلە و دارول سەلام
باعیث بەلوتفت دڵنیام، هاوار لە خۆم چەند رووسیام
ئێستا موحەممەد پیر بووە، تۆبەی لە عیصیان کردووە
نەفس و هەواکەی مردووە، هاوار لە خۆم چەند رووسیام

سەرنج لە شیکردنەوەی بفەرموون:

مُسْ: تَفْ: عِلُنْ/ مَفَا: عِلُنْ/ مُسْ: تَفْ علن/ مُسْ: تَفْ: عِلُنْ
أيْ: مُقْ: تَدَای/ بِخَا: سْعَامْ/ بَشْ: مَانْ دَلَوْ/ دَا: رُلْ: سەلام

٧٥- (تخفیف)

(بڕ: اختصار - ٧٣).

نەخفیف لە کێشدا جۆری زۆرە، لە ناچاریەکاندا نموونەی زۆری لێ ڕۆیشت، (بڕوانە: ناچاریەکان: جۆری دووەم لێ کەمکردن) و (٢، ٤، ١٠).

آ- (تەخفیفی هەمزە): سووککردنی هەمزە، کە یا بەحەزفە، یا بەقەلبە، لە عەرەبی و کوردیدا، بۆ هەستیار، زۆر گرنگە، فێربوونی و بەکارهێنانی بەوەستایانە، ئاسانکارییەکی گەورەیە، بۆشاییەکی باش لە ڕاستکردنەوەی کێش بۆ هەستیار پڕ دەکاتەوە، لە دیوانی مەحوی و نالی و حەریق و وەفایی و ناری و بێخود و... تاد، زۆر پەیڕەوی کراوە، وە چەندین نموونەی لە پێشەوە، لە ناچارییەکاندا ڕۆیشت (بڕ: ١٠، ٤٥، ١٠١).

لێرەدا مەبەست لە سووککردنی، ڕوون دەکەینەوە، بەنموونەوە. لە ڕاستیدا شاعیرانێ کە بەزمانی ناعەرەبی شیعریان گوتووە، زۆربەی کات سەرچاوەی گۆڕانکاری و دەستکاریی خۆیان بەلێزانانە، بردۆتەوە سەر یاسا عەرووزییەکانی خەلیل، بەلآم ئەمان بەپێی پێویستی و تایبەتمەندیی زمانی خۆیان، تەطویریان بەو یاسایانە کردووە. جا دەڵێین گۆڕانکاری لە هەمزەدا، چ بەکرتاندنی بێ، یا بەگۆڕان و قەلبی بێ بەپیتێ تر، یا بەهێشتنەوەی بێ، وەک ئەوە خۆی هەمزەی وەصڵ بێ و بکرێ بەهەمزەی قەطع، یەکەم: ئەم گۆڕانکارییانە، لەبەر یەکێ لەم مەبەستانەیە:

١- ڕاستکردنەوەی کێش (بڕ: حرف لە ماددەی (ح ر ف)ێدا. نالیش - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - دەفەرمووێ (رەمەل):

لەکن ئەو جەو/ هەرە فەردە/ لە هەیوولا/ نییە باس

لکَنَوْ جَوْ / هَرَ فَرْ دَا / لَهَیُو لاَ / نی یباس

فَعِلاَتُنْ / فَعِلاَتن / فعلاتن / فاعلن

ب ب -- / ب ب--/ ب ب--/ -ب-

ئەوەتا (مَفَاعیلن = لە کن ئەوجەو) بەگواستنەوەی بزوێنی هەمزەی (ئەو) بۆ پیتی پێش خۆی کە (ن)ی (لەکن)ە، وەکرتاندنی، لە پاش نەقڵی بزوێنەکەی، بووە بە(فَعِلاَتُنْ) وە کێشەکە ڕاست بۆتەوە، ئەم جۆرە لە گشت پێیەکا دروستە.

٢- بۆ سازبوونی سەروا، گەلێ جار کێش بەبوونی هەمزەکە لەنگ نابێ، بەلآم سەرواکە تووشی نەنگ و لەنگی دەبێ، وەک ئەوە سەروای دێڕی پێشوو (ناس) بێ و سەروای دێڕی دوای (بَأس) بێ، کێشی (ناس) و (بەئس) یەک شتە، بەلآم (ناس) ئەلفی ریدفی وا تیادا، بەلآم (بەئس) تیادا نییە، شتی وایش دەبێ بە(سناد) کە نەنگێکە لە

نەنگەکانی سەروا.

٣- سافبوونی کێش، نەوەک ڕاستکردنەوەی، ئەمە لە کوردیدا زۆر زۆرە. وەک (حاجی قادری کۆیی - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - دەڵێ: ڕەمەل):

ناحەقی ئەو دەرحەقم کەی دەیگرێ میزانی حەق

کاتبی ئەعمال (ئە)گەر بێتو طەرەفگیریی نەکا

دەی ئەم نیوە دێڕە بەم دوو شێوەیە دەخوێنرێتەوە، هەردوو شێوەکە کێشەکەیان دروستە، بەڵام شێوەی دووەم سووکترە، لەبەر ئەوە پەسەندترە:

١- کاتِبی أَعْ: مَالْ ئەگەر بێ: تُوْ طەرَەفْگی: رینەکا

فاعلاتن: فاعلاتن : فاعلاتن : فاعلن

-ب-- : -ْب-- : - ب -- : -ب-

٢- کاتِبی أَعْ: مَالە گەر بێ: تُوْ طەرَەفْگی: رینەکا

= = : -ب-- : = = : = =

٤- هەمزەکە تەکرید دەکرێ، وشەی بەکوردی کراو هەر زۆر زۆرە، لەبەر ئەوە بەکارهێنانی جیایە لە ئەصڵە عەرەبی، یا فارسی، یا تورکی، یا ئەورووپییەکەی، وەک هەمزەی مەصدەری عەرەبی فیعلی مەزید و نامەزید بەزۆری، دەکرێ بەهەمزەی قەطع، وەک ئەم شیعرەی حاجی، کە هەمزەی بابی ئیفتیعالی تەکریدکراوی، کردووە بەقەطع (ڕەمەل):

من فەقیم و غەیری (سیی پارە)م لە باخەڵدا نییە

ئەو کەسەی صاحێب قڕانە (ئیددیعا)ی غازی دەکا

جۆری یەکەم و دووەم و سێیەم و چوارەم لە گشت پێیەکانی دێڕدا دروستە، بەڵام جۆری دووەم هەر لە پێی سەروادا ڕوودەدات.

دووەم: ئەو گۆڕانکارییانەی کە بەسەر هەمزەدا دێن ئەمانەن:

١- هەمزەی بزێو قەلب دەکرێ بەئەلف، ئیتر بزوێنەکەی سەر بێ، یا بۆر بێ، یا ژێر بێ، قەیناکات (بڕ: ناچاریەکان/ ١٠١ -٢).

٢- قەلبی هەمزە دەکرێ بەپیتی نەرم (حەرفی لین = بزوێنی درێژ) لە چەشنی بزوێنی پیتی پێشی، لە (بُؤْس)دا دەبێ بە(بوس) و لە (بأس)دا دەبێ بە(باس) و لە (بئس)دا

دەبێ بە(بیس) یا وەک (یکلَؤُها) و (یَرْزؤُها) دەبن بە(یکلأها) و (یرزاهَا).

٣- هەمزەکە دەکرتێ لەبەر چەند هۆیێ.

٤- ئەلف دەکرێ بەهەمزە.

ب- (تخفیف المشدّد): بڕوانە ناچاریەکان: (٤)

(اخفش):

## ٧٦- (الرباعي الخالص):

چوارینی پەتی، بەکورتی ئەوەیە هەر چوار لەتە دێڕەکەی هاوسەروا بن. وەک (نوری فارس - دە بڕگەیی):

خۆزگەم پێنج هەستەم پێنج هەزار دەبوو
مووم هەموو چاو و دڵ هۆشیار دەبوو
تەمەنم بەساڵ سەد ملیار دەبوو
گشت بۆ تەماشای چاوی یار دەبوو!

بەپشتی خودا لە بەحری روباعیدا، گشت جۆرەکانی (چوارین) ڕوون دەکەینەوە. (لوطفی مەخلەس): (مەطلەع و...).

## ٧٧- (البحور المختلطة):

(بڕوانە: ١٤ - بحر/ ٢، ٤).

## ٧٨- (خلع):

بەم واتا و زاراوانە لە کێشزانیدا بەکارهاتووە:

١- البیت المخلّع: بەو دێڕە دەگوترێ کە لەبەر زۆری زیحاف و عیللەی ناوی لەجێ چوو بێ و لە گرێژەنە برابێ، بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە تەنلیفی مۆسیقایی لاوازە. بڕوانە: (ناچاری/١٠١/د) بەو دێڕەیش دەگوترێ کە لە موخەللەعی بەسیت بێ.

٢- مخلّع البسیط: جۆرێکە لە جۆرەکانی دەریای بەسیط، لەوێ باسی دێ.

## ٧٩- (خلّ):

ئەم زاراو و ناوانەی وا تیادا:

١- اختلال الوزن: کێشی لەنگ، اختلال: لەنگی، لاسەنگی، إخلال: لەنگکردن.

٢- الخلیل بن أحمد: داهێنەری زانستی عەرووز (بڕ: وشەیێ سەبارەت بەگرنگیی زانستی عەرووز، ژمارە/٢، لە سەرەتای کتێبەکەوە).

## ٨٠- (دائرة المختلف):

(دائرة -) و (مبدء).

## ٨١- (خلو):

دەگوترێ: شیعری خالّی لە ریدف، خالّی لە تەئسیس، خالّی لە وەسڵ، خالّی لە زیحاف، خالّی لە نەنگ... تاد. دەگوترێ: دروستە شیعر خالّی بێ لە ریدف و تەئسیس و سیله و خەروج و دەخیل، بەلاّم نابێ خالّی بێ لە پیتی ڕەوی.

## ٨٢- (خمریات):

ئەو جۆرە هۆنراوانەیە کە بەشان و باهووی مەی و بادەدا هەڵدەدەن، وەک چوارینەکانی عومەری خەیام.

## ٨٣- (تخمیس، مُخَمّس):

بەم زاراوانە دێ:

١- تخمیس و موخەممەس، کە جۆرێکن لە (مشطَّر) و (تشطیر) ئەوەیە کە چامەیێ، دابەش بکرێ بەچەند پارچەیێ، هەموو کۆمەڵێکی پێنج لەت بن، چوار لەتی پێشینیان هاوسەروا بن، لەتی پێنجەمیان نەگۆڕ بێ، هەموو لەتەکانیش لە چامەکەدا لەسەر یەک کێش بن، ئاوا:

آ- ااااا - ب ب ب ب ا - ج ج ج ج ا - د د د د ا... تاد.

ب- ااااا - ب ب ب ب ب - ج ج ج ج ج - د د د د د... تاد.

٢- تەخمیس بەوەیش دەگوترێ: هەستیارێ هۆنراوی هەستیارێکی تر پەسەند دەکا، دەچێ لە هەموو دێرێکی سێ لەتی تر زیاد دەکا، لەسەر هەمان کێش، لەتی یەکەمی گشت دێرێ، سێ لەتی تری هاوسەروا و هاوڕەوی لە پێشییەوە زیاد دەکا، تەخمیس لە کوردیدا هەر زۆر زۆرە بابمێنێ، بۆ جێگەی خۆی لە دەریا نوێکانا تەخمیس و موخەممەس واتە: پێنجینە، چونکە پێنج لەتە دێرە.

٣- تەخمیس جۆرێکی تری هەیە، کە بریتییە لە پێنج گۆشەیێ لە (الشعر المربع)دا، لە ماددەی (ر ب ع)دا ڕوون کراوەتەوە.

٤- (الخماسي): پێنج لک، یا پێنجینە، نموونەی زۆرە، وەک تەفعیلەی خوماسی: پێی پێنج پیتی (بڕ: أصول التفاعیل، البحور الخماسیة).

### ٨٤- (التخمیع):

واتە: سەردێڕی چامە خاڵی بێ لە تەصریع و لە تەقفیە، وەک سەردێڕی (لاَمِیَّةُ العرب) کە ئەم دێڕەیە (تەویل):

أقِیمُوا بَنِی أُمیِّ صُدُورَ مَطِیِّکُمْ

فَـأِنیِّ أَلی قَـوْمٍ سِـوَاکُمْ لأمْـیَلُ

لە کوردیدا وەک سەردێڕی ئەم چامەیەی ئەسیری کە لە پەسنی سید تەهای نەهری هەڵی بەستووە، کە یەکێ بووە لە شۆڕشگێڕە بەناوبانگەکانی کوردستانی تورکیا (هەزەج):

وتم بەگوڵشەنی وەتەن: بەکێیە ئاوی ڕەنگ و ڕووت؟

گوتی: نموود و شیرینم بەیادی شادیی سەی تەها

تەخمیع واتە: لەنگی، هەندێ بەم حاڵەتە دەڵێن (إصمات. بڕ: بەیتی مُصْمَت) هەندێ تر پێی دەڵێن (الوثب) هەندێ تر پێی دەڵێن: (تجمیع). ئیبنو ڕەشیق - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - لە العمدەدا دەڵێ: (کاتێ بێ سەروایی و بێ تەصریعی دادەنرێ بە(تەجمیع) یا بە(تەخمیع) کە دادەنرێ بەنەنگی سەروا، کە عەرووز و زەرب هاوکێش بن، یا دەست بدەن بۆ تەصریع، بەڵام ئەگەر عەرووز (فعلن ب ب -) بوو، وە زەرب (فعلن - -) بوو، وەک دووەمی بەسیت، وە نیوەی یەکەم تەصریع نەکرا بوو، ئەوە پێی ناگوترێ (تەجمیع) وەک (بەسیتی دووەم):

أإِنْ تَرَسَّمْتَ مِنْ خَرْقَاءَ مَنْزِلَةٍ مَاءُ الصَّبَابَةِ مِنْ عَیْنَیْكَ مَسْجُومُ

تەجمیع بۆیە پێی دەگوترێ تەجمیع، چونکە دوو جۆرە سەروا کۆ دەکاتەوە.

### ٨٥- (الشعر الأَخْیَفُ):

جۆرە هۆنراوێکە کە بەڕیز، وشەیەکی بێ نوختە بێ و وشەکەی پاشی، یا پێشی نوختەدار بێ. وەک (موخەللەعی بەسیط):

وَلاَ تَخُنْ عَـهْـدَ ذِي وِدَادٍ

ثَبْتٍ وَلاَ تَبْغِ مَـــا تَزَيَّفَ

مەبەست لە پیتی خاڵدار و بێ خاڵ ئەوەیە کە لە (-الحالی)دا ڕوونمان کردەوە (بڕ: ٦٠ -الحالی).

**(تخلّص):**

بەم چەند واتایە دێ: ١- ناوی شیعریی شاعیر، وەک: تخلُّصي مەلا عەبدولکریمی مدرس، نامییە.

٢- خۆ ڕزگارکردن و خۆ قوتارکردن.

## هەشتەم: پیتی دال: حرف الدَّال

د = ٤

### ٨٦- (الدّالية):

هەر چامەیێ پیتی ڕەوییەکەی دال بێ، پێی دەگوترێ: دالیە، وەک: دالیە النابغە. وەک چامەکەی نالی، کە سەردێڕەکەی لە (٢٢ - البیت - ٢ - هێڵکاریدا) ڕابورد، کە ئەمە بوو: (دَرَونِي لِدَار... وَسَرْدِه) چامە ئەگەر بەپێی پیتی ڕەوی لە دیوانە کوردییەکانا ڕیز بکرێ، دەبێ ئەم چامەیەی نالی لە پیتی دالا ڕیز بکرایێ، بەڵام لەبەر ئاسانکاری و سادەیی خوێنەری کورد ئەم چامەیە لە پیتی (هێ)دا دانراوە، وە هەروەها زۆر لە چامەکانی هەستیارانی کورد لە دیوانەکانیادا، بەوەستایانە ڕیز نەکراون.

### ٨٧- (الدّخيل):

(بڕ: ٤ - التأسيس). (المتداخل): (بڕ: ٢٢ - البيت ٧ - بەیتی مودەووەر).

### ٨٨- (المتدارك):

بەم واتایانە هاتووە:

١- بەحری موتەدارەک، واتە: دەریای بەسەرکراو (بڕ: ٤٧ - المحدث).

٢- سەروای موتەدارەک، ئەوەیە کە لە نێوانی دوو پیتە وەستاوەکانی سەروادا، دوو پیتی بزواو هەبێ، وەک (گەورە کچ، يُذْمَمُ = يُذْمَمُو) (بڕ: ٢٩ - المثفاه).

### ٨٩- (دق الناقوس):

(بڕ: ٤٧ - المحدث). کێشێکیشە لە کێشە نوێکان.

### ٩٠- (مِدَقّ القصار):

دەریایەکە لە دەریا نوێکاندا باسی دێ.

### ٩١- (المدمج):

(بڕ: ٢٢ - البيت - ٧).

٩٢- (الدُّوبيت):

جۆرە کێشێکە، زیاد لەسەر دەریا خەلیلییەکانە، لە کاتی شیکردنەوەی دەریای دوو بەیتا، خوا یار بێ، بەباشی ڕوونی دەکەینەوە.

٩٣- (الدّائرة):

بەم واتایانە هاتووە: (بڕ: ١٦ - مبدء - ٢).

١- (الدائرة العروضیة): بازنەی کێشی، کۆکەی (الدَّوَائِرُ العَرُوضِیة: بازنە کێشییەکان). بازنە کێشییەکان ئەم پێنجەن بەڕیز:

١- دائرة المختلف: بازنەی جیاواز: بازنەی موختەلیف، بۆیە وای پێ دەگوترێ، چونکە پێیەکانی دەریاکانی، لە ڕووی ژمارەی پیتەکانیانەوە، جیاوازن، ئەو شەش دەریایەی کە سەر بەم بازنەیەن، هەریەکێ لەوان لە دوو جۆرە پێی جیاواز دروست دەبن، لە چوار پێی پێنجی و لە چوار پێی حەفتی، پێنجییەکان ئەم دووەن (فعولن، فاعلن) حەوتییەکانیش ئەم سێیەن (مفاعیلن، فاعلاتن، مستفعلن) ئەم شەش دەریایە سیانیان بەکارهاتوون و سیانیان مهملن، لە پاش دەریای بەسیطەوە شیکردنەوەی ئەم بازنەیە و دەریاکانی ناوی بەدووروودرێژی دەبیژرێ. سەرەتای ئەم بازنەیە بەدەریای تەویل دەست پێ دەکا.

٢- دائرة المؤتلف: بازنەی تەبا: بازنەی موئتەلیف، بۆیە پێی دەگوترێ (موئتەلیف: ڕێک و تەبا) چونکە پێیەکانی دەریاکانی، لە ڕووی ژمارەی پیتەکانیانەوە هەموویان چوون یەکن و یەکسانن، کەواتە: تەبان ناکۆک نین، کە ئەم دوو پێیە حەفتییەن (مفاعلتن، متفاعلن). سەرەتای ئەم بازنەیە بەدەریای وافیر دەست پێ دەکا. لە پاش دەریای کامیلەوە ئەم بازنەیە بەنەخشە و وێنەوە دەنووسین. سێ دەریا، دووانی بەکارهاتوو، یەکێکی پشتگوێ خراو سەر بەم بازنەیەن.

٣- دائرة المجْتَلَب: بازنەی هێنراو: بازنەی موجتەلەب، بۆیە وای پێ دەگوترێ، چونکە پێیەکانی کێشەکانی - واتە: بەحرەکانی - هەموویان لە بازنەی جیاوازەوە هێنراون، کە ئەم سێ پێیەن (مَفَاعیلن) لە تەویل و (فاعلاتن) لە مەدید و (مستفعلن) لە بەسیط. سەرەتای ئەم بازنەیە دەریای هەزەجە. سێ دەریا سەر بەم بازنەیەن هەرسێکیان بەکارهاتوون. لە پاش دەریای ڕەمەلەوە وێنەی دەکێشین خوا یار بێ.

٤- دائرة المشتبە: بازنەی لەیەکچوو: بازنەی موشتەبەه، بۆیە وای پێ دەگوترێ:

چونکه پێیەکانی دەریاکانی لە یەکتر دەچن، پێی (فاعلاتن) لە (فاع لاتن) دەچێ، وە پێی (مستفعلن)یش لە (مستفع لن) دەچێ.

سەرەتای ئەم بازنەیە دەریای سەریعە، نۆ دەریا سەر بەم بازنەیەن، شەشیان بەکارهاتوون و سیانیان پشتگوێ خراون. (بڕ: پاش دەریای موجتەس).

٥- دائرة المتفق: بازنەی ساز: بازنەی موتتەفیق، بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە پێیەکانی دەریاکانی ڕێک و سازن، کە ئەم دوو پێیە پێنجییانەن: (فعولن، فاعلن). دوو دەریا سەر بەم بازنەیەن هەردووکیان بەکارهاتوون. سەرەتای ئەم بازنەیە دەریای موتەقاریبە.

بەشێوەی تریش هۆی ناونانی ئەم پێنج بازنەیە باس کراوە.

٢- دَوْر: خول: چەرخ: ئەو دێڕ و پارچانەیە کە لە نێوانی کۆمەڵە و پارچەکانی هۆنراوێکا، یا مەقامێکا، یا موەشەحێکا دووبارە دەکرێنەوە.

٣- (- المدوّر): (بڕ: ٢٢ - البيت - ٧).

## نۆیەم: پیتی ذال: حرف الذّال

ذ = ٧٠٠

پیتی ذال لە کوردیدا نییە، ئەو وشە ناکوردیانەی ذالیان وا تیادا، بەزێی بچووک گۆ دەکرێن، وا باوە هەر بەزێش دەنووسرێن، وەک: (ذَمْ = زَم = زەم، ذِکر = زیکر... تاد) (بڕ: پیتی ڕێ).

جا وەک لە پێشەوە گوتمان، هەندێ پیتی عەرەبی لە کوردیدا بەپیتێ تر گۆ دەکرێن. وەک (ث) و (ص) و (س) بە(س) گـۆ دەکـرێن، هەروا (ذ) و (ز) و (ض) و (ظ) بە(ز) گۆ دەکرێن، وە هەستیارانی کورد لە هۆنراوەکانیاندا ئەم جۆرە پیتانەیان کردووە بەڕەوی لەسەر ئەم دوو شێوەیە:

١- ڕەوی لە سەرواکاندا پیتە عەرەبییەکانە بەبێ زیاد و کەم، لەبەر ئەوە هەندێ بەعەرەبی دەیاننووسن و وەک عەرەبانیش گۆیان پێ دەکەن، وەک چامەی ژمارەیەکی پیتی (طێ)ی دیوانی نالی - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - کە ئەمانەن و ئاوایش نووسراون: (شەط، بەط، خەط، غەلەط، سەقەط، موختەلەط، نەمەط، نوقەط، شەمەط، وەسەط).

٢- جاری وا هەیە پیتە عەرەبییەکانیان کردووە بەکوردی و لەگەڵ هاوپیتە کوردییەکەیاندا بەکاریان هێناون، جا لەسەر ئەم یاسایە ئەگەر لە چامەی کوردیدا، پیتی ڕەوی لە دێڕەکاندا، جارێ (ث) بوو، وە جارێ (س) بوو، وە جارێ (ص) بوو، ئەوە دانانرێ بەنیکفاء، وەک لە عەرەبیدا شتی وا دەژمێررێ بەنەنگی سەروا، پێی دەگوترێ: (إکفاء) خانی - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - دەڵێ:

شەهری ژ موزەککەر و موئەننەس

بیلجوملە موزەییەن و مولەببەس

حەریقیش دەڵێ (هەزەجی مەحذووف):

بەتیرێکت کە جەرگت پارە کردم

مەکە دووبارە من هەر بەو خەلاصەم

لە دێڕەکانی تردا، وێنەی ئەم وشانە کراون بەسەروا: (هەباسم) بۆ حیسابی ئەبجەدیش بەچی نووسراوە، بەوە ژمارەی بۆ دادەنرێ (بڕ: ١١٦ - تێبینی).

### ٩٤- (تذكير المؤنّث):

(بڕ: ناچاریەکان/٨٧).

### ٩٥- (التذييل: الإذالة: المذال: المذالة: المذيلة: المذيّل):

ئەمانە هەموو وشەی عەرەبین، لە زمانا بەواتا کلک لێنانە، لە جۆری عیللەی زیادەیە (بڕ: نەخشەی/٣: عیللەتی زیادە). تەذییل هەق وایە ناوبنرێ: پەڕ لە پێ.

تەذییل بریتییە لە زیادکردنی یەک پیتی وەستاو (ساکن) لە دوایی وەتەدی کۆی کۆتایی زەرب، یا عەرووز و زەرب لە کاتی تەصریع و تقفیەدا، تەنیا دەچێتە سەر دەریای مەجزووء، لە کامیل و بەسیط و موتەدارەکا، مەرجە کۆتایی پێیەکە پیتی مەدد بێ. تەذییل نەگۆڕە. واتە: دەبێ لە گشت سەرواکانی دێڕەکانی چامەدا یا پارچەدا هەبێ.

لە کامیلدا (متفاعلن) و (مستفعلن) دەبن بە(متفاعلان) و (مستفعلان) لە بەسیتیشدا (مستفعلن) دەبێ بە(مستفعلان) لە موتەدارەکا (فاعلن) دەبێ بە(فاعلاَن).

(موذەییەل): واتە: داوێنەدار.

(الذُلُل من القافية): (بڕ: الحوش. لە - ح و ش - دا).

## دەیەم: پیتی ڕێ: حرف الرّاءِ

ر = ۲۰۰ (بڕ: الف/ ۳۵ - تێبینی)

۹٦- (راء):

ڕێ پیتێکە لە پیتەکانی ئەلفوبێی کوردی، دوو جۆری هەیە: ڕێی گەورە، وەک: (کەڕ، کڕ، بڕین، دڕین، دڕ، شەڕ، شڕ، مەڕ، مڕ). ڕێی بچووک وەک: (کەر، مر، برین، سارد).

زۆرتر ڕێی بچــووک دەبێ بەهاوســەروا بۆ ڕێی بچــووک و، ڕێی گــەورەیش دەبێ بەهاوسەروا بۆ ڕێی گەورە، وەک چامەکانی پیتی ڕێ لە دیوانەکانی نالی و مەحوی و سالم و وەفایی و ناری و سافی و ئەسیری و... تاد، بەڵام جاروبار و کەمە کەمە وا دەبێ ڕێی گەورە دەبێ بەهاوسەروا بۆ ڕێی بچووک، یا بەپێچەوانەوە. مەحوی دەفەرمووێ (هەزەج):

چڵ و چۆکە مەدە دەورم، خودا حافیظ نەصیحەت گەر

لەشەکوەی عیشق و لۆمەی عەقڵ ئەمن هەم لاڵم و هەم کەڕ

ئەم چامەیە نۆ دێڕە، لە دە وشەکانی سەرواکەیدا، هەشتیان ڕێی بچووکن و دووانیان ڕێی گەورەن، ئاوا: (گەر، پێغەمەر، وەروەر، بێ دەر، هەم لاڵم و هەم کەڕ، گەر، تەڕ، عەنبەر، خەنجەر، دەفتەر).

سالمیش لە وەڵامی چامەکەی نالیدا، لە کۆی سیی و شەش دێڕ، تەنیا پیتی ڕەوی دێڕێکیان ڕێی گەورەیە، ئەوانی تر ڕێی بچووکن، لەسەر ئەم شێوەیە: (سەحەر، خەطەر، کەمەر، گرتە بەر، پڕ لە شەڕ...).

بەڵام ئەسیری نموونەی جۆراوجۆری ئەم بابەتەی زۆرە، لە چامەیەکا، ئەم وشانەی کردووە بەسەروای دێڕەکانی: (دوور، نوور، کوور، سوور...) یا (ئەباری، بەجاری، لاڕێ، نەوبەهارێ،... تێنواڕێ) لە چامەیەکی ترا: (بەرە، فەڕە، ڕەهبەرە، سەروەرە، شەڕە...) یا (بەرە، فەرە، سەروەرە، شەڕە...). ئەم جۆرە سەروایە لە کێشی ژمارەیشا ڕوودەدا، وەک (مەولەوی/ ئەردەڵانی):

لوتکە وەک هیلال بەفری جاری دا

مانگی نوێی عەشقی دڵان دیاری دا

نالیش - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - دەڵێ (ڕەمەل):

بەرگی دنیا هێندە کورت و کۆنە و بازاڕییە

چونکە ناگاتە گونی دێوانەکەی، لێی عارییە

ڕێی قـەڵەو و ڕێی لاواز، کـە لە هۆنراودا بێن بەهاوڕەوی نە لە عـەرەبیـدا و، نە لە کوردیدا، نابن بەنەنگ بۆ سەروا، گەرچی شتی وا زۆر پەسەند نییە (بڕ: پیتی ذال).

### ٩٧- (الرباعي):

لە ماددەی (ر ب ع) ئەم زاراوە کێشییانە هەن:

١- (الرباعي): چوارینە، وەک چوارینەکـانی (خەیام - سـەلام) و چوارینەکـانی بابا طاهیـری عـوریان و... تاد. چوارین و چوارینە یەک شتن، چوارین هونەرێکی تایبـەتە، گەرچی پێیەکانی خەلیل بەکار دەهێنێ، بەڵام بەجۆرێکی نوێیـاو، روباعی جۆری زۆرە، وەک ١- الرباعي الخـالص. ٢- الرباعـي الأعـرج. ٣- الرباعي المنطق. ٤- الرباعي المردوف. ٥- الرباعي المرفَّل.

بادرێژە بمێنێ بۆ جێگەی خۆی. روباعی خالیص ئەوەیە هەر چوار لەتەکەی هاوسـەروا بن، چوارینەی تەواویشی پێ دەڵێن، روباعی ئەعرەج = روباعی معرج = چوارینی شەلە: چوارینی لەنگ، چوارینی خەسـاو (روباعي الخَـصَيِّ)یشی پێ دەڵێن. (بڕ: المربعـات). چوارین لە کێشی پەنجەیشدا هەیە، وەک چوارینەکانی (خەیام - سەلام) کە لەسەر کێشی دەبیین، لە جۆری چوارینی خەساو.

٢- (الشِّـعْـرُ المربَّع): هۆنراوی چوارگـۆشـە، جـۆرە هۆنراوێکە چوار نیـوە دێڕە، لەسـەر شێوەی چوارگۆشەیە، لە چەقـەکەیدا پیـتێکی نەگـۆڕ هەیە، پێی دەگوترێ: چەق، ئەو پیـتی چەقـە دەبێ بەسـەرەتا و کـۆتای هەر چوار نیـوە دێڕەکـە، چونکە چوار نیـوەتیـرەی لێ دەردەچێ، هەریەکەیان بەرەو گۆشەیێ، لە پیتی چەقـەکەوە دەست پێ دەکا و لەوێوە دەست بەخوێندنەوەی دەکرێ و، بەنیوەتیرەیەکا بەرەو گۆشەیێ دەڕوا و ئەو ضیلعەی لە موحیطەکە دەگونجێ لەگەڵیدا دەخرێتە سەری، تا دوا پیـتی، ئەوجا بەو نیوەتیرەیەدا کە لەگەڵ ئەم دووەدا، سێگۆشەیێ دروست دەکەن دەگەڕێتەوە بۆ سەر پیتی چەق، ئاوا لەسەر شێوەی ئەم شەکڵە:




ئاوا دەخوێنرێتەوە، لەم پارچەیەدا ڕێ دەبێ بەچەق، ئاوا (ڕەجەز):

رَاضَ الفـؤادَ عَلَى السُّلْوَانِ حَـتَّـى حـار

رَاحَ الـسـلـوّ وَألـقْـى فـي الحَـنـايَـا نـار

رانَ الأسى وَالنَّوَى هَـلْ فى بكائِـي عـار

رَاعَ النَّوى يا حـبـيـبي في الجَـفَا أوْضَـار

گەلێ جار ئەم جۆرە هونەرە دەکرێ بەپێنج گۆشە، یا بەشەش گۆشە یا بەحەوت گۆشە، یا بەهەشت گۆشە... تاد. وە زۆربەی ئەم جۆرە هۆنراوانە دەیکەن بەنەخش و نیگار و زەخرەفە و، لە چارچێوە و شتی وایان دەگرن و لە جێگەی بەرچاو، وەک پەندی پێشینان و مەتەڵ هەڵیاندەواسن، بەتایبەتی لە دیوەخان و مزگەوت و چاخانە و شوێنانی تری وا.

٣- (المربعات): چوارخشتەکی: (الدوبیت): (بحر السلسلة): (الرباعي).

مورەببەعات - یا چوارخشتەکی - دەبێ بەدوو جۆری سەرەکییەوە:

١- دووبیت، کـە لای نوێخـوازان بەدەریای سـیلسـیلە ناسـراوە، هەروا پێـشـی دەڵێن: چوارین. ئەمە جۆرە کێشێکە لە دەریا نوێکاندا باسی دێ خوا یار بێ.

٢- چوارخـشـتـەکی ئاسـایی، کـە لەسـەر کـێـشی دوو بـەیت نەبێ، بەڵکو لەسەر کـێـشی دەریایێ لە دەریاکـانی خەلیـل بێ، وەک هەزەج و ڕەمەل و مـوجـتـەس و ئەوانی تر، جۆری

یەکەم و جۆری دووەم جیاوازی سەرەکییان لە سیستەمی کێشدایە چونکە سیستەمی کێش لە جۆری یەکەما لە کێشی خەلیلی بەدەرە، بەڵام لە دووەما بەپێی کێشی خەلیلییە، لە سیستەمی سەروادا ڕەنگ بێ جیاوازییەکی ئەوتۆیان نەبێ. وەک لە جێگەی خۆیاندا ڕوون دەکرێنەوە بەپشتی خودای گەورە.

### ٩٨- (رجز):

لەم ماددەیە ئەم زاراوانە ڕۆنراون:

١- ڕەجەز لە زمانی عەرەبیدا، بەواتا لەرزین و لەرینە، بەحوشترێ کە هەردوو ڕانی لەرزۆک بێ دەگوترێ: (ڕەجز).

پیاوێ هەبوو، لە فەقێیەتیدا ئەوەندە حەزی لە سەما و هەڵپەڕکێ و خۆلەرزانەوە بوو، ناوی دەرکردبوو بە(ئەحمەد لەرزانە!) کەواتە: بەحری ڕەجەز بەکوردی پەتی، واتە: دەریای لەرزانە!.

٢- لە زاراوی عەرووزیشا بەحری ڕەجەز دەریای دووەمە، لە بازنەی سێیەم، بۆیە بەم کێشە دەڵێن: ڕەجەز، چونکە لەرزین و لەرەلەری زۆری وا تیادا. (بڕ: بەحری ڕەجەز لە کێشە خەلیلییەکاندا).

٣- الراجز: الرجّاز: ڕەجەزەوان: کەسێکە هۆنراو لەسەر کێشی ڕەجەز بهۆنێتەوە. (بڕ: الزجّال).

٤- الارجوزة: ئەو هۆنراو و پارچە و غەزەل و چامە و پەڕاوانەیە کە لەسەر کێشی ڕەجەز دانراون، کە بۆ زۆر بابەت و مەبەستی جیاجیان، ژمارەی ئورجوزەکان لە سەدەوە هەتا هەزار دێڕ دەبن، بەناوبانگترینیان ئەلفییەکەی ئیبنو مالیکە، کە لە بابەت زانستی نەحوەوەیە. شیعری عەرەبی ستوونی دەبێ بەدوو بەشی سەرەکییەوە: (ڕەجەز و قەصید) (بڕ: ١١٥ - المزدوج).

٥- الرجز المزدوج (بڕ: المزدوج) و (الرجز المرفل) بڕ: (المرفل).

٦- (الأرَاجِيزُ الْمَشْطُورةْ): (٢٢ - البيت - بەیتی مەشطور) و (المزدوج).

### ٩٩- (الرِّدْف):

ریدف پیتێکە لە شەش پیتەکەی سەروا، بریتییە لەو پیتی مەدد و لینەی کە ڕاستەوخۆ، وا لە پێش پیتی ڕەوییەوە، پیتێکی نەگۆڕە، لە کوردیدا جۆری زۆرە. بڕوانە

پیتی مەدد و لین و سەروا.

دەگوترێ: قەصیدەی مەردوفە، واتە: چامەی ریدفدار، حەرفەکانی ریدف: ئەلف و یێ و واوە (بڕ: ٥٦ - الحزم).

ئەم جۆرە زاراوانە: ریدفی مەحض: ریدفی پەتی، ئەلفە، چونکە لە ریدفدا یەک جۆری هەیە، سناد الردف، انواع الردف، جۆرەکانی ریدف ئەم سیانەن: صولب و لین و تێکەڵ، صولب: ئەو واو و یێ وەستاوانەن، کە بزوێنی پیتی پێشیان لە چەشنی خۆیان نین، وەک (عَیْن، هَوْن، بەین، تەون، وەی وەی، هەی هەی) ریدفی نەرمیش - واتە ریدفی لینیش - ئەوەیە پێشی بزوێنێ بێ لە چەشنی خۆی، وەک (نور، میر، بیر، حور، صور، قیر). ریدفی تێکەڵیش کە پێشی دەگوترێ (تعاقب الردفین) ئەوەیە کە لە یەک چامەدا سەروای هەندێ لە دێڕەکان واو بێ سەروای هەندێکی تریان یێ بێ. ئەم جۆرە زاراوانە بەتێروتەسەلی لە سەروادا دێن. (بڕ: معاقبە).

(الردیف):

دەگوترێ: قافیەی مەردوفە، واتە: سەروای ریدفدار، بۆ قافیەی موتەرادیفە بڕوانە (٢٩ - المثفاة). سەروای موتەرادیف ئەوەیە کە لە سەروای موقەییەددا، لە ئاخریەوە دوو پیتی وەستاو بەشوێن یەکتردا بێن، وەک (جەواد، طەرراد، نان، خان).

(الترادف): هاوتایی

## ١٠٠- (ترخیم):

(بڕ: ناچاریەکان/٤٩).

## ١٠١- (مرسل):

بڕوانە (حەزمی مورسەل - ٥٦)

شیعری مورسەل - واتە: شیعری رەها - جۆرە هۆنراوێکی بێ سەروایە، شاعیرە نوێخوازەکان دایانهێناوە، پێشی دەگوترێ: هۆنراوی بێ سەروا، ئەم جۆرە هۆنراوە کێشی هەیە، سەر بەبەحرێکە، بەڵام سەروای نییە، بەڕای من شتی وا لە کێشی شیعری پەنجەدا زۆر ئەستەمە، چونکە نازانرێ سەرەتا و بنەتای شیعرەکان کامانەن، شیعری رەها (مورسەل) وەک (رەصافی - طەویل):

كَأَنِّي مِنْ قَبْرِي انبَعَثْتُ وَقَدْ مَضى
عَلَيَّ مِنَ الْأَعْـوامِ فِي جَـوْفِـه أَلْفُ
فَأَلْفَيْتُ أَنَّ الْأَرْضَ قَدْ حَالَ وَجْهُهَا
بِصُنْعِ الأُلى كَانُوا عَلَيْهَا يَعِيشُونَا

**١٠٢- (الرسّ):**

(بڕ - ٥٥ - حركة - آ).

**١٠٣- (ترفيل):**

وشەیەکی عەرەبییە، واتە: دامەن شۆڕی، لە کوردیدا ناوبنرێ: چاک شۆڕ و چاک شۆڕی پڕ بەپێستییەتی. لە زاراوی کێشزانیدا لە جۆری عیللەیە بەزیادکردن، نەگۆڕە، دەبێ لە هەموو دێڕەکاندا پەیڕەوی بکرێ، بریتییە لە زیادکردنی سەبەبێکی سووک (بڕگەیەکی درێژ) بۆ وەتەدی کۆی پێی کۆتایی مەجزووئی کامیل و، بۆ وەتەدی کۆی پێی کۆتایی مەجزووئی موتەدارەک، بەمەرجێ پیتی کۆتایی پێ مورەففەلەکان پیتی مەدد بێ، دەچێتە سەر پێی زەرب و بەس، تەنیا لە کاتی تەصریع بەزیادەدا دەچێتە سەر عەرووزیش، تایبەتە بەمەجزووئی کامیل و مەجزووئی موتەدارەکەوە. بەڵام لە کوردی و فارسیدا: ڕەجەزی مورەففەل و چوارینەی مورەففەل هەیە. لە دەریاکانا باسیان دێ، (ر: نەخشەی/٣ - عیللەی زیادە/١).

**١٠٤- (مراقبة):**

(١٨ - البرئ) هەروا بۆ (تراقب) + (١٨٢ - المعاقبة).

**١٠٥- (الشعر الأرْقط):**

ئەو جۆرە شیعرەیە، کە جۆرە پەهلەوانییەکی واتیادا، وەکو هۆنراوی تەوئەم و حالی. ئەرقەط بەعەرەبی واتە: شڵ، پڵ پڵ، بازوو، دەڵێن: حيَّة رقطاء، واتە: ماری شڵ، یا شڵە مار، کە پڵ پڵ بێ. جا هۆنراوی شڵ، یا بڵێین: شیعری پڵ پڵە ئەوەیە کە بەرودوا، بەڕیز پیتێکی خاڵدار بێ و پیتێکی بێ خاڵ بێ، وەک (خەفیف):

مُخْلِفُ مُتْلِفُ أَغَرُّ فَرِيدُ    نابِهُ فَاضِلُ ذَكِيٌّ أَنُوفُ

بڕوانە (توأم و حالی و أخيف).

**١٠٦- (تراكب):**

له ماددەی (ر ک ب) ئەم زاراوە کێشییانە باوە:

١- سەروای موتەراکیب، یا قافیەی موتەراکیبە ئەوەیە: کۆتایی زەرب فاسیلەیەکی سووک بێ، کە پێشی پیتێکی وەستاو بێ، وەک (عَنْ سَهَرِی) لە عەرەبیدا و (را لە چەمەن) لە (لە بەهارا لە چەمەن) لە کوردیدا.

٢- دەگوترێ: (البحور المركبه) بڕ: (١٤ - بەحر - ٢) دەگوترێ: (الزحاف المركّب) واتە: زیحافی لێکدراو (بڕ: نەخشەی/٢ زیحافە لێکدراوەکان).

**١٠٧- (ركض الخيل):**

ناوێکە لە ناوە زۆرەکانی بەحری موتەدارەک، گوایە بەحری موتەدارەک لە ئیقاع و ترپە ترپا، لە خرمە خرمی سمی ماین و ئەسپ دەکا.

**١٠٨- (ركن):**

واتە: بنچینە: بناغە: پێ: تەفعیلە. دەگوترێ: ئەدەواتەکان - واتە: بنەڕەتەکان - لە پیتەکانی شیکردن (تەقطیع) دروست دەبن، کە بریتین لە سەبەب و وەتەد و فاسیلە، لە ئەدەواتیش روکنەکانی زانستی عەرووز دروست دەبن کە پێشیان دەگوترێ: تەفعیلەکان: روکنەکان: پێیەکان. کە دە تەفعیلەن (بڕ: أصول التفاعيل).

**١٠٩- (رمل):**

بەحری رەمەل، یەکێکە لە دەریا خەلیلییەکان.

**١١٠- (تَرَنُّم):**

درێژکردنەوەی پیتی مەددی کۆتایی سەروا، لە کاتی خوێندنەوەی شیعر بەئاواز و گۆرانییەوە. بۆ کاتی سەروا. (بڕ: حروف الترنم).

**١١١- (روضة):**

(الأبجديه - ٣).

١١٢- (روي):

پیتێکی بنچینەیی ڕەسەنە لە شەش پیتەکەی سەروا، شیعر بەبێ رەوی نابێ، شیعری ژمارەییش پیتی ڕەوی هەیە. تەنیا لە شیعری رەها (مورسەل)دا پیتی ڕەوی نییە. (بڕ: حروف القافیة) لە سەروادا.

## یازدەهەم: پیتی زێ: حرف الزای

ز = ٧

بڕوانە: سەرەتای پیتی ذال و (١ - الأبجدیە - تێبینی - ج) + (الف/ ٣٥).

**١١٣- (زجل):**

جۆرە شیعرێکی عامی (رەشۆکی = جەڵەبی)یە، لە دەریا نوێکانا باسی دێ، خوا یار بێ. هەندێ جۆری لە غەرابەت و سەیری و وێچوون و پاڵدانی سیفەتی دژ وەلای دژی و تێکەڵی و پێکەڵی و بێ سەروبەری و هاتوهاوار و پێ داگرتن و زیادەڕەوی لە دوور ڕۆیشتن و داهێنانی شەطەحاتی شیعری و پێیەک لە وشکانی و پێیەک لە دەریا و سواربوونی ئەسپی خەیاڵی بێ زین و ڕەشمە و جڵە و عەوام هەڵخەڵەتان بەوشەی زەبەلاحی بێ ناوک و لاسکایی ورێنەی نووستوو و گروگاڵی کۆرپەڵەدا، هەندێ جۆری زەجەل، لەم ڕووەوە دەق لە شیعرە باڵدارەکانی شیعری نوێی بێ کێش و سەروا دەکا، کە زۆریان بەم شێوەیەن: (شیعرێ لە بەحری قرقێنە، لە دەریای سوورا بچێنە، لە بۆی گونکێ هەوا بێنە، لەباتی خوێ پری بکە لە ترخێنە، بیکە بەنانێ بەقەد دەشتی شارەزوور، بیدە بەتەنوورەکەی دڵی منەوە، کە بۆ تەماشای ڕوومەتی ئەم کچە ڕەشە، سوورە، شینە، مۆرە، کوردە، عەرەبە، تورکە، نێرەمووکە، وا کوێر دەبێ و شەمشەکوێرەکان شەڕیانە لەسەر چاوساغییەکەی! ئەی بەفری گەرم! ئەی سەهۆڵی برژاو، ئەی چیای قووڵ، ئەی دەشتی سەختی بێ بەختی بێ دار و درەختی لووتکە بەرز! ئەی ماسییە فڕیوەکان، ئەی کیسەڵە نەشمیلە جوانەکان جێم مەهێڵن تۆ سەری شەیتان، تۆ چاوی خۆتان ئەی بۆ ئەمیرێ، عەقڵی بەقەد عەقڵی کەرە پیرێ لەم چامە بێ مەعنا غەیبییە تێبگا... تێبگا و دوو لەعنەتم بۆ بنێرێ!!).

(زجّال): مامۆستا عەبدوڕەزاق بیمار دەڵێ: لە سەردەمەکانی عەباسی و ئەندەلوسییەکاندا (أرجوزە) بوو بەهونەرێکی میللی و بەدانەرەکەیان دەگوت: (زەجال). زەجەل جۆری زۆرە، زۆر لە زەجەلەوانەکان بێ سەوادن، هێز یان بەعەرووز و زمانی فوصحا ناشکێ، لەبەر ئەوە بەزاری خۆجێیی زەجەل دادەنێن، ئەم جۆرەیان بەکوردی پێیان دەگوترێ: شایەر، کە جۆرە هەستیارێ نەخوێندەواری میللین.

**١١٤- (زحاف):**

وشەی زیحاف لە زمانی عەرەبیدا، بەم واتایانە هاتووە:

١- کشان، دەگوترێ: زەحفی جەیش: سوپاکە کشا بەرەو بەرەی شەڕ. خشان وەک خشانی مار، خۆ بەکێشکردن، خلیسکان، قنگە خشکێ. ئەمە واتای زمانی ئەم وەشەیەیە، دەی بابزانین، وەجهە شەبەهـ لە نێوانی مەعنای لوغەوی و زاراوەییدا چییە؟

٢- لە زاراوی زانستی کێشدا: بریتییە لە جۆرە گۆڕانێ، لە پێ بنچینەییەکاندا، کە بەپێی شوێنەکەی لە پێیەکاندا، کۆمەڵێ ناوی جیاجیای بۆ دانراوە، زیحاف - واتە: خشکەیی، یا خشکە - بەزۆری دەچێتە سەر دووەم پیتی سەبەب لە پێیەکانی حەشو (ناوەخن)دا و کەم کەمەیش دەچێتە سەر دووەم پیتی سەبەب لە عەرووز و زەربدا، بەلام ناچێتە سەر وەتەد، گۆڕان (زیحاف)پتر پەیوەندی بەپێیەکانەوە هەیە، هەتا بەدەریاکانەوە، وا بڕیارە کە زیحاف بگۆڕ بێ نەگۆڕ نەبێ، بەلام هەندێ زیحافی تایبەتی هەیە نەگۆڕە، پێی دەگوترێ: (زیحافی نەگۆڕ: زیحافی عیللەئامێز) بڕوانە: نەخشەی/٦ زیحافی عیللەئامێز. زیحاف لە زۆر ڕووەوە دابەش دەکرێ و جۆری زۆری لێ پەیدا دەبێ، وەک: زیحافی تاک، کە پێشی دەگوترێ: زیحافی بەسیت واتە: زیحافی سادە، کە بریتییە لەوە پێیەکە یەک زیحافی تیادابێ، وەک (فاعلن) بەخەبن ببێ بە(فعلن ب ب-).

وەک: زیحافی لێکدراو، کە پێشی دەگوترێ: زیحافی مورەککەب، یا زیحافی موزدەوەج، واتە: جووت زیحاف، کە ئەوەیە پێ زیحافکراوەکە دوو گۆڕان (زیحاف)ی تیادا بێ، وەک: (مستفعلن) بەخەبن و تەی دەبێ بە(فَعِلَتُنْ ب ب ب -). کەواتە لەم ڕووەوە دوو: زیحافی سادە و لێکدراو.

زیحاف وەک گۆڕانکاری ڕووت بریتییە لە یەکێ لەم دوو کردارە:

آ- کرتاندنی پیتی دووەمی سەبەب، چ سەبەبی سووک بێ و چ سەبەبی قورس بێ. وەک (فاعلن) بەخەبن، واتە: بەکرتاندنی ئەلفەکەی، کە پیتی دووەمی وەستاوی سەبەبی سووکە، دەبێ بە(فعلن ب ب -). وەک (مُتَفَاعِلُنْ) بەوەقص، واتە: بەلابردنی تێکەی، کە پیتی دووەمی بزواوی سەبەبی قورسە، دەبێ بە(مَفَاعِلُنْ).

ب- وەستاندنی پیتی بزواوی دووەمی سەبەبی قورس، وەک: (مفاعلتن) لە وافیردا، بەعەصب دەبێ بە(مَفَاعیلن ب ---) و (متفاعلن) بەئیضمار دەبێ بە(مستفعلن).

ئیتر ئەم دوو کردارە، بەپێی شوێنەکەیان لە پێیەکەدا، کە پیتی دووەمە، یا چوارەمە، یا

پێنجەمە، یا حەوتەمە، زاراوەی تایبەتی جیاجیای بۆ دانراوە، کەواتە لەسەر ئەم بنیاتە گۆڕانە سادەکان دەکەنە کۆی دوو لە چوار، یەکسانە بەهەشت، کە ئەمانەن: خەبن، تەی، نیزمار، عەسب، قەبز، عەقل، وەقس، کەف. بەڵام بەهۆی زیحافی لێکدراوەوە چەند زاراوێکی تریش دروست دەبن کە ئەم چوارەن: خەبل و خەزل و شەکل و نەقص، کەواتە کۆی گۆڕانی سادە و گۆڕانی لێکدراو دەکاتە: کۆی ٨ + ٤ = ١٢ گۆڕان.

٣- من پێشنیار دەکەم و بەرە بەرە خۆشم بەکاری دەهێنم:

آ- زیحاف ناو دەنێین (گۆڕان = زحاف).

ب- عیللە ناو دەنێین (گۆڕین = عیللە).

ج- تەغییر بەشێوەیەکی گشتی، چ بەزیحاف بێ، یا بەعیللە بێ، یا بەهەردوو لا بێ ناو دەنێین: (گۆڕانکاری = گۆڕان و گۆڕین).

جا پاش ئەمە کاتی ئەوە هاتووە کە بڵێین:

بەبۆچوونی من، پەیوەندی مانای زمانی لەگەڵ مانای زاراوەییدا، لەم شوێنەدا ئەم دوو جۆرە لەیەکچوونەیە:

١- زیحاف لە پێ گۆڕاوەکەدا، لە چاو پێیە ساخەکەدا، جۆرە لەنگی و خوێەکێشکردنێکە، لەبەر ئەوە دەبێ بەهۆی ئەوە کە کێشە گۆڕاوەکە لە چاو کێشە ئەصڵییەکەدا قورس بکشێ، وەک بەخشکەیی و قنگەخشکێ بڕوا ئاوا بێ.

٢- جۆرە سوان و خلیسکان و لاوازی و گۆڕانکارییەک لە پێیەکەدا پەیدا دەبێ.

ئەمەیش نەخشەی جۆری زیحاف بەپێی پلەی پیتە دەسکاری کراوەکە لە پێکەدا:

١- گۆڕانی سادە = زیحافی موفرەد = زیحافی بەسیط:




١- خەبن = کرتاندنی پیتی دووەمی وەستاوی سەبەبی خەفیف: (فاعلن ـــ فعلن).

٢- وەقص = کرتاندنی پیتی دووەمی پێ کە دووەمی سەبەبی قورس بێ. وەک (متفاعلن ـــ مفاعلن = ب - ب -).

٣- ئیزمار = وەستاندنی پیتی بزواوی پێ کە دووەمی سەبەبی قورس بێ وەک (متفاعلن ـــ مستفعلن - - ب -).

٤- تەی = لابردنی پیتی وەستاوی چوارەمی پێ، بەمەرجێ دووەمی سەبەبی سووک بێ. وەک (مستفعلن ـــ مفتعلن - ب ب -).

٥- قەبز = لابردنی پیتی پێنجەمی پێ، بەمەرجێ دووەمی سەبەبی سووک بێ، وەک (فعولن ـــ فعول = ب - ب).
٦- عەقل = لابردنی پیتی پێنجەمی پێ، بەمەرجێ دووەمی سەبەبی قورس بێ وەک (مفاعلتن ـــ مفاعلتن ـــ مفاعلن = ب - ب -).
٧- عەسب = وەستاندنی پیتی بزواوی پێنجەمی پێ، بەمەرجێ دووەمی سەبەبی قورس بێ وەک (مفاعلتن ـــ مفاعیلن = ب - - -).

دەچێتە سەر پیتی پێنجەم

٨- کەف = لابردنی پیتی وەستاوی حەوتەمە لە پێدا، بەمەرجێ دووەمی سەبەب بێ. وەک (مفاعیلن ـــ مفاعیل = ب - - ب). یا وەک (فاعلاتن) بەکەف دەبێ بە(فاعلات = - ب - ب).

دەچێتە سەر پیتی حەوتەم

## ٢- گۆڕانی لێکدراو: جووت زیحاف: زیحافی موزدەوەج:

١- خەبل = بریتییە لە لابردنی پیتی دووەم و چوارەم = خەبن + تەی = خەبل. وەک (مستفعلن ـــ فعلتن = ب ب ب -).
٢- خەزل = بریتییە لە وەستاندنی پیتی دووەمی بزواو و لابردنی پیتی چوارەمی وەستاو = ئیزمار + تەی = خەزل. وەک (متفاعلن ـــ مفتعلن = -ب ب-).

دەچێتە سەر پیتی دووەم و چوار

٣- شەکل = خەبن + کەف. وەک: (مستفعلن ـــ مفاعل = ب - ب ب).

دەچێتە سەر دووەم و حەوتەم

٤- نەقص = عەصب + کەف. وەک (مفاعلتن ـــ مفاعیل = ب - - ب).

دەچێتە سەر پێنجەم و حەوتەم

ئەوەی کە دەڵێین: گۆڕان (زیحاف) پتر پەیوەندی بەپێیەکانەوە هەیە هەتا بەدەریاکانەوە، مەبەست ئەمەیە: بەوێنە دەگوترێ: خەبن لە (فاعلن)دا و لە (مستفعلن)دا، ناگوترێ: خەبن لە بەحری رەمەل، یا لە بەحری رەجەزا، گەرچی ئەم جۆرە زاراوانەیش بەکار دەهێنرێن، وەک: رەجەزی مەتوی، بەسیتی مەتوی... تاد.
بەکورتی: زیحاف بگۆڕە نەگۆڕ نییە، دەچێتە سەر یەک پیت کە دووەمی سەبەبە، بەمەرجێ دووەم یا چوارەم، یا پێنجەم یا حەوتەم پیت بێ لە پێدا، بریتیشە لە وەستاندنی

پیتی بزواو، یا له لابردنی پیتی وەستاو (بڕوانه: نەخشه و لیستەکانی گۆڕان و گۆڕینەکان = زیحاف و عیللەتەکان).

### ١١٥- (المزدوج):

لەم ماددەیە ئەم جۆرە زاراوانە هەیە:

١- الزحاف المزدوج: (بڕ: الزحاف).

٢- القافية المزدوجة: جووت سەروا: مەسنەوی.

٣- هۆنراوی مەسنەوی، که له عەرەبیدا زۆرتر ناوی بەشیعری موزدەوەج دەرکردووە، که ئەوەیە: هەستیاری کۆمەڵێ هۆنراو، یا دێڕێ، یا دوو دێڕ، دادەنێ، خۆی نەبەستێتەوە بەیەکێتیی سەرواوە، بەڵکو لەباتی ئەوە، لەتی یەکەم و لەتی دووەمی دێڕ هاوسەروا دەکا، ئیتر سەروای ئەو دوو لەتەیە پەیوەندی نییە بەسەروای دێڕەکانی تری پێش و پاشیەوە، زۆرتر شیرازەی نێوانی دێڕەکانی هۆنراوەکە، یەکێتی واتا و بابەتە، دەق بەپێچەوانەی چامەوە، چونکه لەو دوا یەکێتیی سەروا مەرجە، نەوەک یەکێتیی بابەت. هەروەک گەورەترین نیشانەی هۆنراوی مەسنەوی یەکێتیی پیتی ڕەوییە له عەرووز و زەربی دێڕەکه خۆیدا و بەس، وەک بڵێی هەموو دێڕێ بۆ خۆی بەتەنیا چامەیەکی سەربەخۆ بێ، ئیتر ئەو کۆمەڵە هۆنراوە، یا ئەو هۆنراوە با تاقە دێڕێکیش بێ، له هەر بەحرێ بێ دەبێ، وە بەهەر کێشێ بێ - وەک عەرووزی و بڕگەیی - دەبێ.

دیاریترینی ئەم جۆرە هۆنراوە ڕەجەزی موزدەوەجە، که بەکۆمەڵەکەی دەگوترێ: ئورجووزە، که وەک دەزانین، هەستیار سەربەستی و ئازادی تەواوی هەیە که له هەموو دێڕێکیدا، هەروا له هەموو دێڕێکی هۆنراوی مەسنەوی تردا، پیتی ڕەوی بگۆڕێ، وە له یەکە یەکەی دێڕەکانی، سەروای جیاجیا پیادە بکا. بۆ نموونە: له سەراسەری هۆنراوەکانی شیرین و فەرهاد و مەم و زین و نەوبەهار و ئەحمەدی و دوورشتە و شانامەی فیردەوسی و داستانە درێژەکانی کوردی و فارسی و عەرەبی و ئەلفیەی ئیبنو مالیک و ئیقبالنامە و عەقیدەی کوردی شێخ سەمیع و... تاد، له سەرجەمی ئەم کتێب و داستانانەدا هەردوو نیوە دێڕێ لەسەر سەروایەکی تایبەتە، ئەو سەروایە پەیوەندی نییە بەسەروای دێڕەکانی تری پاش و پێشیەوە.

وا باشه بەکۆمەڵە شیعری مەسنەوی له بەحری ڕەجەز وەک باوە بگوترێ ئورجووزە، ئەگەر له بەحرەکانی تر بوو پێی بگوترێ مزدوجە، وەک: ئورجوزەکەی ئەبو عوتاهیە که

چوار هەزار دێڕە، بەناوی: (ذات الحكم) وەک مـوزدەوەجەکەی ئەحـمـەد شـەوقی، کـە لە بەحری رەمەلە، کە لەسەر ئەم شێوەیە:

كُـلُّ حَيٍّ مَا خَلاَ اللـــهَ يَمُوتْ    فَاْتْرك الكِبْر لَـــهُ وَالجَبَرُوتْ
وَأرِحْ جَنْبَـكَ مِـنْ دَاءِ الحَسَـــد    كَمْ حَسُودٍ قَدْ تَـوَفَّاهُ الكَمَـدْ
وَإذا أُغْضِبْتَ فَاغْضَبْ لعظيـمْ    شَرَفٍ قَدْ مُسَّ أوْ عِرْضٍ كريمْ
وَتَجَنَّبْ في الصغيراتِ الغَضَبْ    إنَّـــهُ كَالنَّارِ، والرُّشْدُ الحَطَبْ

خۆ ئەگـەر لەسـەر کـێـشی پەنجە بوو پێی بـگوترێ: مـەسنەوی، وەک زۆربەی غـەزەل و پارچە شیعرەکانی دیوانی مەولەوی و گۆران و شاعیرە نوێکان کە لەسەر کێشی پەنجەن. یا پێی بگوترێ: جووت سەروا. (بڕ: رجز) + (بەحری تەویل – تێبینی – ۱).

### ۱۱٦- (مستزاد):

جـۆرێکە لە هونەرەکـانی هۆنراوی کـوردی، جـۆری زۆرە، بەپشـتی خـودا لە هونەرە شیعرییەکاندا لەسەری دەدوێین (بڕ: تَشْرِيع).

تێـبـینی: پیـتی ژێی کـوردی لە ژمارەی جـومـەلدا، بەقـەد زێ ژمـارەی بۆ دادەنرێ، کـە دەکـاتە (۷) بەڵام پیـتـەکانی (ذ) و (ض) و (ظ) کـە لە کـوردیدا بە(ز) دەخـوێنرێنەوە، هەسـتیـار بەچی نووسـیبوونی بەوە ژمارەیان بۆ دادەنرێ. بەوێنە: (ضـابط = ض + ا + ب + ط = ۸۰۰ + ۱ + ۲ + ۹ = ۸۱۲) بەڵام هەمـان وشە ئەگـەر ئاوا بنووسـرێ (زابت) دەکاتە: (ز + ا + ب + ت = ۷ + ۱ + ۲ + ٤۰۰ = ٤۱۰). وە هەروەها.

گەرچی بەم جۆرە ڕوونکردنەوانە شـارەزاییش شارەزاتر دەبێ، بەڵام مەبەسـتی سـەرەکی فێرکردنی خەڵکی ناشی و کۆڵییە کە مەبەستییەتی ئەم جۆرە شتە فێر بێ.

## دوازدەهەم: پیتی سین: حرف السِّین

س = ٦٠

### ١١٧- (سبب):

سەجادی ناوی ناوە (هۆ) لە نرخشناسیدا دەڵێ: - ڕەحمەتی خودای لێ بێ -: (هۆ - کە سەبەبە - لەسەر دوو جۆرە، هۆی سووک، هۆی گران). (بڕ: بڕگە: بڕگەی عەرووزی: یەکەم).

### ١١٨- (السُّبَاعِیّ):

(بڕ: أصول التَفاعیل/ ٩). سوباعی واتە: حەفتی، یا حەوتینە، وەک: تەفعیلەی سوباعی: پیتی حەفتی، هۆنراوی سوباعی: حەوتێن: حەوتینە. وەک: چوارین و چوارینە، بەحری سوباعی: دەریای حەوت پیتی (بڕ: ١٤ - بحر/ ٣).

### ١١٩- (إسباغ):

(تسبیغ): ئاودامەنی، لەبەرپێخشان: تێروتەسەلی لە زاراویشدا: پترکردنی پیتێکی وەستاوە بۆ سەبەبی سووکی کۆتایی پێی زەرب، لە جۆری عیللەیە بەزیادکردن، نەگۆڕە، لەبەر ئەوە دەبێ لە زەربی یەکەم دێڕی چامەوە تا زەربی دوا دێڕی پەیڕەوی بکرێ. بەمەرجێ دروستە کە پێی زەرب ئیسباغ بکرێ، کە پیتی کۆتایی پیتی مەدد بێ.

لە شیعری عەرووزی عەرەبیدا ئیسباغ تەنیا دەچێتە سەر کۆتایی زەربی مەجزووئی ڕەمەل، واتە (فاعلاتن)ی زەرب دەبێ بە(فاعلاتانْ = - ب - -ْ). وەک (ڕەمەل):

كُلَّمَا قَابَلَهُ شَخْـ    صٌ رَأى صُورَتَهُ فِيهْ

لە عەرەبیدا ئیسباغ لە عەرووزا بۆ تەصریعە، ئیسباغ لە کوردیدا لەم دەریایانەدا بەکارهاتووە: (ڕەمەل و موجتەس و هەزەج و خەفیف و موزاریع و موتەقارەب).

خۆ ئەگەر بیسەلمێنین کە ئەم شیعرەی حەمدی هەزەجی هەشتی موسبەغە، ئەوا دەردەکەوێ کە لە کوردیدا مەرج نییە پیتە وەستاوەکەی سەبەبە سووکەکەی، کە ئیسباغ دەچێتە سەری، پیتی مەدد بێ، لە کوردیدا. (هەزەجی هەشتی موسبەغ - حەمدی):

نە عەقڵم پێ دەمێنێت و، نە دەم مێنێ زمانی عەرض

کە دەیبینم، بڵێم چی نیمە یارایی بەیانی عەرض

چونکه (ض) که پیتی ئیسباغه، رێکەی پێشی پیتی کۆتایی سەبەبی سووکی کۆتایی (مفاعیلن)ە، دیارە کە (رێ) پیتی مەدد نییە. خوا یار بێ لە بەحرەکانا نموونەی زۆری ئیسباغ دێ.

١٢٠- (سجع):

سەرواداری. ئەوەیە: چەن ڕستەیێ، بەتایبەت کورت، سەروایان هەبێ بەڵام کێشیان نەبێ. وەک لە عەرەبیدا دەڵێ: (المنية ولا الدنيّة) بەکوردیش وەک: (مردن نەک سەرشۆڕی قەبووڵ کردن) و (کەم بژی و کەڵ بژی) و (ڕاستی ڕەفتی، چەفتی کەفتی) و (لە دوای چووە مەچووە) و (کەرە مەمرە بەهارە، کورتانت بۆ دێنم لەو شارە) چەند کتێبێکی جوان و بەنرخ، بەهرەیان لە یاسا و سیستەمی سەجع و سەرواداری وەرگرتووە، مەولودنامەی جوان بەم شێوەیە دانراوە، پۆپەی سەجعداری و سەرواداری لە عەرەبیدا، لە مقاماتەکاندا دەردەکەوێ، وەک مەقاماتی حەریری و هەمەدانی و یازجی و ئەحدەب. مەردۆخ - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - دەفەرمووێ: (سجع در نثر استعمال میشود. قافیه در نظم) واتە: سەجع لە پەخشانا بەکار دەهێنرێ، سەروایش لە شیعرا).

لە ڕاستیدا زۆرینەی شیعری نوێی کێشی پەنجە، لەو بابەتانەی کە لە یەک چامەدا، چەند کێشێکی برگەیی بەکار دەهێنن، یا کێشی برگەیی و عەرووزی تێکەڵ دەکەن، بەتایبەتی کە کێشی زۆر درێژ و زۆر کورت تێکەڵ دەکەن، لە بابەتی سەجعن، نەک شیعر. وەکو بەوێنە، گۆران دەڵێ:

ئەی چاو! چەشنی بازی قەفەس هەڵوەری پەڕت

کوا باڵە تیژەکانی نیگای حوسنی دلبەرت؟

دەی ئەم هۆنراوە لە چواردە برگەییەوە تا پێنج برگەیی وا تیادا، نابێ هەر شاعیرێکی کورد هەستێ و وەک ئەبو عوتاهیە، لە کاتی سەرپێچی لە یاسا دامەزراوەکانی عەرووزا بڵێ: (من لە عەرووز و لە خەلیلیش لە پێشترم).

من مەبەستیشم ئەوە نییە کە بڵێم ئەم پارچە بەناو هۆنراوەی گۆران ناسک و نازدار نییە، بەڵام مەبەستم ئەوەیە، ئەگەر وا بڕوا، زانستی کێش دەبێ بەکێشەیەکی گەورەی بێ سەروبەر، کەس ئەوپەڕی ناکەوێ!

لە ڕاستیدا بڕەودان بەم جۆرە بیردۆزەیە: (عەرووزی خۆماڵی و عەرووزی بیانی و ئەم

جۆرە بڕ و بیانووانە) نەوپەڕی ئیفلاسی ئەدەبییە، ئەمە پەیوەندی بەباری ڕامیاری و دەروونییەوە زیاتر هەیە تا بەباری ئەدەبییەوە. من لەم دوو بڕیارە دڵنیام:

١- شیعری عەرووزی شیعرێکی نەمرە، هەتا هەتایە شاعیرانی کوردی بلیمەت بەهرەی لێ وەردەگرن، وە تا ئەمڕۆ بەرهەمی عەرووزی کوردی بەشێوەیەکی گشتی لە بەرهەمی شیعری ناعەرووزی کوردی سەرکەوتووتر و جوانتر و بەتام و چێژترە.

٢- زانست و عیلم، بێ هەوییەیە، موڵکی نەتەوەیە نییە بەڵکو هەر کەس ئازا بێ بەکاری بهێنێ. گومان نییە لەوەدا کە حیساب و جەبر و ئەندازیاری و منطق و ماتماتیک، لە سەرەتاوە لە گەلێکەوە سەریان هەڵداوە و بلاوبوونەتەوە بەناو جیهانا، ئێستا بەناوی ئەوەوە کە ئەم زانستانە خۆماڵی نین، ئایا دروستە دژیان بوەستین!

١٢١- (السُّداسي):

(بڕ: ١٤ - بحر - ٨) و (الشعر المربّع).

شیعری موسەددەس - یا هۆنراوی شەش گۆشە - جۆرێکە لە هونەرە شیعرییە نوێیەکان، جیاوازی لەگەڵ موخەممەسدا لەم دوو شتەدایە:

١- هۆنراوی شەش گۆشە وەک مخمس بەناوبانگ و باو نییە.

٢- موخەممەس پێنج لەتە، بەڵام مسدّس شەش لەتە.

دەگوترێ: البيت المسدس السالم واتە: دێڕی شەش پێیی ساغ.

١٢٢- (المنسرح):

دەریایەکە لە دەریاکانی خەلیل - ڕەحمەتی خوای لێ بێ -.

١٢٣- (المنسرد):

دەریایەکە لە دەریا بەکارنەهاتووەکانی بازنەکانی خەلیل، پێچەوانەی دەریای موزاریعە. (بڕ: دەریا نوێکان).

١٢٤- (السَّرِيع):

دەریایەکە لە دەریا خەلیلییەکان.

١٢٥- (سقوط):

داكەوتن: كرتاندن: لابردن. دەگوترێ: ئیسقاتی هەمزەی وەسڵ، لە كاتی دەرجا، ئیسقاتی پیتی نەرم (حەرفی لین) لە كاتی بەیەک گەیشتنی دوو پیتی وەستاودا (بڕ: نووسینی عەرووزی/٢- ئەو پیتانەی كە لە نووسینا دەكرتێن) و (١- الابجدیە-ک).

دەگوترێ: (الثابت الساقط) ئەم جۆرە دەربڕینە ئاوا ڕوون دەكەینەوە:

آ- بۆ نموونە (اَل)ی تەعریف، لە نێوانا، واتە: لە دەرجا، هەمزەكەی لە نووسینا ثابیتە، واتە: چەسپاوە، لە گۆ پێ كردنا كرتاوە، هەروا لە كێشیشا ساقیطە، بەڵام لە حیسابی جومەلا ثابیتە، لامەكەیشی ئەگەر قەمەری بێ، لە خەت و لەفز و كێش و جومەلدا چەسپاوە، ئەگەر شەمسیش بێ، لە خەتا دەچەسپێ، لە گۆپێكردنا دەگۆڕێ و دەكرێ بەپیتێ لە چەشنی پاش خۆی، لە جومەلا چەسپاوە چونكە بە(٣٠) حیساب دەكرێ، لە كێشا دەچەسپێ.

ب- وەک نموونەكانی (خەزم) كە لە خەت و لەفظ و جومەلا چەسپاون، كەچی لە كێشا بەر تەقطیع ناكەون و نەچەسپاون (بڕ: ناچاریەكان/٤١).

بەشێوەیەكی گشتی ئەم بابەتانە، هەریەكەیان لە ڕوویەكەوە چەسپاون و لە ڕوویەكەوە كرتاون: تەنوین و ئەلف لام و پیتی لین و خەزم (بڕ: ١ - الابجدیە - تێبینی) و (نووسینی عەرووزی/ ئەو پیتانەی كە پتر دەكرێن) و (٥٤ - حرف/ ١٥).

١٢٦- (سلسلة):

بەحرێكە لە بەحرەكانی حەوت هونەرە تازەكان، كە سلسلە و دوو بەیت و قوما و مووەششەح و زەجەل و كان و كان و موالیان. بڕوانە: دەریا نوێكان.

١٢٧- (سكون):

زەنە: بێ بزوێنی: وەستاوی: لەم ماددەیە ئەم زاراوانە هاتووە:

١- ساكن: پیتی وەستاو: زەنەدار: نەبزاو: نەبزووتوو.

٢- السُّكُون یقابل بِالسُّكُون (بڕ: ٧٤ - خط العروض) و (نووسینی كوردی).

٣- اجتماع السّاكنین: بەیەک گەیشتنی دوو پیتی وەستاو، لە عەرەبیدا دروست نییە، مەگەر لە چەند كاتێكی تایبەتا و بەچەند مەرجێكی ڕەچاوكراو، وەک كاتی ئێست وەک

(يَا رَحْمَانْ = - - -ْ) بەلام لە کوردیدا زۆر زۆرە، وە نموونەی زۆری لە برگەی کوردیدا ڕابورد. وە لە هۆنراودا لە عەرەبیدا لە کاتی تەذییل و تەسبیغ و اجتماع الساکنین دروستە چونکە کۆتایی دێڕە جێگەی ئیستە.

٤- تسکین المتحرک وتحریک الساکن: (بڕ: ناچاریەکان/١٩).

**١٢٨- (السالم):**

ساغ، دەگوترێ: بەیتی سالم، پێی سالم، مەبەست ئەو بەیت و پێیەیە کە زیحافی تیادا نەبێ، سالم صەحیحیشی پێ دەگوترێ، دەگوترێ: پێی سالم، بەیتی سالم، عەرووزی سالم، زەربی سالم، وەک عەرووز و زەربی ئەم شیعرە کە لە مەجزووئی بەحری وافیرە، کە نە تووشی زیحاف بوون و نە تووشی عیللە بوون:

وَخَـانَ النَّاسُ كُلُّهُمُوا    فَـمَا أَدْرِي بِمَنْ أثِقْ
مَفَاعِيلُنْ + مُفَاعَلَتُنْ    مَفَاعِيلُنْ + مُفَاعَلَتُنْ

ئەوەتا ئەم دێڕە دوو لەتە، هەر لەتەی دوو پێیە، یەکەم پێ و سێیەم پێی حەشوە، هەردووکیان تووشی زیحافی عەصب بوون، دووەم پێی عەرووزە، چوارەم پێی ضەربە، هەردووکیان نە تووشی زیحاف بوون و نە تووشی عیللە بوون، بەڵکو سالم و صەحیح لەسەر ئەصڵ ماون کە (مفاعلتن)ە، جا پێی دیتر تووشی هەر گۆران و گۆڕینێ ببێ، بەیتەکە بەو ناوەوە ناو دەنرێ، وەک: مەخبوون و مەتوی و مەوقووص و مەحذوف و مەخبوول و... تاد، هەروا عەرووز و زەربەکەیشی، وەک: عەرووزی مەقطوع، ضەربی مەکفووف، عەرووزی سالم: صەحیح، ضەربی سالم: صەحیح.

**١٢٩- (سمط. أسماط. تسمیط. مُسَمَّطَات):** (بڕ: قفل)

تەسمیت هونەرێکی هۆنراوەییە، ڕەنگ بێ لە هۆنراوی کۆنیشدا نموونەی دەست بکەوێ، جۆری زۆرە، باوترینیان ئەو جۆرەیە کە هەموو دێڕێ بکرێ بەچوار پارچەوە، سێ پارچەی پێشەوەیان یەک سەروایان هەبێ، پارچەی چوارەمیشیان لەسەر سەروایەکی تایبەت بڕوا ئاوا:

ا ا ا ا، ب ب ب ا، ج ج ج ا، د د د ا، وەک ئەم هۆنراوەی وەفایی، کە لە چامەیەکی درێژا دەفەرمووێ - ڕەحمەتی لێ بێ -

بۆ دەرسی ئەربابی دڵ. پەڕپەڕی ئەوراقی گــــوڵ

هەر دەرسی عیشقە حاصڵ. سەرمەشقی ئاموزگار

مەلا طاهیر بەحرەکەیی چامەی بوردییەی بوصەیری بەهۆنراو کردووە بەکوردی، لەسەر هەمان کێش و سەروای خۆی، وە لە سەرەتاشەوە تا کۆتای وەک خۆی دەڵێ: (... وە لە لێکدانەوەی بەتەرازووی شیعر دەردەچێ وەکو بوردییە لە (بەحری بەسیط) و هەروەها ڕازاندیتمەوە بەتایبەتی بەکرداری (تەسمیط). سەردێڕەکەی ئەمەیە:

بارانی ڕەحـــمـــەت خـــودام، بارێنە تۆ بەردەوام

سەرخۆشەویستت تەمام، گەورەی هەموو گەل بەجەم

۱۳۰- (اسم, اسماء):

وەک: (أسْمَاءُ القافية: ناوەکانی سەروا) و (أسماء البحور: ناوی دەریاکان).

۱۳۱- (السِّنَاد):

یەکێکە لە نەنگەکانی سەروا (بڕ: عُیُوب القافِية)، جۆری زۆرە، وەک: سناد الردف و سناد التأسيس و سناد الحذو... تاد. بۆ جێگەی خۆی... (بڕ: بزوێنەکانی سەروا لە - القافية -دا، ئیشباع/ ع).

(سَرقات شعريّة): مەبەست دزینی بێژە (لەفز) یا واتای شیعرە (بڕ: اقتباس + توافق الافكار) و (تضمين).

## سیازدەهەم: پیتی شین: حرف الشین

ش = ٤٠٠

گەلێ جار وشەیەکی کوردی، یا فارسی، یا ئەورووپی، کەسێکی تر کاتێ بەکاری دەهێنێ، رێک وەک خۆی بەکاری ناهێنێتەوە، بەڵکو جۆرە گۆڕانکارییەکی تیادا دەکرێ، چ لە گۆپێکردندا و چ لە شێوەی نووسیندا، بەوێنە ئەم وشانە بەم شێوە جیاجیایانە بەکار دەهێنرێن:

١- چەک: شیک: صک: صەکک.

٢- چەرچڵ: تشرشل.

٣- چەوەندەر: شەوەندەر.

٤- پاپونگ: بابونج. زۆر وشەی تری لەم بابەتە.

جا ئەم جۆرە وشانە - وەک چەند جارێ لەمەوپێش ڕوونمان کردەوە - بڕیاری تایبەتی خۆیان هەیە.

### ١٣٢- (إشباع):

بەواتا تێرکردن و درێژکردنەوە. جۆری زۆرە، بەزۆری بەواتا تێرکردنی بزوێنە و درێژکردنەوەیەتی، هەتا بۆ مەبەستی کێشی، پیتێکی مەدد (درێژ)ی لە چەشنی خۆی لێ دروست دەبێ، ئاوا: (حَومَلِ ـــ حَومَلِي) و (الخیام) ببێ بە(الخیامو). (بڕ: ناچاریەکان/ ١١، ١٢) و (٤٥ - جنس) چەند زانیارییەک سەبارەت بەئیشباع:

١- بزوێنی پیتی دەخیل پێی دەگوترێ ئیشباع، کە یەکێکە لە پیتەکانی سەروا.

٢- بەپێی دەستوور لە سەروای موتلەقا هەموو بڕگەیەکی کورتی کۆتایی نیوە دێڕی یەکەم و دووەم، ئیشباع دەکرێ لە چەشنی بزوێنەکەی و بەدرێژ دەخوێنرێتەوە. وەک (سالم/ رەمەل):

هەر طەرەف شەمعی روخی جانانەیە

گەردی ئەو دائیم وەکو پەروانەیە

(نانەیە = نانەیا = فاعلن) و (وانەیە = وانەیا = فاعلن) (بڕوانە: بزوێنەکانی سەروا).

### ١٣٣- (الشعر المشجّر):

جۆرە هونەرێکی شیعرییە، دێرە شیعرێکی سەرەکی دەکرێ بەقەدی درەختێ، چەند لقێ لەو دێرە سەرەکییەوە دەردەچێ، کە هەموو لقێکی شیعرێکی سەربەخۆیە.

### ١٣٤- (الشتر):

لە جۆری عیللەی زیحافانەیە، بریتییە لە (خەرم + قەبز) لە هەزەج و موضاریعا (مفاعیلن) دەبێ بە(فاعلن) ئەو دێرەی کە شەتری تیا بێ پێی دەگوترێ: (ئەشتەر) وەک (هەزەجی ئەشتەر):

فيِ الَّذِينَ قَدْ مَاتوا     وَفِيمَا جَمَّعوا عِبرَه

فاعلن مفاعيلن     مفاعيلن مفاعيلن

### ١٣٥- (التشديد. المشدّد):

تەشدید بریتییە لە پیتێکی قورسی وا کە لە کێشدا بەدوو پیت دادەنرێ (بڕ: ناچاریەکان/ ٣، ٤) و (نووسینی عەرووزی/ ١).

### ١٣٦- (الشاذ. الشذوذ):

پێچەوانەی یاسا.

### ١٣٧- (التشريع):

تەشریع زیاتر پەیوەندی بەزانستی بەدیعەوە هەیە، بەڵام لە ڕووی سەرواوە جۆرێکە لە هونەرێکی تایبەت.

آ- لە ڕووی بەدیعەوە جۆرێکە لە ڕازانەوەی واژەیی (لەفظی).

ب- لە ڕووی عەرووزەوە ئەوەتا کە دێرێ، یا زیاتر لە دێرێ، یا چامەیێ بەتەواوی، هەموو دێڕێکی، دوو سەروا، یا سێ سەروا، یا چوار سەروای هەبێ، بەپێی کێشی بەحرێ لە بەحرەکان بێ، بەڵام بتوانرێ بەپێی دەسکاری پێیەکانی کۆتایی، جۆری زەربەکەی بگۆڕرێ، یا جۆری کێشەکەی بگۆڕرێ، بۆ نموونە: ئەم دێرە هۆنراوەیە بەم چوار جۆرە دروستە بخوێنرێتەوە: بەوافی و مەجزووء و مەشتوور و مەنهووک، ئاوا:

١- الصِّبَالَهْـ ـوٌ وَحُبٌّ وَاختيَالْ

فاعلاتن. فاعلاتن. فاعلات

وَجُنُونٌ في تَسَابيـ ـحِ الْجَمَالْ

فعلاتن. فاعلاتن. فاعلات (رەمەلی وافی)

٢- الصِّبَالَهْـ ـوٌ وَحُبٌّ

فاعلاتن. فاعلاتن

وَاختيَالٌ وَجُنُونْ

فاعلاتن. فعلات (رةمةلي مةجزووء)

٣- الصِّبَالَهْـ ـوٌ وَحُبٌّ وَاختيَالْ

فاعلاتن. فاعلاتن. فاعلات (مەشتوور)

٤- الصِّبَالَهْـ ـوٌ وَحُبٌّ

فاعلاتن. فاعلاتن (مەنهووک)

یا وەک ئەم نموونەیەی تر (کامل-عەرووزی تامی صەحیح. زەربی مەقتووعی موزمەر):

يَا خَاطِبَ الدُّنْيَا الدَّنِيَّة إنَّهَـــا + شَرَكُ الرَّدَى وَقَرَارَةُ الأقْدَارِ

دَارٌ مَتَى مَا أضْحَكَتْ في يَوْمِهَا + أبْكَتْ غَداً تَبّاً لَهَا مِنْ دارِ!

ئەم دوو دێڕە دروستە دوو پێتی کۆتاییی‌یان لێ فڕێ بدرێ، دەبن بەمەجزووئی کامیل، واتاکەشیان دروستە، ئاوا:

يَا خَاطِبَ الدُّنْيَا الدَّنِيَّة + إنَّهَـا شَرَكُ الـــرَّدَى

دَارٌ مَتَى مَا أضْحَكَتْ + في يَوْمِهَا أبْكَتْ غَدا

ئەم نموونەیان لە فارسیدا پێی دەگوترێ (ذو قافیتین) لە کوردیشدا پێی دەگوترێ (جووت سەروا) بەبۆچوونی بەندە، ناسراوترین لقی موستەزاد، لە کوردیدا، لەم جۆرەی دووەمی تەشریعە سەرچاوەی هەڵگرتووە، بەوێنە: ئەم شیعرەی نالی، کە موستەزادە، لە لایەنی پێناسە و ناوەڕۆکەوە چ جیاوازییەکی هەیە، لەم شیعرەی پێشەوە کە هی حەریرییە، نالی - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - دەفەرمووێ: (هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەحذووف):

ئەی تازە جەوان! پیرم و ئوفتادە و کەوتووم
تا ماوە حەیاتم
دەستێ بدەرە دەستی شکستەم، کە بەسەرچووم
قوربانی وەفاتم

ئەم چامەیە نۆ دێڕی جووت سەروایە (واتە: دوو سەروایە) دروستە بەدوو شێوەی جیاجیا بنووسرێ، یا بخوێنرێتەوە، کە هەر جۆرێکیان زەربێکی تایبەتە لە بەحری هەزەج، لەسەر ئەم شێوەی سەرەوە کە دوو سەروای هەیە، لەسەر شێوەی یەک سەرواییش کە لە هەموو دێڕەکان تیکە زیادەکە لاببرێ ئاوا:

ئەی تازە جەوان! پیرم و ئوفتادە و کەوتووم
دەستێ بدەرە دەستی شکستەم، کە بەسەرچووم

تا کۆتایی چامەکە لەسەر ئەم شێوەی دووەمە.

## ١٣٨- (الشَّطْر):

لەت: نیوە: کەرت، الشطرین: دوو لەتی دێڕ (بڕ: اَلْبَیْت) شەطر بەواتا تەشطیریش دێ. مەشتوور: دێڕێکە نیوەی لابرابێ (بڕ: بەیتی مەشطور). تەشطیر: دوو لەتکردنی دێڕێ، وەک لە (بەیتی مەشطور)دا ڕوون کراوەتەوە بڕوانە ئەوێ.

## (تەشطیر):

تەشطیر واتایەکی تریشی هەیە:

١- هەستیارێ شیعرێ، یا چەند شیعرێ، یا چامەیێ، هی هەستیارێ تر، پەسەند دەکا، دێ لەت لەتیان دەکا و، بەلەتە هەڵبەستی خۆی تێهەڵکێشیان دەکا، لەسەر ئەم شێوەیە: بۆ صەدری شیعری یەکەم عەجزێ دادەنێ لەسەر سەروای گشتی پارچەکە، یا چامەکە، وە بۆ عەجزی یەکەمیش عەجزێ دادەنێ بەبێ سەروا، هەروا دێڕەکانی تریش هەتا کۆتایی. واتە: لە هەموو دوو شیعرێکا، لە پاش تشطیر، لەتی یەکەم و لەتی چوارەم هی شاعیری پێشینە، لەتی دووەم و سێیەمیش هینی شاعیری پاشینە، سەروایش لە شیعرە ژمارە تاکەکاندا هی هەستیاری دووەمە، بەڵام لە شیعرە ژمارە جووتەکاندا هی هەستیاری یەکەمە. وەک ئەم نموونەیە: هەستیارێ دەڵێ (تەویل):

رَأيْتُ خَيَالَ الظِّلِّ أكْبَرَ عـــبرةً لِمَنْ هُوَ في عِلْمِ الحقيقة رَاقي
شُخُوصٌ وَأشْبَاحٌ تَمُرُّ وَتَنْقَضِي وَتَفْنَى جَمِيعاً وَالمحرِّكُ باقي!

عەبدولغەنی نابولسی هاتووە لەسەر ئەم شێوەیە تەشطیر و تێهەڵکێشی کردووە بەنیوە دێڕی خۆی:

(رَأيْتُ خَـيَـالَ الظِّلِّ أكْـبَـرَ عـبـرَةً)
يَلوحُ بِهَـا مَـعْنَى الكَلاَمِ لأَحْـداقِي
وَفـي كُلِّ مَـــوْجُـــودٍ عَلَى الحَقِّ آيَـةٌ
(لِمَنْ هُوَ في عِلْمِ الحـقـيـقـةِ رَاقي)
(شُـخُوصٌ وَأشْـبَـاحٌ تَمُـرُّ وَتَنْقَـضِي)
وَلَيسَ لَهَا مِمَّا قَضَى اللهُ مِنْ وَاقي
لَهَـا حَـرَكَـاتٌ ثُمَّ يَبْـدُو سُكُونُهَـا
(وَتَفْنَى جَـمِـيـعـاً وَالمحـرِّكُ بـاقي)

دیارە کە پارچەکە پاش تەشطیرکردن دوو چەندانی پێش تەشطیرکردنە.

٢- جۆرێکی تری تەشطیر و موشەتتەر ئەوەیە کە لە (٨٣ - تەخمیس و موخەممەس)دا ڕوون کراوەتەوە.

٣- جۆرێکی تری تەشطیر ئەمەیە کە (نامی) دەفەرمووێ: (ئەوەتە هەر کام لە دوو نیوەی شیعر دوو پارچەی هاوقافیە بن و جیابن لە دوو پارچەکەی تریان). وەک شاعیری عەرەب دەڵێ (بسیط):

تَدْبيرُ مـعـتَصِم، بالله منتقم
لله مُـرْتَقِب، فِي اللهِ مُـرْتَعِبِ

نامیش دەفەرمووێ:

ئاسمانی کاتی درەو، زۆر جوانە بەمانگەشەو
وەکو سایەقەی ساماڵ، جوانە کاتی کشتوکاڵ!

## ١٣٩- (التَّشْعِيب "تەشعیس: تەشعیث"):

لە جۆری عیللەی زیحافانەیە، بریتییە لە لابردنی پیتێکی بزواوی وەتەدی کۆ، لە (فاعلاتن) و (فاعلن)دا، جا ئەگەر پیتی یەکەمیان لابرێ واتە: عەینەکەیان،

کێشەکەیان دەبێ بە(فالاتن) و (فالُنْ) خۆ ئەگەر پیتی دووەمیان لابرێ، کە لامەکەیانە. کێشەکەیان دەبێ بە(فاعاتن) و (فاعُن) وە لەبەر ئەوەی ئەم دوو کێشە لە کێشەکانی عەرەبیدا نین، دەگۆڕدرێن بۆ (مفعولن) و (فَعْلُنْ - -).

تەشعیث لە بەحری خەفیف و موجتەث و موتەدارەک و مەدید و رەمەلدا ڕوودەدات. (بڕ: نەخشەی/ ٥. عیللەی تایبەت بەوەتەد و... تاد).

## ١٤٠- (الشِّعر):

شیعر: هەڵبەست: هەستی سۆزدار: هەست هەژێن.

بڕوانە: پێشەکی ئەم کتێبە، لەگەڵ سەرباسی (جۆرەکانی شیعر) + (گرنگی زانستی عەرووز) هەڵبەست بریتییە لە گوتەی شاعیر، بەشێوەی گشتی شیعر جۆری زۆرە:

١- شیعری عەرووزی. ٢- شیعری کێشی پەنجە، پێشی دەگوترێ: کێشی هیجا، یا کێشی ژمارەیی. ٣- شیعری مورسەل، کە ئەوەیە سەر بەبەحرێ بێ، کێشی هەبێ بەڵام سەروای نەبێ، بڕوانە (١٠١ - مرسل). ٤- شیعری عەموودی: هۆنراوی ستوونی، کە ئەوەیە هەموو دێڕێکی بەسەر دوو لەتی وەکو یەکدا دابەش دەبێ، وە هەموو لەتێکیشی دابەش دەبێ بەسەر چەند پێیەکی تایبەت، بەپێی بەحرەکەی. ٥- شیعری حوڕ: شیعری ئازاد: شیعری تازە: شیعری حەدیث. کە ئەوەیە لەتە شیعرەکان بەپێی ژمارەی پێیەکانی شیعرەکە بن (بڕ: کێشی بڕگەیی). ئەم جۆرە شیعرە لە سەرەتاوە جۆرە یاسایەکی تایبەتی هەبوو، بەڵام بەرە بەرە وای لێ هات پابەند نەماوە بەهیچ یاسایەکەوە، لەبەر ئەوە دەڵێین: پابەند نەبووەکانیان شیعر نین.

جوانترین هۆنراوی ئازادی عەرەبی لەم سەردەمەی ئێمەدا، چامەکانی نزار قەبانی و نازک مەلائیکەیە - نازک - لە چامەیەکی ناسکدا، لە ژێر ناوی (ساعە الذکری)دا - دەڵێ: (خەفیف):

هذه سَاعَةُ التَّذكُّرِ
كَادَ اللَّيْلُ يَبْكي مَعِي، ويُصْغِي مَليّآ
إنَّهَا سَاعَةُ التذكُّرِ
وَالأجْرَاسُ تَطْوي كَآبَةِ الصُّمْتِ طَيّآ

ئەم شیعرانەی نازک دەق شیعری ستوونییە، تەنها ئەم دوو جیاوازییەی هەیە:

١- نیوە دێڕەکانی بەشێوەیەکی تایبەتی ڕیز کراون، نەک بەپێی یاسای ستوونی، کە دێڕەکانی دەبن بەدوو لەتی یەکسانەوە و هەر لەتەی بەپێی ژمارەی پێیەکانی و جۆری سەروای چامەکە ڕیز دەکرێن، بەڵام ئەم پێیەکانی کراوە بەتەوەرەی ڕیزکردنی لەتەکانی، لەگەڵ هەندێ ڕەچاوکردنی تری لاوەکیدا.

٢- سەروا و تەصریع و تەقفیە، بەتەواوی وەک پێویست ڕەچاو نەکراون، گەرچی ناوبەناو سەروا لە دێڕەکانیدا ڕەچاو دەکرێ، وەک (ملیّآ) و (طیّآ) و (حیاری) و (مِرَارَا) و (أسرارا) و (ثارا) و (غزارا) و (مطویّا).

سەراسەری دێڕەکانی ئەم چامەیە دەتوانرێ بەپێی یاسای ئاسایی ستوونی بەحری خەفیف لەسەر ئەم شێوەی دواوە ڕیز بکرێنەوە:

هذه سَـاعَـةُ التَّـذكُّـرِ كَـادَ ال

لَّيْلُ يَبْكِي مَعِي،وَيُصْغِي مَليّآ

فاعلاتن + مفاعلن + فعلاتن

فاعلاتن+ مفاعلن+ فاعلاتن

إنَّهَا سَـاعَـةُ التـذكُّـرِ وَالْأجْـ

رَاسُ تَطْوِي كَآبَةَ الصُّمْتِ طَيّآ

وَأُحِسُّ الخُطى تَمُـرُّ حَـيَـارَى

خَلْفَ بَابِي كَـمَا مَـرَرْنَ مِـرَارَا

ئەوەی ڕەچاو دەکرێ لە ڕیزکردنی نیوە دێڕی هەڵبەستی ئازاددا ئەم جۆرە خاڵانەیە، سەرەڕای قەبەکردنی دیوان و بەناو زۆرکردنی دێڕەکانی چامە:

١- نوێکاری و نوێخوازی لە سیستەمی هۆنینەوەی هۆنراودا، گەرچی بەداهێنانی شێوەی ڕیزکردنی لەتەکانیشی بووە، لەگەڵ زۆری و بۆری.

٢- زۆرکردنی شوێنی ئێست و پشوودان و لەنگەرگرتن بۆ خوێنەر، چونکە شتی وا ڕۆڵی کاریگەری هەیە، مەودا بەئەندێشە و خەیاڵ دەدا کە پتر بای باڵی خۆیان بدەن، بەمەرجێ ئێست و پشوو لە جێگەی دروستی خۆیاندا بن.

٣- هەق وایە ئێست لەسەر پێیەکان بەپێی ڕێسا و یاسایەکی دامەزراو، پەیڕەو بکرێن، وەک تەواوبوونی ڕستە، یا لەسەر کۆتایی پێ، یا ڕەچاوکردنی مۆسیقای وشە و ڕستەکان، بەڵام زۆر جار هەستیارەکان ئەم سیستەمە دەبەزێنن. ئەوەتا نازک خۆی لە چامەی (جامعَةُ

الظِلاَل)دا، کە لەسەر کێشی دەریای موتەقارەبە، نیوە دێڕەکانی بەشێوەیەکی نادەستووری دابەش کردووە کە ئاوایە:

وَنَحْنُ ضَحَايا هُنَا

تَجُوعُ وَتعطِش أروَاحُنا الحَائِرَهْ

وَنَحْسِبُ أنَّ الْمُنى سَتَمْلأُ يوماً مَشَاعِرَنَا العَاصِرَة

وَنَجْهَلُ أنَّا نَدُورُ

مَعَ الْوَهْمِ في حَلَقَاتٍ تجزّئُ أيّامَنَا الآفلاَت

وَ ننتظر الغَدَ خَلْفَ العُصُورِ ونَجهلُ أنّ القُبُورَ

تَمُدُّ إلَيْنَا بأذْرُعِهَا البَارِدَه...)

وەکی تریش ئەم چامەیە گەرچی بەپێی دەریای موتەقارەبە، بەڵام بەپێی ضەربە باو و ناسراوەکانی نییە، بەڵکو تێهەڵکێشە لە صەحیح و مەجزووء و زەربە جیاجیاکانی. کە دروستە ئاوا ڕیز بکرێنەوە:

١- وَنَحْنُ ضَحَايا هُنَا

فعول + فعولن + فَعَلْ = عەرووزی مەجزووئی مەحذووف

٢- تَجُوعُ وَتعطِ شُ أروَاحُنا الحَائِرَهْ

فعول + فعول + فعولُنْ + فعولن + (فَعَلْ ب -) = تێهەڵکێشە

٣- وَنَحْسِبُ أنَّ الْمُنى

فعول + فعولُنْ + فَعَلْ = عەرووزی مەجزووئی مەحذووف = ژمارە (١)

٤- سَتَمْلأُ يوماً مَشَاعِرَنَا العَاصِرَة

فعول + فعولُنْ + فعول + فعولن + فَعَلْ = ژمارە (٢)

٥- وَنَجْهَلُ أنَّا نَدُورُ مَعَ الْوَهْ

فعول + فعولن + فعول + فعولن = عروضة صحيحة

٦- مِ في حَلَقَاتٍ تجزّئُ أيّا

فعول + فعولن + فعول + فعولن = ضەرب صەحیح

٧- مَنَا اْلآ + فِلاَت وَ ننتظر الغَ

فعولن + فعولن + فعول + فعول

٨- ـدَ خَلْفَ العُصُورِ ونَجهلُ أنَّ الْ

فعولن + فعول + فعول + فعولن

٩- قُبُورَ تَمُدُّ إلَيْنَا بأذْرُ

فعول + فعولن + فعول + فعول

١٠- عِهَا البَارِدَهْ

فعولن + فَعَلْ

٤- بەڵگەی ئەوەی کە ئێست و لەنگەر بەپێی ڕێسای دامەزراو نییە ئەوەیە کە زۆر لە تەفعیلەکان مودەووەرن، واتە: ئێست لە ناوەڕاستیاندا کراوە و نیوەی بەر لەتی عەرووز و ئەو نیوەکەی تری بەر لەتی زەرب کەوتووە.

٥- شیعری حەدیث: شیعری نوێ: شیعری تازە: شیعری ئازاد (حورِ).

٦- شیعری مەنثوور: پەخشانە هۆنراو: ئەو جۆرە هەڵبەستە ئازادەیە، کە تەواو دوورکەوتۆتەوە لە هۆنراوی ستوونی، بەحاڵ و بەئاستەم بۆنی کێشی پێوە مابێ. لە ڕاستیدا شیعری ئازاد بەگشتی ئەگەر مەبەستەکەی جوان بێ، خاوەن سۆز و شێوەیێ لە شێوەکانی ئاواز بێ ئەوە پەخشانێکی هونەری جوانە، دەنا وەک نوری فارس دەڵێ: (دە بڕگەیی):

چاکەی بێ بڕوا، ذیکری بێ تەقوا

وەک شیعری نوێیە، نە کێش نە سەروا

ئەم جۆرە شیعرەش کۆنە یا نوێیە

وەک چەمسووتەکەی بێ تام و خوێیە!

٧- شیعری موطڵەق جۆرێکە لە هونەری سەروا.

٨- شیعری مقیَّد جۆرێکە لە هونەری سەروا.

٩- شیعری کوردی، عەرەبی، فارسی، تورکی... تاد. شیعرێکە بەو زمانە گوترا بێ.

١٠- شیعری تەقلیدی: شیعری کلاسیکی: شیعری سەر بەمەدرەسەی کۆن.

١١- شيعر جۆری زۆره، بەزۆر ڕەچاوکردن ناوی جۆراوجۆری جیاجیای بۆ دانراوه، وەک: شیعری سیاسی، حزبی، نەتەوەیی، نیشتمانی، مرۆیی، مرۆڤپەروەری، صۆفیگەری، شیعری حەماسی، شیعری گۆرانی، شیعری خۆماڵی، شیعری ئایینی، شیعری باسی سروشت، شەڕە شیعر، شیعری فێرکاری، شیعری شەعبی، شیعری عامی، جۆری شیعرێ تر هەیە وەک (مُشَجَّر، حالي، عاطل، مُؤَرِخ... تاد). خوا یار بێ لە هونەرە شیعرییەکاندا باسیان بەتێروتەسەلی دەکەین.

١٢- ضرورات الشعر: بڕوانه: (ناچاریەکانی کێش).

١٣- شیعری مورسەل: (- مرسل).

١٤- شیعری قەوادیسی.

## ١٤١- (بەحری شەقیق):

بەحری موتەدارەک، بۆیە پێی دەگوترێ: شەقیق، چونکە برای موتەقارەبه، هەردووکیان بریتین لە سەبەبێ سووک و وەتەدێ کۆ.

## ١٤٢- (الشكل):

شەکل، لە زمانی عەرەبیدا چوارپەل بەستنی ئاژەڵە بەئەشکێل، لە زاراودا بریتییە لە کۆبوونەوەی خەبن و کەف لە یەک پێی حەوتیدا، دەچێتە سەر پێی (فاعلاتن) دەبێ بە(فَعِلاتُ = ب ب-ب) لە مەدید و ڕەمەل و خەفیف و موجتەسدا، لە خەفیف و موجتَەسدا دەشچێتە سەر (مستفعلن = --ب-) کە لە جۆری وەتەدی بلاو بێ ئاوا (مستفع لن) دەبێ بە(مُتَفْعِلُ = ب-ب ب) دەگۆڕێ بۆ (مَفَاعِلُ = ب-ب ب) چونکە (متفعل = ب-ب ب) لە ئەوزانی صەرفی عەرەبیدا نییە، ئێمەی کوردیش کە زاراوە عەرەبییەکان بەکار دەهێنین، ناچارین هەمان زاراو و کێش بەکار بهێنین. (بڕ: نەخشەی زیحافە لێکدراوەکان/٢).

بەیتی مەشکوول - کە ئەو دێڕەیە شەکلی تیا بێ - لە عەرەبیدا، وەک (خەفیف):

إنَّ قَوْمي جَحَاجِحَةٌ كِرَامُ
فاعلاتن، مفاعل، فاعلاتن
مُتقَادمٌ مَجْدُهُمْ أخْيَارُ
فعلات، مستفعلن، مفعولن

لە کوردیدا وەک نالی - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - دەفەرمووێ (ڕەمەل):

(بَرِقَ البَصَرْ) لەبەر بەرقی تەلەئلوئی لە ئالی
(خَسِفَ القَمَرْ) لەئیشراقی قیامەتی جەمالی
فـعـلات، فـاعـلاتن، فـعـلات، فـاعـلاتن
فـعـلات، فـاعـلاتن، فـعـلات، فـاعـلاتن

### ١٤٣- (شاهد. شَوَاهد):

شیعرێکە کە دەکرێ بەنموونە و شاهید لەسەر بابەتێ، یا لەسەر دەستوور و ڕێسایەکی تایبەتی، لە هونەرێکا، وەک زانستی کێش، وەک ئەو هەموو نموونانەی کە لەم پەڕاوەدا ڕابووردن، کە هەریەکەیان شاهید و نموونە بوون بۆ دەستووری لە یاسا و ڕێساکانی زانستی کێش.

یا وەک ئەم شیعرە کە لە زانستی نەحودا شاهیدە لەسەر ئەوە کە (حَیْثُمَا) دوو فیعلی موضاریع مەجزووم دەکا (خەفیف):

حَیْثُمَا تَسْتَقِمْ یُقَدِّرْ لَكِ اللّـ
ـهُ نَجَاحاً في غَابِرِ الأَزْمَانِ

یا وەک ئەم شیعرەی تر، کە ئوصولییەکان دەیکەن بەبەڵگە لەسەر ئەوە کە (کَلاَم) حەقیقەتە لە کەلامی نەفسانیدا و، مەجازە لە کەلامی لیسانیدا (ئەخطەل - کامیل):

إنَّ الكَلاَمَ لَفي الفُؤَادِ وَإنَّمَا
جُعِلَ اللِّسَانُ عَلَيْهِ دَلِيلاَ

### ١٤٤- (اسْتِشْهَاد):

کردنی شیعرێ بەشاهید بۆ شتێ، یا خوێندنەوەی شیعرێ بەبۆنەیەکەوە، بۆ پشتیوانی لەو بابەتە، وەک ئەوە کە پێغەمەر - دروودی خودای لەسەر بێ - هەڵبەستی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی بەبۆنەی هەندێ شتەوە دەخوێندەوە و، ئیستیشهادی پێ دەکرد و دەیکرد بەبەڵگە و نیشانە لەسەر داوایێ، وەک ئەوە ئەم هۆنراوەی طەرەفەی بۆ بەڵگە و ئیستیشهاد دەخوێندەوە کە دەڵێ (طەویل):

سَتُبْدَى لَكَ الأيَّامُ مَا كُنْتَ جَاهِلاً
(وَيَأتِيكَ بِالأَخْبَارِ مَنْ لَمْ تُزَوِّدِ)

## چواردەهەم: پیتی صاد: حرف الصَّاد

ص = ٩٠

صاد لە کوردیدا زۆرتر بەسین دەنووسرێ و بەسینیش دەخوێنرێتەوە، بۆ ڕوونکردنەوەی تەواوی ئەم بابەتە بڕوانە: سەرەتای پیتی ذال.

### ١٤٥- (صحیح):

بڕوانە (٥٤ - حرف/ حەرفی صەحیح، ضەربی صەحیح، عەروضی صەحیح) + (١٢٨ - السَّالم). عەروضە صحیحە: عەرووزی ساغ.

### ١٤٦- (الصَّدْر):

بڕوانە: (٢٢ - البیت/ هێڵکاری...) + (بڕگەی کوردی) + (١٨ - البرئ/ معاقبەی صەدر).

### ١٤٧- (تَصْحِیف):

خوێندنەوەی شت بەهەڵە، یا نووسین و گێڕانەوەی و نەقڵ کردنی بەهەڵە، بەتایبەت هی خاڵ و نوختە و سەر و بۆر، کە بەهۆی ئەم گۆڕان و لێ تێکچوونەوە واتای وشە و ڕستەکە دەگۆڕێ، یا تێکدەچێ، خۆ ئەگەر هەڵبەست بێ گەلێ جار کێشەکەشی دەگۆڕێ.

جا ئەم گۆڕانە بەچەند شێوەیێ ڕوودەدا، وەک:

١- هەڵەی ڕووت، ئەوە هەڵەی نووسیار و چاپ و ئەمانەیە، پێویستە پاش هەست پێکردن ڕاست بکرێتەوە، وەک (پایز) بە(بایز) بنووسرێ، یا (گوڵ) بە(گول) بنووسرێ، یا (شێر) بە(شیر) و شتی تری وا، یا بەپێچەوانەوە.

٢- گۆڕینی وشە و ڕستە بەقەستی، لەبەر مەبەستێ، ئەمەیش جۆری زۆرە، ئەگەر بەنیازی پاک نەبوو، وە بۆ تێکدان و سەپاندنی نیازی پیس بوو ئەوە تەحریفە، تەصحیفیش لەم بەشەیە: کە ئەوەیە جۆرە وشەیێ لە شیعردا گۆڕانکاری تیا بکرێ، بەمەرجێ کێش لەنگ نەکا، لەبەر مەبەستێ بێ، بەمەرجێ هاوشێوە بن، یا لەیەکچوون لە پیت و نوختە و شێوەی هەردوو وشەکەدا هەبێ، وەک ئەوە ئەبولعوتاهیە لە هەجوی قازییەکی هاوچەرخی خۆیدا، (عوذر)ی لەم شیعرانەدا قەلب و تەصحیف کرد و وە بە(غەدر) بەوەیش مەدحەکە بووە بەزەمێکی خەست (موتەدارەک):

هَمُّ القَـــاضِي بَيْتٌ يُطْرِبْ
قَـــالَ القَــاضِي لَمَّا عُــوتِبْ
مَــا في الدُّنْيَــا إلاَّ مُــذْنِبْ
هذَا (عُــذْرُ) القَـاضِي وَاقْلِبْ

یا وەک ئەم شیعرەی تر، کە مەبەستی هەستیار ئەوەیە کە بڵێ: (جُعْتُ قَوِيّاً = زۆرم برسییە):

(جَعَلْتُ قَولِي) شَرْحَاً لِحَالِي
فَاحْذِفِ اللأمَيْن تَفْهَمْ سُؤَالي

بڕوانە: (مواربە، سرقات شعریە، تاجول نوصول/ ٩/٨٩ - ٩٠ - کوردی).

## ١٤٨- (تَصْرِيع):

(بڕ: ٢٢ - البیت/ ٩/٣ - بەیتی مصْرع).

(مصراع): (بڕ: ٢٢ - البیت...).

## ١٤٩- (صرف ما لاینصرف):

(بڕوانە: ناچاریەکان/ ٥ + ٦).

(نون الصرف): (نون الإنشاد).

(الإصراف): یەکێکە لە نەنگەکانی سەروا، کە ئەوەیە بزوێنی دوو ڕەوی دوو دێڕ، لە یەک دوور بن، وەک سەر لەگەڵ ژێردا (مَسَاءً) لەگەڵ (بِنَاءِ)دا، یا سەر لەگەڵ بۆردا، وەک (قَدْرُ) لەگەڵ (عَبْرا)دا، بەڵام بۆر لەگەڵ ژێردا ئەوە إقْوای پێ دەگوترێ، وەک (بِقُعْدُدِ) لەگەڵ (أسودُ)دا، بەبۆری دالی (اسود) لە شیعری موقەییەددا جیاوازی بزوێنی ئیعراب قەیناکا، وەک لە پارچە شیعرێکا ئەم وشانە بوونەتە سەروا: (وَمَا شَعَرْ) و (إذَا نَظَرْ) و (عَلَى الصُّوَرْ).

یا وەک ئەم شیعرەی ئەلفیە (ڕەجەز):

وَمُفْرَدَاً يأتِي، وَيَأتِي جُمْلَهْ    حَاوِيَةً مَعْنَى الَّذِي سِيقَتْ لَهْ

نموونەی ئیصراف وەک (خەفیف):

وَحُسَيْناً فَلاَ نَسِيتُ حُسَيْناً
أقْصَدَتْهُ أسِنَّةُ الأعْدَاءِ
غَادَرُوه بِكَرْ بَلاَءَ صَرِيعاً
لاسَقَى الغَيْثُ بَعْدَهُ كَرْبَلاَءَ

**١٥٠- (المصغر):**

ئەوەیە کە وشەی موصەغغەری زۆری تیادا بێ، وەک ئەم شیعرانە (تەویل):

سَرَتْ فَأسَرَّتْ لِلْفُؤَادِ (غُدَيَّةً)
أحَادِيثَ جِيرَانِ (لِعُذَيْبِ) فَسَرَّتِ
لَهَا (بِأُعَيْشَابِ) الحِجَازِ تَحَرُّشُ
بِهِ لاَ بِخَمْرٍ دُونَ صَحْبِي سَكْرَتِي
تُذَكِّرُنِي العَهْدَ القَدِيمَ لأنَّهَا
حَدِيثَةُ عَهْدٍ مِنْ (أُهَيْلِ) مَوَدَّتِي

**١٥٠- (مكرر) - ریدفي صەلب:**

(بڕ: قافیە/ ریدف).

**١٥١- (صلم = سەلم):**

لە زمانا بەکرتانی گوێ دەگوترێ، لە زاراوا، لە عەرەبیدا بریتییە لە لابردنی وەتەدی بڵاوی کۆتایی (مَفْعْو لاَتُ) تەنیا لە عەرووز و زەربی دەریای سەریعدا ڕوودەدات، لە پاش صەلم دەبێ بە (مَفْعُو) دەبرێ بۆ (فَعْلُنْ = - -). صەلم لە عەرووزی سەریعا بەس بۆ تەصریعە.

بەڵام لە کوردیدا صەلم لە سەریع و موجتەس و خەفیف و ڕەمەلدا ڕوودەدا، نموونە بۆ کاتی شیکردنەوەی بەحرەکان.

(أصلم = ئەسلەم): ئەو دێڕەیە، یا ئەو زەربەیە کە سەلم کرا بێ. وەک حاجی - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - دەڵێ (ڕەمەلی ئەصلەم):

داخی کردم بە جەفا لالەڕوخێ زێبایێ

فاعلاتن + فعلاتن + فعلاتن + فعلن

پیری کردم + بەستەم لا + مەزەبێ تر + سایێ

**١٥٢- (المصمت):**

بڕوانە (البیت/ بەیتی موصمەت) (الصامت): (بڕوانە: حەرفی صامیت).

**١٥٣- (الصّائت):**

(بڕ: ٥٤ - حەرف/ ٧...).

(صلح):

موصطەلەح: زاراو: زاراوە: بۆ ئەوەی لەم جۆرە زاراو و ڕستانە تێبگەین، کە دەڵێین: سەروا لە زاراوا ئەوەیە، یا خەبن لە زاراوە ئەمەیە، پێناسەی زاراو (إیستیلاح: موستەلەح) دەکەین: زاراو - لە زاراودا - ئەوەیە وشەیێ وەک: قەتع، خەبن، تەی، عەرووز، تەشبیە، ئیستیعارە، یان تەعبیرێ وەک: ئیستیعارەی موصەررەحە، هۆنراوی کلاسیکی عەرووزی، هونەرە جوانەکان، دەریا نوێکان، زاراو وشەیەکە یا دەربڕینێکە، وەک ئەمانە، بەپێی بەکارهێنانی لە بابەتە زانستی و هونەری و پیشەیی و کۆمەڵایەتییەکاندا مانایەکی تایبەتی هەیە، کە جیایە لە مانا زمانییەکەی، واتە: لە چەند بابەتدا بەکاربهێنرێ لە هەر بابەتێکا واتای تایبەتی هەیە، جیایە لە ماناکانی تری بابەتەکانی تر.

## پازدەهەم: پیتی ضاد: حرف الضاد

ض = ٨٠٠

پیتی ضاد لە کوردی ڕەسەندا نییە، هەمیشە بەزێ دەخوێنرێتەوە، بەڵام هەندێ لە شاعیرەکان پیتی ضادیان کردووە بەڕەوی چامە، وەک مەحوی دەڵێ (موزاریعی هەشتی نەخرەبی مەکفوفی مقصور):

واعیظ لە ڕەندی مەیکەدە دەگرێ کە ئیعتیراض

راضی نییە بەسەر نویشتی ئەزەل. (إنّی لَرَاض)

لە پاش ئەم سەردێڕە ئەم وشانەی کردووە بەسەروای چامەکەی (ریاض، ئینقیباض، ئینقیراض، بەیاض، ئیعتیراض، المِرَاض).

**١٥٤- (الضرب):**

(بڕ: البیت/ هێڵکاری + کێشی بڕگەیی).

لێرەدا زاراوەکانی ناو دێڕە هۆنراو دیسان دەنووسینەوە بەمەبەستی ڕوونکردنەوەی پێویست بەپێی شوێن:

زاراوەکانی ناو دێڕ، بەکورتی ئەمانەن:

١- سەدر (صەدر): لەتی یەکەمی دێڕە هۆنراو.

٢- عەجز: لەتی دووەمی دێڕ.

آ- جا هەریەکێ لە صەدر و لە عەجز، لە بنچینەدا، بەتایبەتی لە شیعری عەرووزیدا، بەپێی دەریا و بازنەکانیان، لە سێ پێ، یا لە چوار پێ دروست دەبن، گەلێ جاریش جەزء، یا شەطر، یا نەهک دەکرێن، لەبەر ئەوە ژمارەی پێیەکانی دێڕ وا دەبێ هەشت دەبن، وا دەبێ شەش دەبن، وا دەبێ چوار دەبن، وا دەبێ سێ دەبن، وا دەبێ دوو دەبن (لە دێڕی هەڵتەکاو: بەیتی مەنهوکدا).

ب- وا دەبێ لە کوردیدا دەریای شەشی عەرەبی دەکرێ بەدەریای هەشتی، وەک هەزەج. بەڵکو هەزەج لە عەرەبیدا بەس بەمەجزووئی هاتووە، واتە: هەزەجی مورەببەع = هەزەجی چواری، کەچی لە کوردیدا هەزەجی شەشی و هەزەجی هەشتی هەیە، هەروا گەلێ لە دەریاکانی تر.

ج- جا هەموو بەش و هەموو پێ و برگەیێ، وە هەموو ڕستە و دەستەواژەیێ، بگرە زۆر لە پیتەکانی ئەمانە ناو و لەقەب و زاراوەی تایبەتی خۆیان هەیە، وە ئەم ناو و نازناو و زاراوانە بەپێی شوێنیان لە بەشەکانی دێردا دەگۆڕێن، بەپێی یاسایەکی دامەزراو، کە ڕەچاوکردنی کارەکە بۆ هەستیار زۆر ئاسان دەکا. بۆ نموونە: پێی سێیەمی دەریایەکی شەشی تەواو عەرووزە و پێی شەشەمی زەربە، بەڵام لە مەجزووئی ئەو دەریایەدا پێی دووەمی دەبێ بەعەرووز و پێی چوارەمی دەبێ بەضەرب... وە هەروەها.

١- سەدر (صەدر): یەکەم پێی لەتی یەکەم.

٢- ئیبتیدا (سەرەتا): یەکەم پێی لەتی دووەم.

٣- عەرووز: دوا پێی لەتی یەکەم.

٤- زەرب (ضەرب): دوا پێی لەتی دووەم.

٥- حەشو (ناواخن): پێیەکانی نێوان پێی سەدر و عەرووز، یان نێوانی پێی ئیبتیدا و پێی زەرب، هەندێ دەڵێن: حەشو پێیەکانی غەیری عەرووز و زەرب.

٦- سەروا، پیتەکانی سەروا، بزوێنەکانی سەروا، نەنگەکانی سەروا... تاد.

جا ئێستا دەست دەکەین بەڕاهێنان: ئاوا: شێخی خاڵ - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - دەفەرمووێ: (وافیر/ هەزەج):

آ- ئەمن دەمرم/ بەڵام وێنەم/ دەمێنێ - ب

(١) / (٢) / (٣)

ج- هیوام وایە/ کە خۆشی گەل/ ببینێ - د

(٤) / (٥) / (٦)

یەکەم: (آ - ب) = نیوە دێڕی یەکەم = لەتە دێڕی یەکەم = لەتی یەکەم = نیوەی یەکەم = میصراعی یەکەم = شەطری یەکەم = صەدر (سەدر).

دووەم: (ج - د) = نیوە دێڕی دووەم = لەتە دێڕی دووەم = لەتی دووەم = نیوەی دووەم = میصراعی دووەم = شەطری دووەم = عەجز.

سێیەم: (١) = سەدر.

چوارەم: (٢) = حەشو.

پێنجەم: (٣) = عەرووز.

شەشەم: (٤) = سەرەتا (ئیبتیدا).

حەوتەم: (٥) = حەشو (ناواخن).

هەشتەم: (٦) = زەرب.

نۆیەم: (آ - د) = دێڕ.

دەیەم: مێنێ × بێنێ = سەروا، جۆری موطلەق، جۆری ریدفداری وەصلدار، لە جۆری موتەواتەر.

یازدەهەم: پیتی ڕەوی (ن)ی وشەی (دەمێنێ) و (ببینێ).

دوازدەهەم: پیتی ریدف (ێ)ی یەکەمی (دەمێنێ) و (ببینێ).

سیازدەهەم: پیتی وەصل (ێ)ی دووەمی (دەمێنێ) و (ببینێ).

چواردەهەم: جۆری پیتی ریدف: حەزمی مورسەل.

خۆ ئەگەر دێڕ هەشت پێ بێ ئاوا بەشەکانی ناوزەد دەکرێن (جەزیری - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - هەزەجی هەشتی تەواو) دەفەرمووێ (هەزەج):

آ- بەناری فیر/ قەتێ صوهتم/ ژ فەرقی سەر/ حەتا پێدا - ب

(٤) / (٣) / (٢) / (١)

ج- خەدەنگاغەف/ لەتێ نوهتم/ ژ بەر قالا/ میعاتێدا - د

(٨) / (٧) / (٦) / (٥)

١- (آ - ب) = نیوە دێڕی یەکەم = ... تاد.

٢- (ج - د) = نیوە دێڕی دووەم = ... تاد.

٣- (١) = سەدر.

٤- (٢)، (٣)، (٦)، (٧) = حەشو (ناواخن).

٥- (٤) = عەرووز.

٦- (٥) = سەرەتا.

٧- (٨) = زەرب.

٨- (آ - د): دێڕ.

٩- پێدا × تێدا = سەروای موتەواتەر، موطلەقی ریدفداری وەسلدار.

١٠- پیتی ڕەوی (د)ی کۆتایی.

١١- پیتی ریدف (ێ)ی (پێدا) و (تێدا) لە جۆری حەزمی مورسەل.

١٢- پیتی وەصڵ ئەلفی (پێدا) و (تێدا). (بڕوانە: البیت و... جۆرەکانی).

ئەمە لە هۆنراوی عەرووزیدا، بەڵام لە هۆنراوی هیجا (ژمارەیی = پەنجە)دا، کە لە ژمارەیێ بڕگەی جیاجیا دروست دەبێ، جارێ لێرەدا بەم بۆنەیەوە دەڵێین:

یەکەم: ئایا کۆگیرێ هەیە بۆ کۆنترۆڵکردنی پێی هۆنراوی پەنجە؟ وە ئایا دەتوانرێ هۆنراوی بڕگەیی بەپێ (تەفعیلە)ی عەرووزی، وەک پێی بڕگەیی کۆنترۆڵ بکرێ یا نا؟ گریمان ئەگەر سیستەمێکی ئاوا هەبێ بۆ کێشانی هۆنراوی پەنجە، ئایا سوودی هەیە، یا زیادە سەراسێیە، لە زانستی کێشدا؟

با جارێ وەڵامی ئەمە بمێنێ تەنیا ئەوەندە دەڵێم: بەڵێ.

دووەم: دەبێ بزانرێ کە هۆنراوی بڕگەیی ستوونی و ئازادی هەیە، پێی هەیە، دێڕی هەیە، نیوە دێڕی هەیە، چامەی هەیە، تاک و مثنوی و سێیینە و چوارینە و پارچەی هەیە، سەدر و سەرەتا و عەرووز و حەشو و زەرب و سەروا و پیتی ڕەوی و پیتی سەروای هەیە، عەجز و صەدر (شەطری یەکەم)ی هەیە. بۆ نموونە دەڵێین: ئەم هۆنراوەی مەولەوی، لە دوو نیوە دێڕ دروست بووە، نیوەی یەکەم و نیوەی دووەم، ژمارەی پێیەکانی چوار پێن، هەر لەتەی دوو پێیە، ئاوا: (مەولەوی - کێشی دەیی):

آ- چوون دێوانەی شۆر/ ئازیز نەسەردا - ب

(١)        /        (٢)

ج- شەتاو سەر هۆر گرت/ وەدەشت و دەردا - د

(٣)        /        (٤)

١- (آ - ب) = نیوە دێڕی یەکەم.

٢- (ج - د) = نیوە دێڕی دووەم.

٣- (آ - د) = دێڕ.

٤- (١) و (٢) و (٣) و (٤) = پێ.

٥- (١) = سەدر.

٦- (٣) = سەرەتا.

٧- (٢) = عەرووز.

٨- (٤) = زەرب.

٩- (سەردا × دەردا) = سەروا، جۆری موطلّەق، موتەواتەر.

١٠- پیتی ڕەوی (ر)ی وشەی (سەردا) و (دەردا)یە.

١١- تاکی جووت سەروایە.

جا تەقطیع و دابەشکردن و پارچە پارچە کردن و دەستە دەستەکردنی هۆنراوی ژمارەیی ئەویش دەستووری خۆی هەیە، لەتە دێڕ بەپێی ژمارەی بڕگەکانی و جێگەی پشوو و لەنگەر و نەبرە، پێ پێ دەکرێ و ژمارە و سنووری پێیەکانی و چەندی و چۆنیەتیان دیاری دەکرێن. لەنگەر و قورسی و جێگەی پشوو لە کێشی ژمارەییدا ڕۆڵی گرنگ دەبینن. بۆ نموونە هەتا ئێستایش(*) وا باوە کە لە هۆنراوی دە بڕگەییدا لە پاش هەموو پێنج بڕگەیەک جێگەی پشووە، یا قورسایی بخرێتە سەر بڕگەی ئەخیریان. دەی لەم هۆنراوەی بەردەستماندا، لە نیوەی یەکەما قورسایی دەکەوێتە سەر وشەی (شۆڕ) و سەر وشەی (گرت) لە نیوەی دووەما، دوا بەدوای ئەم قورسییەیش (لەنگەر) یەکسەر وەستان و پشوودانێک لە خوێندنەوەدا ڕوو دەدا، هەمان لەنگەر و پشوودان و قورسایی لە کۆتایی هەردوو نیوە دێڕدا، لە کۆتایی دوو وشەی (سەردا) و (دەردا)وە ڕوودەدات.

---

(*) بۆیە دەڵێم: (هەتا ئێستایش...) چونکە شیرازەی هەموو شتێ پچڕاوە، بەڕاستی بووە بەپاشاگەردانی و بێ سەروبەری، کەس قسەی کەس ناخوێنێتەوە، وەک گاڵتەی مناڵ هەموو بەناو هەستیارێ، دەیەوێ یاسا دامەزراوەکان ببەزێنێ، سنوورەکانی شیعر، یاساکانی عەرووز بشکێنێ، چونکە بەخەیاڵی خۆی شتی نوێ دادەهێنێ و ئیبداع دەکا، دژ بەکۆنەپەرستی دەوەستێ، کەی داهێنان لە هەڵەدا هەیە، سەرپێچی لە دەستووری دامەزراوی کێشی، دەق وەک سەرپێچی لە دەستووری زمانەوانی وایە، بەلام کێ بەکێیە، وا بڕوا جیهان دەبێ بەناژاوەیەکی وا سەروبەری نەبێ.

بەلام خوا هەقە، بەشی خۆی هەقخواز ماوە، لە هەموو شوێنێ، کەم یا زۆر، مەردوم پەیڕەوی یاسا ناسراوەکان دەکەن، ولاتی خۆمان تازە بەئازادی ئاشنا دەبن، لەبەر ئەوە دوور نییە کە ڕای ناوازە لێرە و لەوێ سەر هەڵبدات، بەلام بەشێوەی گشتی (هەر ڕاستی سەردەکەوێ، زوو یا درەنگ ناڕاست ژێردەکەوێ).

لەبەر ئەوە بەیاریدەی خودا، زوو یا درەنگ، یاسا و ڕێساکانی عەرووزی کوردی بەبەشی کێشی و عەرووزییەوە، بەرە بەرە کۆنترۆڵ دەکرێن و تۆمار دەکرێن و دەچەسپێن، ئەو کاتە وەک باوە دەڵێن: (یاسا سەروەرە) لە کاتی هۆنینەوەی هۆنراویشدا (یاسای کێشی سەروەر دەبێ).

جا ئەم شوێنی لەنگەر و پشوودانە، جێگەی دیاریکردنی یەکە یەکەی پێیەکانی هەموو هەڵبەستێکی کێشی ژمارەییین. (با ئەم بابەتە بمێنێ بۆ جێگەی خۆی، خوا یار بێ بەتێروتەسەلی قسەی لێ دەکرێ).

جا وەک لە (البیت)دا ئاماژەمان بۆ ئەم جۆرە بابەتانە کرد، ضەربیش جۆری زۆر زۆرە، چەند زیحاف و عیللەی تووش ببێ بەناوی ئەوانیشەوە ناوزەد دەکرێ، وەک: ضەربی تەواو، ضەربی سالم، ضەربی مەحذووف، ضەربی مەخبوون، مەقبووز... تاد. لە بەحرەکاندا بەدوورودرێژی باس دەکرێن.

### ١٥٥- (ضرورة: ضرورات):

ناچاری، ناچاریەکان، ضرورة شیعریة: ناچاری هۆنراوەیی، ژمارەیان زۆرە لە پێشەوە ڕابووردن، ژمارەیان لە سەد پترە، زۆربەیان مەقبوولن و زۆربەی هۆنەران و هەستیاران بەکاریان دەهێنن، بڕێکیان تەنها پەیوەندییان بەهۆنراوی عەرەبییەوە هەیە، وەک ئەوانەیان کە لە چەشنی صەرف و نەحوو ئەمانەی عەرەبین، وەک تەذکیری موئەننەس و تەئنیسی موزەککەر و صەرفی مەمنووع لە صەرف و شتی تری لەم بابەتانە، کە لە کەسی خۆی نهێنی نییە. بڕێکیشیان زۆر زەق و ناقولان، هەستیاری تەوانا خۆی لێیان لادەدا، لە کوردیشا ناچاری کێش هەیە وەک ڕابورد.

(سەرنج):

من وا بەباش دەزانم نووسەری کورد و کێشزان و هەستیار و ئەدیبەکانمان، پێویستە لەسەریان کە لەمە زیاتر ڕێگە بەشاعیرە نوێخوازەکان نەدەن، کە بەناوی داهێنانەوە، هۆنراو لە قالبی رسکاوی ئاسایی خۆی لەمە پتر دوور بخەنەوە، هۆنراوی وا پەیدا بووە، سۆزی دەروێش و هۆرەی جافی، پتر لە شیعر دەکا، هەتا ئەم بڕسکان و شەطەحاتەی ئەمان!

### ١٥٦- (المضارع):

ناوی بەحرێکە لە بەحرە خەلیلییەکان.

### ١٥٧- (الضمیر):

زەمیر: ڕاناوی عەرەبی بەتایبەتی لە کێش و سەرروادا، بڕیاری جۆراوجۆری زۆری لە بابەتەوە هەیە، لە (الضرورات الشعریة)دا کۆمەڵێ زانیاری لەم بارەیەوە ڕابوورد (بڕ:

ناچاریەکان/ ١٢ - آ، ب، ج، د، هـ، و) + (١٠٢ - تێبینی/ ٦، ٩) + (نووسینی عەرووزی/ ١/ ٦) + (برگەی کوردی/ چەن تێبینییەک) ڕاناوی کوردیش لە کێشدا ڕۆڵ دەبینێ.

(إضمار):

ئیزمار لە زمانی عەرەبانا واتە: شاردنەوە، لە زاراوەی کێشا بریتییە لە وەستاندن (تسکین)ی دووەم پیتی بزواوی پێی (متفاعلن) لە بەحری کامیلا بەتایبەتی، واتە: دووەمی بزواوی سەبەبی قورسی سەرەتای (متفاعلن) بێ بزوێن دەکرێ، دەبێ بە(متفاعلن = مستفعلن) ئەم گۆڕانە تایبەتە بەدەریای کاملەوە و بەس.

(المضمر):

موزمەر ئەو پێیەیە لە دێڕ، کە تووشی ئیزمار بووە، هەروا ئەو دێڕە هۆنراوەیشە کە ئیزمار تووشی پێیەکانی بووە، وەک (کامل) نامی دەفەرمووێ:

(نامی) غولام و بەچکە غولامێکی خالیصە

شایانە بێتە سێبەری ئالای شەفاعەتت

## ١٥٨- (التضمين):

تەضمین بەچەن واتایێ هاتووە:

١- ئەوەیە: ئایەتێ، یا فەرموودەیێ، یا شیعری کەسێکی تر، یا پەندێکی پێشینان، یا فەرمایشتی گەورە پیاوێ، بخەیتە ناو شیعری خۆتەوە، یا ناو چامەیەکەوە و تێهەڵکێشیان بکەی، بەلام ئەگەر شتە تێچەنەکە، باو و ناسراو نەبوو، لە ناو مەردوما، ئەوە دەبێ بەهەر شێوەیێ بگونجێ بیسەران و خوێنەرانی لێ ئاگادار بکەی، وەک ئەوە شیعرە تەضمین کراوەکە، بخەیتە ناو کەوانەوە. بۆ نموونەی ئەم هونەرە، من گوتوومە لە تەضمینی شیعرێکی مەولەویدا (دە برگەیی):

مەڵێ: چۆن چۆنی جێی دەبێتەوە

ئەورەی شک بخە ژێری پێتەوە

(گەر ذەرێ شوعور هەیە پێتەوە

کەوتیان خودا ئەبڕێتەوە!)

بەقەد نیسکێکە دیسکی کۆمپیتەر

بەقەد سەد مەلا شیعری وا لەبەر

٢- ئەوەیە: مێژوویێ لەخۆ بگرێ، وا دەبێ بەدەقی ڕاشکاو مێژوویێ لەخۆ دەگرێ، وەک ئەم هۆنراوەیەی مەحوی (هەزەجی هەشتی):

لە تاریکی شەوی کوفرا بەیەک دەم لەمەعیەیێکی دا

(هەزار و سێ صەد و بیست و دووە دنیا چراخانە)

وا دەبێ بەئاماژە و هێما مێژووی ڕووداوێ، یا شتێ تۆمار دەکا (بڕ: المؤرخ).

٣- تەضمین یەکێکە لە نەنگەکانی سەروا، کە ئەوەیە کێشی دێڕێ تەواو ببێ، بەڵام واتاکەی هێشتا بەتەواوی تەواو نەبووبێ و سەرواکەی بەسرابێ بەسەرەتای دێڕی دوایەوە، هەندێ بەم جۆرە تەضمینە دەڵێن (إغرام) ئەمەیش جۆری زۆرە، وەک ئەوە موبتەداله شیعری یەکەما بێ و خەبەرەکەی لە شیعری دووەما بێ، یا فیعل لە یەکەما و فاعیلی لە دووەما، یا وێنەی ئەمانە. وەک (بەسیط):

أقُولُ أرى كَعْبـاً وَلِحْيَتَـهُ:

لاَبَارَكَ اللّهُ في بِضْعٍ وَ (ستِين

من السنين) تَمَلأَهَا بِلاَ حَسَبٍ

وَلاَ حَيَـاءٍ وَلاَ قَـدْرٍ وَلاَ دِينِ

یا وەک ئەم شیعرانەی نابیغە کە لە چامەیەکا دەڵێ (وافیر):

هُمْ وَرَدُوا الجِفَـارَ عَلى تَمِيمٍ

وَهُمْ أصْحَابُ يَومِ عُكَاظَ (إنِّى

شَهِدْتُ) لَهُمْ مَوَاطِنَ صَادِقَاتٍ

بِخَيْرِهِمُو، بِنُصْحِ الصَّدْرِ مِنِّى

ئەم جۆرە تەضمینە دوو جۆری هەیە: ناشیرین وەک ئەم نموونانەی ڕابووردن، جۆری دووەم بەناشیرین دانانرێ، لەبەر ئەوە بەر نەنگی سەروا (عەیبی قافیە) ناکەوێ. ئەم جۆرە چەشنی زۆرە، پوخت و کورت: ئەگەر تەضمین نیشانەی هەناسەسواریی هەستیاری، لە لایەنی کێشەوە، پێوە نەبوو، وە لە لایەنی واتا و ڕازانەوەی بێژەیی و وشەئاراییەوە، هونەری تیا بوو وە شیعری دووەم ڕاڤە و ڕوونکردنەوەی شیعری یەکەم بوو، ئەوە قەیدی

نییـه، بەڵکو کـارێکی هونەری جوانە، وەک ئەم دوو دێڕەی مـەولەوی، لە دێڕی یەکـەمـا کۆمەڵێ وشە هەیە، لە دێڕی دووەما ڕوون کراونەتەوە (دە بڕگەیی):

ڕێی چەن هەزارساڵ(١) تەی چەن حیجابات(٢)

ذاتی حەق(٣) کەلام(٤) سونال(٥) جەوابات(٦)

چوو(١) بوو(٢) دی(٣) بیستی(٤) کریا(٥) دریاوە(٦)

هاتەوە حەلقە هەر ئەلەریاوە!!

وەفایی دەفەرمووێ:

صـەبا دەخـیـلم هەر تاکـو مـاوم

بلـێ بـەزاری، بـڕۆ بـەخـــــالـم:

دەمـــێکی بابێ دەوای دڵم کـــا

بـەچاوەکـــانی گــەلێ بێ حــالم

دوکتۆر عەزیز گەردی دەڵێ: (تەزمین یەکێ لە عەیبەکانی شیعری کلاسیکییە، ئەوەیە: سـەروا ئەرکی وەسـتـان نەبینێ... یەکـێـتـیی دێڕە شـیـعـر نـەمێنێ. ئەگـەرچی لە بۆچوونی ڕەخنەگرانەی نوێدا، ئەوە بەچاکەی شیعر دادەنرێ...)... گۆران دەڵێ:

من کچ مامزی بەندیخانەی ژین

سزای تاوانم

بەدەستی باوکی خۆم چووم بەسەربڕین

پرچی پەخشانم

تلا لە خوێنا و کەوتە سەر چاوم

ئیتر نەمبینی

لە جەرگی باوکما سەری بڕاوم

چۆن بوو برینی...)... تاد... تەواو.

ئەمـە لە کۆنیـشـا زۆر لە هەسـتـیـارانی عـەرەب، ئەم جۆرە تەزمینەیان بەنەنگی سـەروا دانەناوە، وەک ئەم پارچە هۆنراوە کـە دەدرێتـە پاڵ خـەلیل خـۆی، یا دەدرێتـە پاڵ ئەبو عوتاهیە (سەریع):

أطلب أني لستُ أدري بمـــا قُتِلْتُ إلاَّ أنني بَيْنَمَـــــا
أنَا بِبَابِ القَصْرِ في بَعْضِ ما أطْلُبُ مِنْ قَصْرِهِمْ إذْ رَمى
شِبْهُ غَزَالٍ بَسهَــامٍ فَمَـــــا أخْطَــأ سَهْمَـاهُ ولَكِنَّمـــا
عَيْنَاهُ سَهْمَانِ لهُ كُلَّمَــــــا أرَادَ قَتْلِـي بِهِمَـا سَلَّمَـا

١٥٩- (الـضَّـمَّـة):

بۆر، یەکێکە لە سێ بزوێنەکان لە زمانی عەرەبیدا، زۆرجاران پیتێکی بۆردار، تێر دەکرێ تا واوێکی لێ پەیدا دەبێ، جاروبار ئەم تێرکردن و ئیشباعە لە گشت پێیەکانی دێڕدا ڕوودەدا (بڕ: ناچاریەکان/ ١١، ١٢).

## شـازدەهـەم: پیتـی طێ: حـرف الـطّـاءِ

ط = ٩ (بڕوانە/ الف/ ٣٥)

پیتی طێ لە کوردی ڕەسەنی باودا نییە، هەمیشە بەتێی بچووک دەخوێنرێتەوە، بەڵام هەندێ لە هەستیاران چەند وشەیەکی عەرەبی، وەک (فقط، سەقەط، نەمەط)یان کردووە بەسەرواى چامەکانیان. حەریق - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - لە چامەیەکا طێی کردووە بەهاوسەرواى تێ، وەک لەم دێڕەدا دەڵێ (هەزەجی اخرب):

تەعمیری دڵی باغی لە باغ چاترە قوربان

لەم چاوە منیش مونتەظیری مائی فوراتم

تا مەطلەعی کەنعانیە نێو چاهی ضەمیرم

سەنگین بەسەعادەت بۆ تەرازووی نیشاطم

لە دێڕەکانی تری ئەم چامەیەدا ئەم وشانە و وێنەیان کراون بەسەروا (گۆناتم، خەڵاتم، ثباتم، براتم، وڵاتم...). بڕوانە سەرەتای پیتی ذال.

١٦٠- (المطبوع):

شیعری مەطبووع: هۆنراوی ڕەسەنی سەلیقی، کەرێکی سروشتی مرۆڤی هەست ناسک بێ.

١٦١- (المطابقة):

(بڕ: التصریع).

١٦٢- (المطرد):

دەریایەکە لە دەریا نوێ داهێنراوەکان، جۆرێکە لە پێچەوانە (مقلوب)ی موزاریع. (بڕ: دەریا و کێشە نوێکان).

١٦٣- (المطرّز):

کۆمەڵێ هۆنراوە کە پیتی یەکەمی سەرەتای دێڕەکانی، کاتێ کۆبکرێنەوە بەڕیز، ناوێ، یا ڕستەیەکی جوانیان لێ پێکدێ، زۆرتر ئەو ناوە ناوی یارەکەی هەستیارەکەیە، کە

شیعری بەسەردا هەڵ دەدات، وەک (شیرین، دولبەر، زین، لیلی). موطەررەز بەواتا مووەششەحیش دێ.

### ١٦٤- (الطرفین):

مەبەست موعاقەبەی طەرەفەینە، کەواتە: بڕوانە: (١٨ - البریٔ) لەوێدا بەدوورودرێژی موعاقەبە و جۆرەکانی باس کراوە.

### ١٦٥- (مطلع):

سەردێڕ: هەڵاتگە: یەکەم دێڕی چامە: یەکەم دێڕی قەصیدە: سەرەتای چامە و غەزەل و پارچە هۆنراوە. (بڕ: بەیتی موصەررەع).

د. عەزیز گەردی دەڵێ: (مەتلەع و مەخلەس و مەقتەع) ئەم سێ زاراوە لە دیراساتی قیتعە و غەزەل و قەسیدەدا زۆر دووبارە دەبنەوە، چونکە لە بنیات و هەیکەلی هۆنراوەدا شوێنی گرنگیان هەیە و، وەک سێ حەلقەی توندی بەیەکەوە گرێدان و، سێ ستوونی پتەوی داڕشتن و ڕاگرتنی هۆنراوەن.

حوسنی داڕشتنی ئەم سێ ڕەگەزە بەمەرجی هۆنراوەی سەرکەوتوو دانراوە: (حوسنی مەتلەع و لوتفی مەخلەس و حوسنی مەقتەع).

حوسنی مەتلەع ئەوەیە: شاعیر سەرەتای هەر شیعرێک بەجۆرێ بێنێ لە مەبەستی خۆی بوەشێتەوە و، سەرەتا بەوشەی دزێو دەست پێ نەکا... لایەکی هەرە گرنگی مەتلەع لە ڕووی بینا و شکڵی شیعرییەوە تەسریعە (بڕ: مبدء).

لوتفی مەخلەس: ئەمە لە ناو قەسیدەدا دێ و، زۆرجار بەفارسی (گریز)ی بۆ بەکار هاتووە، مەخلەس یان تەخەلوس ئەوەیە شاعیر لە پێشەکی نەسیب و تەشبیبەوە بچێتە سەر مەبەستی سەرەکی هۆنراوەکە، ئەم گواستنەوەیە دەبێ بەشێوەیەکی وەستایانە بکرێ...

حوسنی مەقتەع: دێڕی کۆتایی هۆنراوە گرنگییەکی تایبەتی هەیە، چونکە نیشتنەوەی حاڵاتی سۆز و، تەواوبوونی ڕشتەی بیر و چرکەی ماڵاوایی خوێنەرە لە هۆنراوەکە و کاریگەری تا ماوەیەکی زۆر لای خوێنەر دەمێنێ... تاد).

**١٦٦- (الإطلاق):**

بەم زاراوانە دێ:

١- ڕەهایی، وەک: (هۆنراوی ڕەها: شیعری موتلّەق، بەرابەر شیعری مقیّد).

٢- حەرفی ئیطلاق: پیتی ڕەها (بڕ: ناچاریەکان/ ١١).

٣- سەروای ڕەها: قافیەی موتلّەق.

٤- دەگوترێ: مطلق الفاء، یا مطلق العین، ئەوەیە کە پیتێکی ڕیشەیی (ئەصلّی) لە وشەیەکا دروست بێ بەهەریەکێ لە سێ بزوێنەکە، کە سەر و بۆر و ژێرن بخوێنرێتەوە، وەک ئەوە بلّێی: فُعَلاَء بەموتلّەقولفاء، بەبۆر وەک: خویەلاء = فوعەلاء، بەسەر وەک: جەنەفاء = فەعەلاء، بەژێر وەک: سِیَراَء = فیعەلاء، موتلّەقوعەینیش وەک (أربِعَاء) بەبۆر و سەر و ژێری بیکەی کە عەینی فیعلی وشەکەیە.

**١٦٧- (طویل):**

بەحری تەویل: دەریای ژێر، دەریایەکی خەلیلییە، یەکەم دەریایە لە یەکەم بازنە (بڕ: الدائرة).

(المستطیل): دەریایەکە لە دەریا نوێکان، پێچەوانەی دەریای تەویلە ئاوا: (مفاعیلن فعولن × ٤).

**١٦٨- (طیّ):**

تەی لە زمانا واتای پێچانەوەیە، لە زاراوەدا بریتییە لە لابردنی چوارەم پیتی وەستاوی پێ، بەمەرجێ دووەمی سەبەبی سووک بێ (بڕ: نەخشەی/ ١ زیحافە تاکەکان/ ٢).

## حەڤدەهەم: پیتی ظێ: حرف الظاء

ظ = ٩٠٠

پیتی (ظ) لە کوردیدا نییە، گەر هەستیاریێ بەکاری بهێنێ بۆ سەروا و ژمارەی نەبجەدی لە وشەی عەرەبی وەریدەگرێ، وەک چامەی یەکەمی پیتی ظێی دیوانی مەحوی. (بڕ: پیتی ذال) + (الف/ ٣٥ - تێبینی).

١٦٩- (مِظَلَّةُ القَافِيِة):

کلاوەی سەروا: چەتری سەروا، مەبەست لەم زاراوەیە نەخشەی پارچەکانی پیت و بزوێنەکانی سەروایە (بڕ: سەروا).

## هەژدەهەم: پیتی عەین: حرف العین

ع = ٧٠

**١٧٠- (العَبَّابَا):**

جۆرێکە لە هۆنراوی ڕەشۆکی، لە جۆری زەجەلە (بڕ: زجل).

**١٧١- (عِبأ):**

بارگرانی.

**١٧٢- (العَجُز):**

(بڕ: الضرب) و (معاقبة العجز).

**١٧٣- (عَدَد):**

وەک: عَدَد أبْيَاتِ القصيدة: ژمارەی دێڕەکانی چامە، نابێ لە حەوت دێڕ کەمتر بێ، لە حەوت کەمتر بێ پێی دەگوترێ قطعه (پارچه)، وەک: عَدَدُ القَوافي: ژمارەی سەروا دوو جۆرە: موقەییەد و موطلەق، موقەییەد سێ جۆری هەیە: ١- موئەسسەس. ٢- مەردووف. ٣- موجەررەد. موطلەق: شەش جۆری هەیە: (بڕ: سەروای رەها).

**١٧٤- (- الأعرج):**

(الرباعی الخالص). (الرباعی المعرج).

**١٧٥- (عروض):**

بەم واتایانە هاتووە:

١- دوا پێی نیوە دێڕی یەکەم لە گشت هۆنراوێ: (بڕ: ضرب).

٢- عەرووضی بەلەد (بڕ: - البلد).

٣- علم العروض: زانستی عەرووز: کێشناسی: زانستێکە کێشی ساغی هۆنراوی لە کێشی ناساخ و لەنگ پێ جیا دەکرێتەوە (بڕ: علم العروض).

٤- بەپێی ئەو گۆڕانکارییەی کە تووشی عەرووزی دێڕ دەبێ، ناو و نازناوی جیاجیای لێ

دەنرێ، ئەگەر خەبن بكرێ، دەگوترێ عەرووزی مەخبوون، واتە: عەرووزی خەبن كراو. (بڕ: ٢٢ - البیت - ٢). لە بەحرەكانا بەباشی جۆری عەرووز دێ.

١٧٦- (المعَرَّی):

تەعرییە واتە: تەجرید، وەک ئەوە دەگوترێ: ئەم عەرووزە موعەررایە لە تەسبیغ و تەذییل و حەذف و طەی و تەرفیل و... تاد (بڕ: ٣٦ -التجرید).

١٧٧- (عەصب):

لە زمانا بەواتای قەدەغەكردن و بەستن دێ. وەک زاراوە بریتییە لە وەستاندنی پیتی پێنجەمی بزاوی (مُفَاعَلَتُنْ = ب-ب ب-) لە وافیردا و، دەیگۆڕێ بە (مَفَاعلین). عەصب تایبەتە بەوافیرەوە، دەگوترێ: عەرووزی معصوب، ضەربی معصوب، بەیتی أعصب، پێی مەعصوب.

١٧٨- (شیعری عاطل):

واتە: هۆنراوی بێ خشل: شیعری بێ خاڵ و بێ نوختە وەک (دە بڕگەیی) (بڕ: شیعری حالی):

هەر كوردە ماوە، دوورە لە ئاڵا

ئەم (هەمە) ئاڵا لە دڵ وەک كاڵا

لە عەرەبیدا وەک (سەریع):

وَاللهِ مَا السُّؤْدَدُ حَسْوُ الطِّلاَ

وَلاَ مُـرَادُ الحَمْـدِ رُودٌ وَرَاحْ

وَاهاً لِحُـرٍّ وَاسِعٍ صَـدْرُهُ

وَهَمُّـهُ مَـا سَـرَّ أَهْلَ الصَّلاَحْ

١٧٩- (عقضب):

لە زمانا بەواتای پارچە پارچەكردن هاتووە. بۆ زیادە ڕوونكردنەوە لێرەدا ئەم زاراوانە ڕوون دەكەینەوە: خەرم و عەضب و عەصب و عەقص و عەقل و ئەعضەب و نقص و قەصم و مەعصوب و ئەعقەص و ئەقصەم و ئەجەمم و جەمەم (كە ئەمانە هەموویان جگە

له خەزم هەر لە وافیردا ڕوودەدەن و بەس). دەڵێین (مُفَاعَلَتُن = ب-ب ب-).

١- بەخرم دەبێ بە(فاعلتن = مفتعلن) پێی دەگوترێ: ئەخرەم و مەخرووم و ئەعضەب. بەخەرمی وافیر دەیشگوترێ: عەزب.

٢- بەعەصب دەبێ بە(مفاعیلن) پێی دەگوترێ: مەعصووب.

٣- بەخەرم و عەصب دەبێ بە(فاعیلن = مفعولن) پێی دەگوترێ: ئەقصەم بەم کردارە دەگوترێ (قصم).

٤- بەخەرم و عەصب و کەف دەبێ بە(فاعیل) ئاوا: (مفاعلتن ـــــ فاعلتن ـــــ فاعیلن ـــــ فاعیل) نەقڵ دەکرێ بۆ (مفعول =--ب) پێی دەگوترێ: ئەعقەص، وە بەم کردارە دەگوترێ عەقص.

٥- بەعەصب و عەقل دەبێ بە(مفاعلن) پێی دەگوترێ: مەعقوول.

٦- بەخەرم و عەصب و عەقل دەبێ بە(فاعلن) پێی دەگوترێ (ئەجەمم) وە بەم کردارە دەگوترێ: (جەمم).

٧- بەعەصب و کەف - کە بەم کردارە دەگوترێ: نەقص - (مفاعلتن = ب-ب ب-) دەبێ بە(مَفَاعیل = ب---) پێی دەگوترێ: مەنقووص. (بڕوانە: خەرم و یەکە یەکەی ئەم زاراوانە لە لیستەکان و دەریاکاندا، بەتایبەتی دەریای وافیر).

## ١٨٠- (عطف):

بۆ کرتاندنی حەرفی عەطف بڕوانە (ناچاریەکان/ ٨٥ - تێبینی/ ٣).

## ١٨١- (مُعَاظَلَة):

## ١٨٢- (المُعَاقبة):

دوو جۆری هەیە: جۆری یەکەم بەکورتی:

آ- پێناسەکەی ئەوەیە: (کە دوو سەبەبی سووک لە تەنیشت یەکەوە بن، چ لە یەک پێدا بن، وەک (عیلن) لە (مفاعیلن)دا، وە چ لە دوو پێی پاڵ یەک دابن، وەک (تن) و (فا) لە (فاعلاتن فاعلن)دا، دروست بێ کە بەنۆرە پیتی وەستاوی یەکێ لەو دوو سەبەبە بکرتێ، یا هەردوو سەبەبەکە بەساغی بمێنن، بەڵام دروست نەبێ کە پیتی وەستاوی هەردوو سەبەبەکە پێکەوە بکرتێن).

ب- یا ئەوەیە کە چوار سەبەبی سووک لە سێ پێدا بن، لەسەر یاسای پێشووی ژمارە (١) دوو دوو نۆرەکرتێ بکەن وەک (تن) و (فا) و (تن) و (فا) لە (فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)دا.

موعاقەبە لە یەک پێدا لەم پێنج دەریایەدا دەبێ: طەویل و هەزەج و وافیری مەعصووب و مونسەریح و کامیلی موضمەر، لە دوو پێ یا لە سێ پێدا لەم چوار بەحرەدا دێ: (مەدید و رەمەل و خەفیف و موجتەث) موراقەبە و تەراقوبیش لە دوو بەحردا دێ: (موضاریع و موقتەزەب). موعاقەبە سێ جۆری هەیە: صەدر و عەجز و طەرەفەین (بڕوانە: ١٨ - البریٔ + المراقبە).

جۆری دووەم: تایبەتە بەسەرواوە، پێی دەگوترێ: (تَعَاقُبُ الردفین) کە ئەوەیە لە سەروای ریدفداردا، واو و یێ لە سەروای دێڕەکانی هۆنراودا، بەتێکەڵی ببن بەپیتی رەیدف. بۆ ڕوونکردنەوە دەڵێین: پیتی ریدف لە چامەیەکا ئەگەر ئەلف بوو، دەبێ لە سەراسەری دێڕەکانی چامەکەدا، لە شا دێڕەوە تا دوا دێڕ، پیتی ریدف تەنیا ئەلف بێ، وەک چامەی بەحری نووری مەحوی، کە ئەمە سەردێڕەکەیەتی (هەزەج):

(وَصَلَّی اللە علی) ئەو بەحری نووری عیلم و عیرفانە

کە دەرکی غەوری ناکا (غیرُ عِلْمِ اللّهِ سُبْحَانَە)

ئەوەتا سەرواکانی دێڕەکانی دواوە هەموویان پیتی ریدفەکەیان ئەلفە ئاوا: (مەنناننە، قورئانە، چراخانە، ئەبەدمانە... تاد).

بەڵام پیتی ریدف لە هۆنراودا ئەگەر واو بوو، وا باشە کە لە گشت دێڕەکانیدا واو بێ، وەک لە بەشێکی تری ئەم چامەی نوورەدا ئەم جۆرە وشانە کراون بەسەروا: (چوون، بوون، ئەندەروون، ئەخوون، دوون... تاد) وە هەروا ئەگەر یێ بوو، وەک لە بەشێکی تری ئەم چامەیەدا هاتووە: (یەقین، مورسەلین، دواترین، سەرزەمین... تاد). ئەوەندە هەیە لە هۆنراو و چامەی عەرەبیدا ریدفی تێکەڵ هەیە، کە پێشی دەگوترێ (تعاقب الردفین) کە ئەوەیە واو و یێ لە چامەیەکا ببن بەپیتی ریدف لەگەڵ یەکتریدا وەک: (شعور، خطیر، سعیر، صور، حور، خور، بور، بیر، دنانیر، قبور، قصور... تاد).

(تێبینی): جیاوازی لە نێوان موراقەبە و موعاقەبەدا ئەوەیە: (موراقەبە لە نێوانی دوو پیتی وەستاوی دوو سەبەبا ئەوەیە: کە نابێ هەردووکیان بمێنن، یا هەردووکیان نەمێنن، بەڵکو دەبێ یەکێکیان بمێنێ و یەکێکیان نەمێنێ، بەڵام موعاقەبە ئەوەیە: دروستە کە

هەردووکیان بمێنن، بەڵام دروست نییە کە هەردووکیان نەمێنن، گەرچی دروستە بەسەرە یەکێکیان بمێنێ و یەکێکیان نەمێنێ).

## ١٨٣- (العَقْص) و (الأعقص):

(بڕوانە: عەضب).

## ١٨٤- (العقل، المعقول):

(بڕوانە: عەضب). عەقل بەواتە بەستنەوەیە، جارێ صەحابەیێ وشترێکی پێ بوو، هات بۆ خزمەتی پێغەمەر - دروودی خودای لەسەر - عەرزی کرد: قوربان! وشترەکەم ببەستمەوە و عەمەل بەسەبەبی ظاهیر بکەم بۆ پاراستنی، یا بەرەڵای کەم و پشت بەسەبەبی مەعنەوی ببەستم کەتەوەککولە؟ پێغەمەر دروودی خودای لەسەر بێ، فەرمووی: (اعْقَلْهَا وَتَوكَّلْ: بیبەستەرەوە ئەوجا پشت بەخودا ببەستە!). واتە: کارکردن بەهۆکاری ئاشکرا دژی تەوەککول نییە.

## ١٨٥- (المعكوس):

شیعری پێچەوانە ئەوەیە: لە ڕاست و لە چەپەوە بخوێنرێتەوە، ئەمەیش دوو جۆری هەیە: جۆری یەکەم ئەوەیە: لە چەپەوە بەپێچەوانەوە بخوێنرێتەوە و هەمان لەفظ و هەمان مەعنای پێشووی هەبێ، وەک (ربَّكَ فكبِّر) یا وەک ئەم هۆنراوە (ڕەجەز):

أُسْ أرْمَلاً إذَا عَرَا  وَارْعَ إذَا ألْمَرْءُ أسَا
أُسْلُ جَنَابَ غَاشِمٍ  مُشَاغِبٍ أنْ جَلَسَا

دەبینین کە مەرج نییە لە کاتی پێچەوانەکردنەوەدا، بزوێنی پیت و ڕێنووسی وشە، دەقاودەق وەک خۆی بمێنێ، تەنیا ئەوەندە بەسە کە لە کاتی پێچەوانەکردنەوەدا بچێتە سەر هەمان پیت.

جۆری دووەم ئەوەیە: دوا وشەی دێڕ بکرێ بەیەکەم وشەی و وشەی پێش ئەویش بخرێتە دوای ئەو و هەروەها، هەتا یەکەم وشەی دەبێ بەدوا وشەی، ئاوا (کامیل):

حَلمُوا فَمَا سَاءَتْ لَهُمْ شِيَمُ  سَمَحُوا فَمَا شَحَّتْ لَهُمْ مِنَنُ
سَلِمُوا فَلاَ زَلَّتْ لَهُمْ قَدَمُ  رَشَدُوا فَلاَ ضَلَّتْ لَهُمْ سُنَنُ

کەرێک ئاوا دەخوێنرێتەوە (کامیل):

مِنَنٌ لَهُمْ شَحَّت فَمَا سَمَحُوا　　شِيَمٌ لَهُمْ سَاءَتْ فَمَا حَلِمُوا

سُنَنٌ لَهُمْ ضَلَّتْ فَلاَ رَشَدُوا　　قَدَمٌ لَهُمْ زَلَّتْ فَلاَ سَلِمُوا

دەبینین لەم چوارینەیەدا وەک بێژەکان پێچەوانە بوونەتەوە، واتای گشتی ڕستەکانیش پێچەوانە بوونەتەوە، لە خوێندنەوەی یەکەمدا وەسپێکی جوانە، کەچی لە خوێندنەوەی دووەمدا زەمێکی خەستە.

ئەم جۆرە زانیارییانە لە کوردیدا، گەرچی زۆر نوێن، لەبەر ئەوە تا ڕادەیەکیش کاڵ و کرچن، بەڵام بەبێ گومان کە ڕۆڵ دەبینن، چونکە هەموو کەسێ هەموو شتێ نازانێ، شتیش کە زانرا بەرە بەرە خەڵک خەریکی بەجێهێنانی دەبێ، ئەوەی کە بەندەی دڵسۆزی خوێنەری بەڕێز و ئازیز، دڵنیام لێی ئەوەیە: (یەک وشەی باش بخەیتە سەر خەرمانی فەرهەنگ و ئەدەبیاتی کوردی، خزمەتێکی گەورە بەکورد خۆی و زمان و کیانی دەکەی. چونکە هەر مەڵێ ئاوازێ دەخوازێ، ئەوەی بەلای تۆوە گاڵتە و گەمەیە، لە لای کەسێکی تر کارێکی هونەری نایابە و زۆر گرنگە بەلایەوە...).

**١٨٥- (العِلّة):**

(بڕوانە: دوا المعمّى). (المعلّقات)

**١٨٦- (عِلْمُ العَرُوض):**

زانستی کێشناسی: کێشناسی: بریتییە لە کۆمەڵێ ڕێسا و بنەمای کێشی، کە زانینیان دەبێ بەهۆی ناسینی کێشی ڕاست و ڕەوان و بەهۆیەوە کێشی چەوت و لەنگ لە کێشی ڕێک و ڕەوان جیا دەکرێتەوە.

بابەتەکەی - واتە: مەوزووعەکەی - هۆنراوە، لە ڕووی دروستی و نادروستیی کێشەکەیەوە. مەبەست و ئامانج و غایەکەی: فێربوونی هۆنراوی ڕەوان و جیاکردنەوەیەتی لە هۆنراوی ناڕەوان. (علم القافية: سەرواناسی).

**١٨٧- (اعتماد):**

(بڕ: ١٥- ئیبتیداء) (الشعر العمودي: هۆنراوی ستوونی: بڕوانە: ١٤٠- الشعر/ ٤، ٥).

۱۸۸- (العامِّيّة):

واته: هۆنراوی رەمەكی، كە وەک هۆنراوی رەسەنی بەرزی خاوەن كێشی هونەری نەبێ و، رەشۆكی و سادە بێ، بەپێی یاسا خەلیلییەكان نەبێ، گەلێ جاریش وشەی عامی (رەمەكی) تێ دەكەوێ، لە دەریا نوێكانا دێ.

۱۸۹- (المعَمَّی):

مەتەڵ، هۆنراوی مەتەڵ، مەبەست لەم جۆرە هۆنراوە دوو شتی سەرەكییە: یەكەم زاخاوی مێشک، دووەم: ناوەرۆكی جیاجیای ئایینی و رامیاری و كۆمەلایەتی و جینسی و دڵداری و رۆشنبیری، كە هەستیار بەبەردێ دوو نیشان دەشكێنێ، یەكەم مەبەستی خستنە كاری بیری خوێنەوەرانە و هۆشیاركردنەوەیانە. دووەم: سەیری و عەنتیكەیی مەتەڵەكە وا لە خوێنەر دەكا زیاتر گرنگی بەبابەتەكە بدا، بەڵكو گەلێ جار مەتەڵەكە ناوەرۆكەكە وا شیرین دەكا، خەڵک لەبەری دەكەن و پەخشی دەكەنەوە. وەک مامۆستا گۆران - رەحمەتی خودای لێ بێ - دەڵێ:

ماری درێژ و باریک
سەری لە كونی تاریک
دەرئەهێنێ و بەزمان
هێڵ ئەخاتە رووی مەیدان
رووی مەیدانی بەفرینە
هێڵ یان سوورە، یان شینە!
هەر هێڵی تەماشاكەی
چیی كێلا بێ تێی ئەگەی!
ئەم ماری سک پڕ ئاوە
ئاخ ئەتزانی چیی ناوە!

هەڵهێنانی ئەم مەتەڵە ئاوایە: پاندانی پڕ مەرەكەب، كە زمانێكی دوو پەلی وەک زمانی ماری هەیە، كە پێی دەگوترێت نووک، كە سەری لە قەباغەكەی دەردەهێنێ، دێڕی سەوز و شین و رەش و سوور و سپی لەسەر روو پەڕی كاغەزی سپی وەک بەفر دەنووسێ و

چۆن لە ناو وەردی داچێنراودا تۆوی نادیاری چێنراوی جۆربەجۆر هەیە، ئاوا لە ناو ئەم دێڕانەدا مەبەستی جوان جوان باس کراوە، کە دەیخوێنیتەوە تێی دەگەی!

**٢٠٠- (العِلّة):**

هۆ و نەخۆشی و دەغەز و دەردە. لە زاراوی کێشزانیدا گۆڕینێکە بە لێ کەمکردن، یان بە لێ زیادکردن، زۆرتر دەچێتە سەر زەرب و عەرووز. لە شوێنی خۆی - بەتایبەتی لە دەریاکانا - بەدرێژی باسی دەنووسین. (بڕ: نەخشەکان + زحاف + ٣ - لیستی عیللەی زیادە + ٤ - لیستی عیللەی کەمی - تێکڕای لیستەکانی تر).

**٢٠١- (المُعَلَّقَات):**

چەند چامەیەکی بەرزی سەردەمی پێش هاتنی ئیسلامە، کاتێ لە لایەن هەستیارەکانی سەردەمی خۆیاندا پەسەند دەکران، لە کەعبە هەڵدەواسران، وەک موعەللەقاتی سەبعە.

**٢٠٢- (اعنات):**

جووت سەروا: (بڕ: سەروا) + (٢٤٧ - اللزوميات).

**٢٠٣- (عُيُوبُ القافية):**

نەنگەکانی سەروا: دوو جۆری هەیە: جۆری یەکەم پەیوەندی بەپیتی ڕەوییەوەیە، جۆری دووەم پەیوەندی بەپێش ڕەوییەوە هەیە. جۆری یەکەم (کە پێشی دەگوترێ: نەنگەکانی ڕەوی): ئەم شەشەن:

١- اكفاء. ٢- اجازه. ٣- اقواء. ٤- اصراف. ٥- تضمين. ٦- ايطاء.

جۆری دووەمیش ئەم پێنجەن: ١- سناد الردف. ٢- سناد التأسيس. ٣- سناد الاشباع. ٤- سناد الحذو. ٥- سناد التوجيه (بڕوانە: ئەم زاراوانە و باسی سەروا) + (القافية).

**٢٠٤- (مثلّث العين):**

(بڕ: ١٦٦ - الإطلاق).

## نۆزدەهەم: پیتی غەین: حرف الغین

غ = ۱۰۰۰

**۲۰۵- (إغرام):**

بڕوانە: (۱۵۸ - التضمین).

**۲۰٦- (الغزل):**

ئەمە باسێکی دوورودرێژە بابمێنێ بۆ جێگەی خۆی، زۆرتر غەزەل لە چامە بەناوەرۆک جیا دەکرێتەوە، نەک بەچۆنێتی کێش و سەروا، گەرچی زۆر کەس بەسەر پێیی وای داناوە کە غەزەل و چامە یەک شت بن، یا یەکێتیی سەروا لە دێڕەکانی چامەدا مەرجە، بەلاّم لە غەزەلا مەرج نییە (بڕ: ۲۲ - البیت - ۳ - جۆرەکانی بەیت).

**۲۰۷- (غایَة العروض):**

(بڕ: علم العروض) + (وشەیێ سەبارەت بەگرنگی زانستی عەرووز).

## بیستەم: پیتی فێ: حرف الفاء

ف = ٨٠

پیتی (فاء) لە عەرەبیدا قەصر دەكرێ، وەک (رەجەز):

وَاكْسِرْ أوِ اشْمِمْ فَا ثُلاَثِيٍّ أُعِلْ
عَـيْناً وَضَمٌّ جَاكَبُوعَ فَاحْتُمِلْ

**٢٠٨- (الفتحة):**

یا نەصبە یەكێكە لە سێ بزوێنەكان (بڕ: ناچاریەكان/ ١١، ١٢).

**٢٠٩- (فَرْد):**

تاک (بڕ: ١٨ - البیت - ٣ - جۆرەكانی بەیت). (بەیتی موفرەد: دێڕی تاک: فەرد) البیت المفرد: البیت الیتیم: تەنها و تاقانە.

**٢١٠- (فرع):**

لق، لک، وەک (فروع الأفاعیل: بڕ: أصول الأفاعیل).

**٢١١- (الفرق):**

فەرق واتە: جیاوازی و جیایی شتێ لە شتێ، بۆ نموونە دەڵێین: جیاوازی پێشمەرگە لە جاش ئەوەیە: (هەردووكیان كوردن، بەڵام پێشمەرگە دۆست و دڵسۆزی كوردە و، جاش بەپێچەوانەوە دۆست و دڵسۆزی دوژمنی گەلی خۆیەتی و نۆكەری دوژمنی كوردە).

لە عەرووزدا وەک: (الفرق بین المراقبة و المعاقبة) وەک: جیاوازیی نێوانی بەحری رەجەز و كامیلی موضمەر، وەک جیاوازی نێوانی وافیر و هەزەج، جیاوازی لە نێوانی عیللە و زیحافدا... تاد.

**٢١٢- (فصل. فاصلة):**

ناوبڕ. دەگوترێ فاصلة موسیقیة = ناوبڕی مۆسیقایی

**٢١٣- (أفاعيل: تفاعيل: التفاعيل العشرة):**

(بڕ: أصول التفاعيل).

**٢١٤- (فَك):**

وەک فەککی ئیددیغام (بڕ: ناچاریەکان/ ٨٨).

فەککی بەحرەکان لە دائیرەکان، دروستکردنی بەحرێ لە بازنەیێ (بڕ: ١٦ - مبدء).

**٢١٥- (إفلات من قُيُودِ القَافيَة):**

خۆدزینەوە لە بەندی سەروا.

**٢١٦- (فنون الشعر):**

هونەرەکانی شیعر، هەر زۆر زۆرە بڕوانە (الشعر).

**٢١٧- (التفويف):**

جۆرە شیعرێکی تایبەتە، لە دەریا نوێکانا دێ.

## بیست و یەک هەم: پیتی قاف: حرف القاف

ق = ١٠٠

**٢١٨- (اقتباس):**

ئەوەتە ئایەتێ، یا ڕستەیێ لە قورئان، یا لە فەرموودەی پێغەمەر - دروودی خودای لەسەر - بخەیتە ناو وتار و قسە و هۆنراوەی خۆتەوە، بەجۆرێ کە خوێنەر یا بیسەر بزانێ کە ئەو ڕستە متوربەکراوە هی خۆت نییە. ئەمەیش دوو جۆری هەیە:

جۆری یەکەمیان دروستە و بەڵکو، گەر بەجوانی شەتڵ بکرێ، هەر زۆر پەسەندە، چونکە بۆ پیرۆزی و ڕازانەوە و پشتگیری وتارەکەی خۆتە، وەک نامی - خودا پایەداری بفەرمووێ - بۆ نموونەی ئیقتیباس لە قورئانی پیرۆز دەفەرمووێ:

گەر لوتفێ بکا یاری موقەڕەب

زوو پێ ئەزانێ بەدکاری عەقرەب

بۆ مەنعی لوتفی زوو حازر ئەبێ

(کلمح البَصَرْ أوْ هُوَ أقْرَبْ)

جۆری دووەم لەبەر ئەوەی ڕوو قایمی و بێ ئەدەبی تیادایە نادروستە وەک ئەم هۆنراوەی ئەبو نواس (رەمەل):

خُطَّ في الأرْدَافِ سَطْرٌ مِنْ بَديعِ الشِّعْرِ مَوْزُونْ

(لَنْ تَنَالُوا البِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونْ

**٢١٩- (القبض):**

لە زمانا واتای گوشین و گرتن و نووقاندن و وەرگرتنە، لە زاراوا: فڕێدانی پیتی پێنجەمی پێیە، کە دووەمی سەبەبی سووک بێ، لە جۆری زیحاف (گۆران)ی تاکە، لەم چوار دەریایەدا ڕوودەدا: لە طەویل و هەزەج و موزاریع و موتەقاریبدا، تەنیا دەچێتە سەر پێی (فعولن) و (مفاعیلن).

لە طەویل و هەزەج و موزاریعدا (مفاعیلن) بەقەبز دەبێ بە(مفاعلن). لە طەویل و موتەقاریبدا (فعولن) بەقەبز دەبێ بە(فعول ب-ب).

هەمیشە عەرووزی طەویل دەبێ مەقبووز بێ مەگەر لە کاتی تەصریعا، واتە: لە عەرووزی زەربی یەکەما دروستە لەبەر تەصریع قەبز نەکرێ. مەقبووز ئەو پێیەیە، یا ئەو دێڕەیە کە تووشی زیحافی قەبز بووە.

٢٢٠- (المتقارب):

یەکێکە لە شازدە بەحرە خەلیلییەکان.

٢٢١- (القریض):

هۆنراو: شیعر. قەرض: ڕۆنان، وەک: قرض الشعر: ڕۆنانی هۆنراو.

٢٢٢- (قسم):

وەک (أقسام القافیە: بەشەکانی سەروا، أقسام البیت... تاد).

٢٢٣- (القصید):

شیعرێ عەرەبی دەبێ بەدوو بەشەوە: قەصید و ڕەجەز. ڕەجەز هەموو شیعرێکە کە قەصید نەبێ. (بیت القصید): شا دێڕ: شا بەیت (بڕ: ١٨ - البیت - ٥).

٢٢٤- (القصیدة):

چامە، ژمارەی نابێ لە حەوت دێڕ کەمتر بێ، قەصیدە، یا چامە جۆری زۆرە وەک:

قەصیدەی لامی، چامەی لامی، قەصیدەی نوور، قەصیدەی موجەررەدە، قەصیدەی بوردییە... تاد. (بڕ: غزل) + (البیت) قەصیدەی مەقصوورە: (بڕ: مقصورة).

٢٢٥- (قصر):

کورتکردنەوە، وەک (قصر الممدود و مد المقصور) بڕوانە (ناچاریەکان/ ١، ٢ + ١ - الأبجدیة - تێبینی - ٥ + ٦ - الف/ ١٦، ١٧، تێبینی).

٢٢٦- (القصر):

لە جۆری عیللەی کەمییە، بڕوانە (نەخشەی/ ٤ عیللەی کەمی هاوبەش/ ٤) قەسر لەم پێنج کێش (بەحر)ەدا دێ: ١- ڕەمەل. ٢- موتەقارەب. ٣- مەدید. ٤- مەجزوئی خەفیف. ٥- هەزەج، وە قەسر تووشی ئەم چوار پێیە دەبێ: ١- (فاعلاتن) بەقەسر دەبێ

به (فاعلاَتْ ـــــ فاعلان = -ب-ْ) له رەمەل و مەدیددا. ٢- (مفاعیلن) بەقەسر دەبێ بە(مَفَاعیلْ ـــــ فعولاَنْ = ب --ْ) له هەزەجدا. ٣- (فَعُولُنْ) بەقەسر دەبێ بە (فَعُولْ = ب-ْ) له موتەقارەبدا. ٤- (مستفعلن) بەخەبن و قەصر له مەجزووئی خەفیفدا دەبێ (مُتَفْعِلْ = فعولن).

پێ و ضەرب و دێڕ کە تووشی قەسر بوون پێیان دەگوترێ: پێی مەقسوور، ضەربی مەقصوور، دێڕی مەقسوور، عەرووزی مەقصوور له کاتی تەصریعا.

(مقصورة): چامەیەکە کە پیتی ڕەوییەکەی ئەلفی مەقسوورە بێ، کە ئەو ئەلفەیە هەمزەی بزوێندار له دواوە نەبێ، ئەگەر بووشبێ کرتا بێ، وە ئەلفەکە بەشێ بێ له وشەکە، وەک ئەلفی (الهدی، المنی، الهوی، الاسی، جری، ابی، الخطی، یری، مضی، دعا، عفا، استوی، المصطفی، روا = مەقصوری رواء، الروا = مەقصوری رواء، الهوا = مەقسووری الهواء) وەک مەقصوورەی ئیبنو دورەید، کە پیتی ڕەوی لەم چامەیەی ئیبنو دورەیدا تەنیا ئەلفە، وە هیچ پیتێکی تری له پێش ئەلفەکەوە له ئەستۆ نەگرتووە، جا هەر چامەیێ ئاوا بێ، پیتی ڕەوییەکەی ئەلفێکی ڕیشەیی بێ و هەستیار له پێشیەوە پابەندی هیچ پیتێکی تر نەبێ له پیتەکانی ئەلفوبێ، پێی دەگوترێ مەقصورە.

## ٢٢٧- (قصم، أقصم، بەیتی ئەقصەم):

بڕوانە: (نەخشەی/ ٥/ ٨) + (غەضب) له جۆری عیللەی زیحافانەیە، تووشی وەتەد دەبێ، عیللەی لێکدراوە، بریتییە له (خەرم + عەصب) بەس له (مفاعَلَتُنْ)ی وافیردا دەبێ، بەعەصب دەبێ بە(مفاعیلن) بەخەرم دەبێ (فاعیلن ـــ مفعولن).

## ٢٢٨- (قضب):

موقتەضەب یەکێکە له دەریا خەلیلییەکان.

## ٢٢٩- (قطع):

قەطع: بڕینە، وەک زاراوەی کێشزانی بریتییە له فڕێدانی پیتی وەستاوی وەتەدی کۆی کۆتایی پێ و، وەستانی پیتی بزواوی پێشی، له جۆری گۆڕینی کەمیی هاوبەشە (عیللەی نەقصی موشتەرەک) دەچێتە سەر کێشی ڕەجەز و کامیل و موتەدارەک و موخەللەعی بەسیط و بەسیط و مەدید تووشی پێی (فعولن، فاعلن، مستفعلن، مفاعلن، متفاعلن، فاعلاتن) دەبێ، تووشی عەرووز و زەرب دەبێ، دەگوترێ: دێڕی مەقطوع، زەربی

مەقتووع، عەرووزی مەقتووع. قەطع نەگۆڕە، کە لە دێڕی یەکەما هەبوو دەبێ لە دێڕەکانی تری هەموو هۆنراوەکەدا هەبێ، ناچێتە سەر حەشو. (بڕ: نەخشەی/ ٤ عیللەی کەمیی هاوبەش).

(قطعة): پارچە، پارچە هۆنراو، ئەوەیە لە چوارینە پتر بێ و لە چامە کەمتر بێ. بڕوانە (٢٢ - البيت - ٣ - جۆرەکانی بەیت).

(تقطيع): واتە: پچڕ پچڕکردن: چمک چمک کردن: هەنجنین: دەستە دەستەکردن: چەپک کردن: پێ پێ کردن: شیکردنەوە: پێ بڕین: قەد قەدکردن. بۆ زانینی چۆنێتی تەقطیع و پارە پارەکردنی هۆنراو بڕوانە: (نووسینی عەرووزی + ٧٤ - خط العروض + باسی: بڕگە + بڕگەی کوردی).

(المقاطع العروضيه): بڕوانە: باسی بڕگە.

(حسن المقطع): (بڕ: ١٦٥ - مطلع).

### ٢٣٠- (قطف):

قەتف لە زمانی عەرەبیدا بەواتا ڕنینی بەری ڕەز و باخە، وەک لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەفەرمووێ: (قُطُوفُهَا دَانِيةٌ). عیللەی کەمیی هاوبەشە، تێکەڵە لە کۆی زیحافێکی تاک و عیللەیەکی سادە، چونکە یەکسانە بەعەصب (گۆڕانی تاک) و حەذف (گۆڕینی سادە). عیللەی موشتەرەکە یا هاوبەش واتە: دەچێتە سەر سەبەب و وەتەدیش. قەتف تایبەتە بەوافیرەوە، بەڵکو هەر دەچێتە سەر عەرووز و زەربی یەکەمی وافیر، نە لە حەشو (ناواخن)ی دێڕاو نە لە زەربی دووەم و سێیەمی وافیردا ڕوونادات (مفاعلتن) بەعەصب دەبێ بە(مفاعيلن) ئەوجا بەحەزف دەبێ بە(مفاعی = فعولن).

دەگوترێ: دێڕی مەقتووف، عەرووزی مەقتووف، زەربی مەقتووف، پێی مەقتووف. قەتف: نەگۆڕە، واتە: لە هۆنراوێکا یەکێتیی سەروای تیادا ڕەچاو بکرێ، دەبێ هەموو دێڕەکانی قەتفکراو بن.

### ٢٣٢- (الأَقْعَادُ: الإِقْعَاءُ):

ئیقعاد یەکێکە لە نەنگەکانی هۆنراو، تایبەت نییە بەیەک بەحرەوە، بریتییە لە تێکەڵ و پێکەڵکردنی عەرووز و زەربێ کە هی یەکتری نەبن، وەک عەرووزی ئەم بەیتە کە لە تەویلە، بیسەر وا هەست دەکا کە ئەم دێڕە تەصریع کراوی سێیەمی تەویلە، بەڵام کاتێ

نیوەی دووەمی دێڕەکە دەخوێنیتەوە دەردەکەوێ زەربەکەی مەحذووف نییە، هەتا دێڕەکە ببێ بەسەردێڕی تەسریع کراوی تەویل، بەڵکو (مفاعلن)ە. کەواتە: نیوەی یەکەمی ئەم دێڕە تەسریع کراوی سێیەمی تەویلە و نیوەی دووەمی لە زەربی دووەمی تەویلە: (تەویل - عەرووزی موصەررەعی سێیەمی تەویل و زەربی دووەمی تەویل):

جَزَى اللهُ عَبْساً عَبْسَ آلِ بَغِيضٍ

جَزَاءَ الكِلاَبِ العَاوِيَاتِ وَقَدْ فَعَلْ

وەک (خەفیف):

دُمْيَةٌ عِنْدَ رَاهِبٍ قَسِّيسٍ

صَوَّرُوهَا فِي جَانِبِ المِحْرَابِ

لەم دێڕەیشدا (فاعلاتن)ی عەرووز، تەشعیث کراوە، بووە بە(فالاتن: مفعولن) ئەمەیش هەر لە تەسریعی خەفیفدا جوانە و بەس. لەم شوێنەیشدا بۆ تەسریع نییە، چونکە ئەم شیعرە سەردێڕ (مەتلەع)ی چامەکە نییە، تەصریعیش یا لە سەردێڕدا دەبێ، یا لە کاتی گۆڕینی بابەت لە چامەدا ڕوودەدات.

یا وەک: (کامیل: عەرووز موصەرەعی هەشتەمی کامیل، زەرب یەکەمی کامیل):

وَمُصَابِ غَادِيَةٍ كَأَنَّ تِجَاراً

نَشَرَتْ عَلَيْهِ بِزَّهَا وَرِحَالَهَا

کورت و پوخت ئیقعاد - یا ئیقعاء - ئەوەیە: کە عەرووز و زەرب موافق نەبن و بەپێی جێگە و شوێن هی یەکتر نەبن. وەک (تەویلی سێیەمی موصەررەع لە غەیری سەردێڕدا):

لَعَمْرِي لَقَدْ بَرَّ الضِّبَابَ بَنُوهُ     وَبَعْضُ البَنِينَ حُمَّةٌ وَسُعَالُ

(المُقْعَدُ): ئەو دێڕە هۆنراوەیە، کە نەنگی ئیقعادی وا تیادا.

(قاعدة): یاسا، ڕێسا: دەستوور، وەک: قاعیدەی قەلبی هەمزە بەئەلف، یا بەیێ، یا بەواو.

۲۳۳- (قفل):

أقفال و خرجات و أسماط وأغصان، ئەم جۆرە زاراوانە و دەور و سەمط و مووەشەح لە دەریا نوێکاندا خوا یار بێ بەدرێژی دێ.

وَأَعْمَارُنَا أَبْيَاتُ شِعْرٍ كَأَنَّمَا
أَوَاخِرُهَا لِلْمُنْشِدِينَ قَوَافِي
«المعرّي»

واته:

ئەمەمان وێنەی چامەی هۆنراوە
نەیژەن بەسەروا دوایی هێناوە
نوری فارس

یا ئاوا:

ئەمەن دێڕ دێڕە: چامە ئاسایە
دوایی بۆ نەیژەن دەڵێی سەروایە
نوری فارس

یا ئاوا:

ئەمەمان دەڵێی چامەی هۆنراوە
نەیژەن بەسەروا دوایی هێناوە
نوری فارس

## بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ

**٢٣٤- (قافية: سەروا):**

وشەی (قافیە) لە زمانی عەرەبا، واتە: لە شوێن یەکتر هاتن و شوێن هەڵگرتن، قافیەی هۆنراویش بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە دێڕەکان بەرێز وەک قەتار، بەدوای یەکتردا قەتارە دەبەستن. لە زاراوی سەرواناسیدا بەکوردی پێی دەگوترێ سەروا.

سەروا بابەتێکی زۆر فرەوان و فرە لقە، بەپشتی خودا بەپێی توانا باسی دەکەین، بەڵام لە سنووری تەعلیمی و فێرکاری دەرناچین، مەبەستی سەرەکی من لەم پەڕاوە، لە پلەی یەکەما، خزمەتی ئەدەب و وێژەی کوردییە، ئەویش بەئاسانکردنی ئەم زانستە سەختە، سا بەشکو، بەیاریدەی خودای بەخشندە و میهرەبان، هەستیارە بلیمەتە نوێ کوردەکان ئەوانیش وەک مەحوی و نالی و پیرەمێرد و حەریق و حاجی کۆیی و قانیع و سەلام و هەژار و جگەرخوێن و جەزیری و بابا تاهیری هەمەدانی و خانی، بتوانن هۆنراوی عەرووزی ئەمر و بەرهەمی شاکاری نایاب بهۆننەوە، کە هەتا هەتایە بەرهەمی ئەم زاتانە وەک ئەستێرەی گەش بەئاسمانی وێژەی کوردییەوە دەدرەوشێتەوە، وە هەتا ئێستاش بەرهەمی ئەمری ئەم کەڵە شاعیرانە وا لە چڵەپۆپەدا، وە هەستیارە نوێخوازەکان لە خواریانەوەن بەچەند پلەیێ، جارێ لە پێش پێناسەیەکی کورتی ساکار، کە لێ تێگەیشتنی بۆ هەموو کەسێ ئاسان بێ، بۆ سەروا دەکەین، دەڵێین:

(سەروا ئەو پیتەیە، یا ئەو کۆمەڵە پیت و بزوێنانەیە، کە لە کۆتایی نیوە دێڕی یەکەم و نیوە دێڕی دووەما، لە هۆنراوی جووت سەروا و چوارینە و ئەمانەدا، یا لە کۆتایی دێڕەکانی هۆنراوی وەک پارچە و چامە و ئەمانەدا، ئەگۆڕن و دووبارە دەبنەوە).

وەک پیتی سین لەم چوارینەدا (دە برگەیی-١-):

هەرسێ ئەقنوومی ئالۆتی ئەقدەس
لە لای من مەیە و، یارێکی نەورەس
جووتە مەمانی پڕ بەهەردوو دەس
هەرخۆم و خۆی بین، دوور لە هەموو کەس(*)

---

(*) لە حەبانییە بووم، کابرایێ بەم جۆرە تەعبیرانە بێزاری کردبووم: (اقانيم ثلاثة) (الله والابن وروح القدس). منیش بەم چوارینەیە وەڵامم دایەوە، ئیتر لە کۆڵم بۆوە (نوری فارس).

ئەوەتا لەم چوارینەدا پیتی سێن - کە پیتی ڕەوییە - لە کۆتایی هەموو نیوە دێڕەکانەوە، کە چوار نیوە دێڕن، دووبارە بۆتەوە و بەس، گەرچی فەتحەی پێشیشی ڕەچاو کراوە. لە ڕاستیدا هەستیار مەرج نییە بۆ ئەوەی بەرهەمی نایاب بەدەست بێنێ، شارەزاییِ تەواوی لە هەموو دەریا عەرووزی و دەریا کێشییەکانی تردا هەبێ، هەروەک مەرج نییە کە لە زانستی سەروادا، وەک ماسی مەلە بکا، بۆ بەڵگەی ڕاستی و دروستیی ئەم گوتەیە دەڵێین: (کە زۆرینەی هۆنراوە کوردییەکانی مەولەوی - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - کە لەوپەڕی جوانی و ناسکی و نازداری و کێش سافی و ڕەوانی دان، لە سنووری کێش و سەروای ئەم چوارینەیە دەرناچن! چونکە زۆرینەیان دە بڕگەیین و جووت سەروان.

کەواتە هەستیارانی تریش، بەپێی توانای خۆیان، سەربەستیی کاریان هەیە، کە مەولەوی لەم لایەنەوە، بکەن بەسەرمەشق بۆ خۆیان، یا هەستیارێ تر لە بابەتێکی تری هۆنراودا، وە ئەمەیش ڕزگاریان دەکا لە خەریکبوونێکی زۆر لەگەڵ زانستی کێش و سەروادا، وە کاتێکی زۆریان بۆ دەگەڕێتەوە.

یان وەک ئەم کۆمەڵە پیت و بزوێنانەی کە وان لە کۆتایی نیوە دێڕەکانی ئەم چوارینەی ترەوە، کە لەسەر یەک تەرز دووبارە بوونەتەوە، (دە بڕگەیی-٢-):

خۆزگەم پێنج هەستەم، پێنج هەزار دەبوو

مووم هەموو چاو و، دڵ هۆشیار دەبوو

تەمەنم بەساڵ، سەد ملیار دەبوو

گشت بۆ تەماشای چاوی یار دەبوو!

ئەوەتا لەم چوارینەی تردا، کۆمەڵێ پیت و بزوێن، کە لە کێشا (فاعلن) پێکدەهێنن، دووبارە بوونەتەوە، لە پیتی مەددی پێش ڕێکەوە، کە ئەلفە، لەگەڵ بزوێنەکەی پێشی کە سەرە، هەتا دوا پیتی هەموو نیوە دێڕەکان کە (وو)ە، گشتیان نەگۆڕن و لە گشت لەتەکاندا دووبارە بوونەتەوە ئاوا: (...ار دەبوو).

جا ئەم دەنگانە هەیانە ڕەوییە، هەیانە پێش ڕەوییە، هەیانە پاش ڕەوییە، هەیانە شتی ترە، هەیانە پیتە، هەیانە بزوێنە، با ئەم وردەکاری و وەستاکارییە بمێنێ بۆ کاتی شیکردنەوەی سەروا، بەڵام بێ گومان ئەمە پاڵفتەی ئەم بابەتە بوو.

---

(١، ٢) تەرجەمەی (البؤساء)ی فیکتۆر هیگۆ. بەپێنووسی نوری فارس حەمەخان.

سەروا بابەتێکی فرە لقە، زانستێکی سەربەخۆیە، لەگەڵ کێشدا، بۆ هۆنراو، وەکو نەحو و صەرف وان بۆ زمان، کێش و سەروا بۆ هۆنراو تەواوکەری یەکترین، بەبێ یەکتری نایانکرێ و ناتەواو دەبن، چونکە هۆنراو نابێ بەهۆنراو هەتا کێش و سەروای نەبێ، کەواتە: هۆنراو بریتییە لە واتای جوان و کێشی ڕەوان و سەروای شایان. (بڕ: وشەیێ سەبارەت بەگرنگی عەرووز).

لە هەندێ هۆنراودا - وەک تاک و چوارینە و سێینە - سەروای لەتی یەکەم تەحەککوم دەکا لە چۆنێتی سەروای لەتی دووەم، بەتایبەتی لە هۆنراوی مەسنەویدا، بەڵام لە چامە و هۆنراوی مولتەزەمدا، کێش و سەروای یەکەم دێڕ، تەحەککوم دەکەن لە هەموو سەرواکانی تری دێڕەکانی تریاندا، ئەمەیش بەپێی یاسایەکی تایبەت کە عەرووز و زەرب، ڕۆڵی سەرەکییان هەیە لەو یاسایەدا، لەگەڵ تایبەتمەندی هۆنراوەکە، وەک چوارینە و پارچە و پێنجینە.

کێش و سەروا، لە دێڕی یەکەما، بەدەست هەستیار خۆیەتی، بەئارەزووی خۆی زەربێ لە بەحرێ، لەسەر سەروایەکی تایبەت بەو زەربەوە هەڵدەبژێرێ، بەڵام لە دێڕەکانی تری دوایەوە، هەستیار دەبێ پابەند بێ بەکێشی بەحرەکە و بەچۆنێتی زەربەکەی و بەچۆنێتی سەروا بەپێی شوێن و زەربەکەی. وە هەر سەرپێچییەک لەم دەستوورانە، کێشەیێ دروست دەکا. (بڕوانە: مرسل) بۆ نموونە، نالی - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - دەفەرمووێ (هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەحذووف):

ئەی جیلوەدەری حوسن و جلـەوکێشی تەماشا
سەر ڕشتەیی دین، بێ مەدەدی تۆ نییە، حاشا

ئەم چامەیە حەوت دێڕە، سەروا - کە (ماشا) و (حاشا)یە - لە دێڕی یەکەما، دارشتنی سەروا بەدەست نالی خۆی بووە، نالی بۆی هەبووە کە (دارا) و (سارا) بکا بەسەروای یەکەم دێڕی چامەکەی، یا هەر وشەیەکی تری هەڵبژاردایە بۆ سەروا دەبوو، بەڵام پاش ئەوەی کە نالی لە سەردێڕی چامەکەیدا، هەزەجی هەڵبژارد و بەتەصریع (ماشا) و (حاشا)ی کرد بەسەروا، ئیتر بۆی نییە کە لە دێڕەکانی دوایەوە هەتا کۆتایی، پەیڕەوی ئەم کێشە و ئەم سەروایە نەکا. بۆیە سەراپای دێڕەکانی تری چامەکە لە هەمان کێشن، کە بەحری هەزەجە، وە سەرواکانیشیان بەڕیز ئەم وشە هاوسەروایانەن: (بەخشا، شەهەنشا، معاشا، ڕشاشا، ماشا، ئینشا). ڕای هەرە دروست ئەوەیە کە ڕەوی لەم چامەیەدا شینە و ئەلف وەصڵە. سەروا هەروەک لە چامە و غەزەل و پارچە و چوارینە و پێنجینە و ئەمانەدا

ڕەچاو دەکرێ، لە تاکە دێڕیشدا، وا جوانە کە لە نێوانی سەدر و عەجزدا ڕەچاو بکرێ وەک شیعری موزدەوەج: وەک:

جــەهەننەم لە چاو نوگــرە ســـەلمانا
خـۆشـتـرین جـێـیـە لە کـوردسـتـانا

پێناسـەی سـەروا. سـەروا بەپێی زمـان و بەپێی بابەتەکـانی شـیـعـر و بەپێی خـودی وشەکانی سەروا، جۆر و بابەتی جیاجیـای زۆری هەیە. بگرە لە هەموو زمـانێکا - کـە زمانی شیرینی کوردی یەکێکیانە - سەروا و سەرواناسی زانستێکی سەربەخۆیە، بەدەیان پەڕاوی تایبەتی تیادا دانراوە.

**سیستەمی سەروای عەرەبی:**

جا لەبەر ئەوەی کە سیستەمی سەروای هۆنراوی عەرەبی سەرچاوە و سەرمەشق و بناوانە بۆ گشت هۆنراوی عەرووزی گەلە موسوڵمانەکان، جارێ وا لە پێش پێشەوە، پاڵفتەی سیستەمی ڕێساکانی سەروای تەقلیدی (عەرەبی - ئیسلامی) دەنووسین، کە زۆربەی هۆنراوی ڕەسەنی زمانی کوردی، بەتایبەتی بەشی عەرووزی، هەتا ئێستایش لەم ڕێبازە دەرنەچوون مەگەر بەدەگمەن، وە بەپێی توانا ڕاهێنانی شیاو لەسەر هۆنراوی کوردی دەکەین.

**چەند نموونەیێ لە پێناسەکانی پێشینانی سەرواناسی:**

١- (سەروا دواترین دوو پیتی وێستاوی کۆتایی دێڕە، لەگەڵ ئەو پیتە بزاوانەی کە وان لە نێوانیانا، ئەگەر نێوانیان هەبوو، لەگەڵ پیتی بزواوی پێش یەکەم وەستاویان).

٢- (سەروا بریتییە لە نێوانی دوو پیتی وەستاوی کۆتایی دێڕ، لەگەڵ ئەو پیتە وەستاوەیان کەوا لە دوا دوای دێڕەوە).

٣- (سەروا بریتییە لە دوا وشەی دێڕ و بەس).

٤- (سەروا بریتییە لەو دەنگ و پیت و بزوێنانەی کە پێویستە لەسەر هەستیار، لە جێگەی پێویستا، لە دێڕدا دووبارەیان بکاتەوە!).

(تێبینی): آ- دوا پیتی دێڕ هەمیشە لە شیعری عەرووزیدا، بەهەر زمانێ بێ، یا لە ڕاستیدا پیتی وەستاوە، وەک سەرجەمی هۆنراوی داخراو (شیعری موقەییەد) وەک ماموستای نامی دەفەرمووێ (ڕەجەزی موقەییەد):

قوربانی تۆم ئەی سەروەری زیندوو دڵم!

گیانم فیدات، ئەی دڵبەری غونچە گوڵم!

یا بەدیمەن پیتێکی بزوێنداره، بەڵام بەحەقی بزوێنەکەی تێر دەکرێ، هەتا پیتێکی مەدد لە چەشنی بزوێنەکەی لێ پەیدا دەبێ، وەک زۆرینەی شیعری موطڵەق، بەتایبەتی بەشی بێ سیلەی، وەک وشەی (مَوْعِدِ) کەوا ئێستا روونی دەکەینەوە، یا وەک (بردهِ) و (سَرْدهِ) کە لە (٢٢ - البيت - هێڵکاری دێڕێکا...) ڕابورد.

ب- لە کوردیدا بۆ ئەم دوو پیتە وەستاوانەی کە سنووری سەرەتا و کۆتای سەروا دەستنیشان دەکەن، دەبێ حسێبی سەبەبی سووکی کوردیان بۆ بکرێ، وەک (ئامۆزگار - بڕ: ١٢٩ - سمط - شیعرەکەی وەفایی).

ج- مەرج نییە کە سەروا لە هەموو دێڕێکا یەک شت بێ، بۆ ئەوەی کە سنووری سەروا بەتەواوی ڕوون ببێتەوە دەڵێین:

١- لەسەر پێناسەی یەکەم -کە ڕای خەلیل خۆیەتی، کە لەبارترین پێناسەیە بۆ سەروا- وا دەبێ سەروا یەک وشە دەبێ، وەک (مَوْعِدِ)ی لەم دێڕەدا (دووەمی تەویل):

تَزَوَّدْ إلى يَوْمِ المَمَاتِ فَإنَّهُ

-وَلَوْ كَرِهَتْهُ النفسُ- آخِرُ مَوْعِدِ

وەستاوی دووەم پێی کۆتایی (مَوْعِدِ)یە، کە لە تێرکردنی بزوێنی پیتی دالی ژێرداری پیتی ڕەوی پەیدا بووە، پیتی وەستاوی یەکەمیش واوی وەستاوی مەوعیدییە، ئەوەی وا لە نێوانی ئەم دوو وەستاوەدا عەین و دالەکە و بزوێنەکانیانە، پیتی بزواوی پێش یەکەم پیتی وەستاویش میمی سەرداری (موعد)ییە. لە کوردیشا سەروای یەک وشەیی وەک ئەدەب دەڵێ (موتاقارەب):

بەباڵا بڵند و بەقەد شووش و باریک

جەمالی ڕووناکە شەوی هەوری تاریک

سەروا لەم هۆنراوەدا بەپێی پێناسەی یەکەم (باریک) و (تاریک)ە، کە بریتین لەسەرو دوو بڕگەی درێژ = (با + ریک) و (تا + ریک).

٢- جاری وایش دەبێ سەروا پارچەیێ لە وشەیێ دەبێ، وەک (شارەت) لە کۆتایی ئەم هۆنراوەی نالیدا (هەزەجی هەشتی ئەخرەب):

چاوت له برۆ یەعنی له ژێر طاقی نەظارەت

بێ پەردە عەیان دێتە تەکەللوم بەئیشارەت

٣- جاری وایش دەبێ زیاتر له وشەیێ دەبێ، وەک وشە و لەتێ، لەم هۆنراوەی صەفوەتا (بەسیت):

یا بایە بوو هاتبوو له لای مەدینەی رەسوول

یا بەرقی ڕوون بوو له تاریکی لەشا (خی ئیزەم)

٤- وەک دوو وشە لەم دێڕەدا (رەجەز):

لِكُلِّ مَا يُؤْذِي - وَإِنْ قَلَّ - أَلَمْ

مَا أَطْوَلَ اللَّيْلَ عَلَى مَنْ (لَمْ يَنَمْ)

له کوردیشا وەک (نافرێ) لەم چامەی بێ کەسا - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - (رەمەل):

نێرو مێ هەردوو بەجووتە بۆ وەتەن هەوڵێ نەدەن

دوورە دەرچوونی له دیلی، مەل بەباڵێ (نافرێ!)

٥- وەک سێ وشەی نەحوی لەم شیعرەی ئەحمەد شەوقیدا کە له دووەمی تەویلە:

مُصَابُ بَنِي الدُّنْيَا عَظِيمٌ (بِأَدْهَمِ)

وَأَعْظَمُ مِنْهُ حِيرَةُ الشِّعْرِ (فِي فَمِي)

له کوردیدا وەک (بوو بەسەم) لەم چامەیەی مەحویدا - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - (موتەقارەب):

له جێ مانەوە ترش و تاڵت دەکا

ترێ بوو بەسرکە، عەسەل (بوو بەسەم)

لەسەر پێناسەی دووەمیش له شیعری یەکەما (عِدِی) له (موعِدی)دا سەروایە، له کوردییەکەیدا (ریک) و له (تاریک)دا، له شیعری دووەما (رەت) له (ئیشارەت)دا، له سێیەما (إزەم) له چوارەما (يَنَمْ) له پێنجەما (فَمِي) له کوردییەکەیدا (بەسەم).

لەسەر پێناسەی سێیەم (موعد) و (تاریک) و (ئیشارەت) و (ئیزەم) و (ینم) و (فرێ) و (فمی) و (سەم) سەروان.

لەسەر پێناسەی چوارەمیش - کە پێناسەیەکی بەهێزە - قاڵبی بەحر و جۆری شیعرەکە

تەحەککوم دەکا لە چۆنێتی و چەندێتیی سەرواکەی، بەتایبەتی ضەرب و جۆری قەصید و رەجەز و هیجا.

جا بینا لەسەر ئەم ڕوونکردنەوەیە بەپێی ژمارەی ئەو پیتە بزوێندارانە کە دەکەونە نێوانی ئەو دوو پیتە وەستاوانەی کە دەبن بەدوو سنوورەکەی سەروا، سەروا دەبێ بەپێنج جۆرەوە:

١- موتەرادیف. ٢- موتەدارەک. ٣- موتەواتەر. ٤- موتەراکیب. ٥- موتەکاوس.

با پێناسە و شیکردنەوەیان بێنێن بۆ سەر باسی (جۆرەکانی سەروا: أنواع القافیة). وەک دەرکەوت سەروا دەنگێکە، یا کۆمەڵێ دەنگە، وان لە جێگەیەکی دیاری دێرا، لە چەشنی ناوبڕ -فاصلە-ی مۆسیقایی، گوێگر لە چەند کاتێکی دیاریکراوی ڕێکوپێکا، چاوەڕوانی دووبارەبوونەوەیان دەکا، بەلایەنی کەمەوە هەر هیچ نەبێ، دەبێ گشت جارێ لە جێگەی دیاریکراوا پیتی ڕەوی -کە یەکێکە لە پیتەکانی سەروا- لەسەر شێوەی پێشووی، یا شێوەی ڕەچاوکراوی، دووبارە بێتەوە!

ئەوەی کە پێویست بێ بۆ هەستیار کە لەم هونەرەدا بیزانێ ئەم پێنج بابەتەیە:

١- پیتەکانی سەروا (حروف القافیة).

٢- بزوێنەکانی سەروا (حرکات القافیة).

٣- جۆرەکانی سەروا (أنواع القافیة).

٤- سنوورەکانی سەروا (حدود القافیة).

٥- نەنگەکانی سەروا (عُیُوبُ القافیة).

ئەم پێنج بابەتە ناودارن بەپێویستییەکانی سەروا. دەبێ هەستیار بەچاکی بیانزانێ، هەتا لە کاتی داڕشتنی سەروادا تووشی هەڵە نەبێ و شیعرەکەی لەنگ و نەنگدار نەبێ.

**١- پیتەکانی سەروا:**

پیتەکانی سەروا شەش پیتن، بەڵام مەرج نییە کە هەموو سەروایێ هەر شەشیانی تیا بێ، بەڵکو هەندێکیان لەگەڵ هەندێکیان کۆ نابنەوە، وەک تەئسیس و ریدف، شیعری وایش هەیە هەریەک پیتیانی وا تیا، کە ڕەوییە: ئەو شەش پیتە ئەمە ناوەکانیانە:

١- ڕەوی. ٢- وەصڵ. ٣- خَروُج. ٤- ریدف. ٥- تەئسیس. ٦- دەخیل.

جا هەر کام لەم پیتانە بەپێی یاسایەکی تایبەتی، هەر کاتێ لە سەروای یەکەم دێڕدا بوون، ئیتر دەبێ لە هەموو دێڕەکانی دوایەوە دووبارە ببنەوە و، پەیڕەوی بکرێن.

**یەکەم: پیتی ڕەوی (لە هۆنراوی عەرەبیدا، کە سەرچاوەیە بۆ هۆنراوی کوردی):**

چەند تایبەتمەندییەکی ڕەوی:

آ- شیعر یا مقیده، یا موطلّەقە، ڕەوی دوا پیتی دێڕە لە هۆنراوی داخراودا (لە شیعری موقەییەدا) و هەمیشە ڕەوی لە هۆنراوی داخراودا وەستاو دەبێ و پیتی تری لە دواوە نابێ، مەگەر بەدەگمەن، وەک تەنوینی غالی بچێتە سەر کۆتایی سەروا، وەک (ڕەجەز):

وَقَاتِمُ الأعـماقِ خاوي المختَرَقْنْ

مُشْـتَـبَـهُ الأعْـلاَمِ لَمّاعُ الخَـفَـقْنْ

بەوەستانی قاف و نوونەکەی (المخترقْنْ) و (الخفقْنْ) (بڕ: ٢٢ - البيت/ ١٠ - بەیتی موصەمەت). هەروا وەک کاتی ریدف لە شیعری موقەییەددا و کاتی تەذییل و تەسبیغ (بڕ: تذييل و تسبيغ) لە کوردیدا بڕگەی درێژی ئاخری سەروا دەیکا بەمقید.

لە شیعری موتلّەقیشا ڕەوی پیتی بزواوی پێش پیتی وەصلە.

ب- ڕەوی ئەو پیتەیە کە ئیعراب دەچێتە سەری، لە جۆری سەروای موقەییەددا (سەروای داخراودا) جۆری ئیعرابەکەی دەرناکەوێ، لەبەر ئەوە جیاوازیی ئیعراب لە هۆنراوی داخراودا دانانرێ بەنەنگ، بەڵام شتی وا لە هۆنراوی کراوەدا ئیقوایە. وەک (خەفیف):

آذَنَتْنَا بِبَيْنِهَا أَسْمَاءُ رُبَّ ثَاوٍ يُمَلُّ مِنْهُ الثَّوَاءُ

لە پاشا دەڵێ:

مَلِكَ الحَارِثُ بنُ مَاءِ السَّمَاءِ

(بڕ: ناچاریەکان/ ٩٩).

ج- ڕەوی ئەو پیتەیە کە لە هەموو دێڕەکاندا دووبارە دەبێتەوە، وە ئەو پیتەیە کە چامەکەی لەسەر بنیات دەکرێ و هۆنراوەکە بەناوی ئەوەوە ناودەبرێ، دەگوترێ: چامەی دالی، چامەی لامی، چامەی میمی، کاتێ پیتی ڕەوییەکەی لە یەکەما دال بێ، لە دووەما لام بێ، لە سێیەما میم بێ... هەروا.

بەوێنە بێی (عـەقرەب) و (مـورەتتـەب) لەم هۆنراوەی نالیـدا ڕەوییـە کـە دەفـەرمـووێ (هەزەجی هەشتی ئەخرەبی سەروای داخراو):

زولفـەینی بەخـەم مـار و، بەحـەلقـەن وەکـو عـەقـرەبْ

شـیـعـری لەف و نەشـرن، چ مـشـوّش، چ مـورەتتـەبْ

لەم وشـانەیشـدا نوون ڕەوییـە و سـەرواکـانیش لە چامـەکـەدا مـوتلـّەقـەی مەوصـوولەن: (وەطەنە) و (حەسەنە) و (عـەلەنە) و (خەنە) و (نارەوەنە) و (بیت الحزنە) و (دەوەنە) کە ئەمە سەردێڕەکەیانە (نالی/ ڕەمەل):

دڵ سیاسـەنگ نەبێ، مائیلی خـاکی وەطەنە

خالّی لەعلی حەبەشە، ساکینی بوردی یەمەنە

د- وەک گـوتمان پیـتـە پێـویسـتـەکـانی سـەروا شـەشن، ڕەوی لەناویانا لەوانی تر گـەلێ دامـەزراوترە، وە نەگـۆڕترە، چونکە هۆنـراوی بێ وەصـڵ و بێ خـروج و بێ ریدف و بێ تەئسیس و بێ دەخیل هەیە، بەڵام هۆنراوی بێ ڕەوی نییە، وەک (ڕەمەل):

إنَّ تَقْوی رَبِّنَا خَیْرُ نَفَلْ    وَبِأذْنِ اللهِ رَیْثُ وَعَجَلْ

ئەوەتا پیتی ڕەوی لەم سەروا داخراوەدا کە لامە وەسـتاوەکەیە، نە وەصڵ، نە ریدف، نە خروج، نە تەئسیسی، نە دەخیلی نییە.

هـ- سـەروای داخراو - واتە: سەروای مـوقـەییەد - بۆیە وای پێ دەگـوترێ چونکە بەزەنە (سـکون) کۆتکراوە و مەودای درێژبوونەوەی نەماوە، لەبەر ئەوەی کێش تەواو بووە، بەپێی زەربی بەحرەکـە پیت و بزوێنی تر هەڵنـاگرێ، وەک (مـەحوی - هەزەجی هەشـتی داخراوی ریدفدار):

کە شێـخۆ واعـیظ و صۆفی بەجەننەت بەن گەد و گیپاڵ

دەبێ ئەمـشـالی ئێـمـە بۆ جـەهەننەم بەن سـر و سـیـپاڵ

و- پیـتی ڕەوی ئەگـەر بزواو بوو، دەبێ لە سـەرواکـانی دوایەوە، پەیڕەوی خۆی و جۆری بزوێنەکەی بکرێ، چ سەر بێ، چ ژێر بێ، چ بۆر بێ، بەم جۆرە سەروایە دەگوترێ: سەروای رەها: سـەروای مـوتلـّەق. چونکە پیـتی ڕەوی کـراوەیە، کـێش تەواو نەبووە، لەبەر ئەوە بەقەد ژمارەی پیتە کەمەکانی کێشـی قاڵبەکە، لە دوا پیـتی ڕەوییەوە، پیتی تری شیاو و لەبار زیاد دەکرێ. وەک (نالی - تەویل):

تَرَى عَـيْنَةَ اْلابْدَانِ مِنْ (خـاكِ و خـوّلِ)ـه
تَرَى مَنْدَلَ اْلاوْرَاقِ مِنْ (تُـوز وگـــرْد)ــه

ئەم چامەیە لە دەریای درێژە، عەرووزەکەی مەقبووزە، لەگەڵ ضەربی مەقبووزدا، پیتی دال کە ڕەوییە بزواوە، بزوێنەکەی ژێرە، ضەربی ئەم کێشە (مفاعلن)ە، بەڵام هەتا دالەکە، لە گشت دێڕەکانی چامەکەدا دەکاتە (مفاعی) لەبەر ئەوە لە پاش پیتی ڕەوییەوە مەودای زیادکردنی دوو پیتی تر هەیە، کە لێرەدا هێی وەسڵ و یێی خەروجە، لەم چامەیەی نالیدا پەیڕەوی دالەکە و ژێرەکەی و هێی وەسڵی دوا دالەکە و یێی خەرووجی دوا هێکە لە هەموو دێڕەکانیدا کراوە، لەسەر ئەم شێوەیە بەڕێز:

(بَرْدِه، سَرْدِه، فَرْدِه، گَرْدِه، بَرْدِه، دارِ زَرْدِه، عَرْدِه، هَرْدِه، لِوَرْدِه، بِدَرْدِه) ـــ (بَرْدِهی، سردهی، فردهی،... تاد).

ئەم چامەیەی نالییە دالییە، بەڵام بۆ ئاسانکاری چاوپۆشی لەم لایەنە کراوە، لەبەر ئەوە لە پیتی هێدا، بەپێی دەنگی کۆتایی کە هێیە پۆلێن کراوە، گەرچی خۆی هەقی وابوو لە پیتی دالا بەپێی پیتی ڕەوی پۆلێن بکرێ، هەتا لە پیتی کۆتاییشدا - کە بڵێین هێیە - چاوپۆشی کراوە، چونکە لە ڕاستیدا یێیە نەک هێ ئاوا (گردهی).

ز- پیتی ڕەوی لە هۆنراوی رەها (موتلەق = کراوە)دا، ئەگەر دوا پیتی بزواوی دێڕ بوو، بزوێنەکەی تێر دەکرێ، هەتا پیتێ لە چەشنی بزوێنەکەی خۆیی لێ پەیدا دەبێ، جا ئەگەر ڕەوی سەری هەبوو، ئیشباع دەکرێ تا دەبێ بەئەلف، وەک لامی سەرداری (المحالَ)ە، لەم هۆنراوەدا، کە سەری هەیە، چونکە (ال)ی تەعریفی لەسەرە، تەنوین ناچێتە سەری، کەواتە ئەو ئەلفەی کە لە پاش لامی ڕەوییەوە، لە تێرکردنی سەری لامەکە پەیدا بووە، نەک لە قەلبی تەنوین بەئەلف، وە ئەم ئەلفە - کە پیتی وەسڵە - لەگەڵ پیتی ڕەویدا کە دالە، لە هەموو دێڕەکانی تری هۆنراوەکەدا ڕەچاو کراوە. وەک (وافر):

وَشِـعْـرٍ قَـدْ أرِقْتُ لَهُ غَـرِيبٍ
أُجَنِّبُـهُ المُسَـانِدَ وَالمُحَـالاَ

وە ئەگەر ڕەوی ژێری بوو، ژێرەکەی تێر دەکرێ تا دەبێ بەیێ، وەک (مَوْعِدِ = مَوْعِدِي) کە لە پێناسەی سەرروادا ڕابورد.

وە ئەگەر بۆری بوو، تێر دەکرێ تا واوێکی لێ پەیدا دەبێ، وەک (تەویل):

لِمَا تُؤْذِنُ الـدُّنْيَا بِـهِ مِنْ صُرُوفِـهَـا

يَكُونُ بُكَاءُ الطِّفْلِ سَاعَةَ يُولَدُ(*)

چونکە ئەلف لە چەشنی سەرە و یێ لە چەشنی ژێرە و واو لە چەشنی بۆرە.

لە شیعری عەرەبیدا، لە ڕێنووسی ئاساییدا، هەروا لە ڕێنووسی کێشیدا ئەم جۆرە ئەلفە لە خەتا دەنووسرێ، بەڵام واوی ئیشباع و یێی ئیشباع لە ڕێنووسی ئاساییدا نانووسرێن، مەگەر ئەصڵی بن، یا ڕاناو بن، بەهۆی ئیشباعەوە پەیدا نەبووبن، وەک: (العَصَا، يَدْعُو، يَرْمِي، فَعَلُوا، افْعَلِي، الهُدَى). بەڵام لە کوردیدا هەموو بۆرێ بەواو دەنووسرێ، هەموو ژێری بەیێ دەنووسرێ، هەموو سەرێ بەبزوێنی کورت (ە) دەنووسرێ، وەک: (بوو، چوو، ژیر، بیر، مانە، دانە، خانە، زیزانە). بڕوانە قەصیدەی بەحری نووری مەحوی و پیتی هێ لە دیوانە کوردییەکاندا، بەتایبەتی دیوانی نالی و مەحوی و وەفایی.

زۆر کەم بەدەگمەن وا دەبێ کە سەر لە کوردیدا بۆ هاوسەروایی دەکرێ بەئەلف و بەئەلفیش دەنووسرێ، وەک:

(کَانَ تَوَّابا. مریشکەڕەشە سەوابا. بۆ مامۆستا کەبابا).

سەلامیش - بەڕەحمەت بێ - بزوێنی کورتی (ە)ی (پاکە)ی کردووە بەئەلف لەم دێڕەدا بۆ هاوسەروایی دێڕەکانی تر، کە دەڵێ (هەزەج):

هەموو عالەم لە چاوی پیس و چڵکن

نەترسێت و منیش ترسم لە پاکا

هاوسەرواکانی تری ئەمانەن: (ڕاکا، کەلاکا، لە خاکا، لە... هیلاکا...).

خۆی ئاوایە (منیش ترسم لە چاوی پاکە). (بڕ: ئەنگەکانی سەروا/ ١، ٢).

ح- پیتی ڕەوی ئەگەر (ر، ل، و، ی، ث، ذ، ص، ض، ط، ظ، پ، چ، ژ، گ، ڤ) بوو، هەندێ وەستاکارییان تیادا دەکرێ. (بڕ: پیتی ذال + پیتی ڕێ).

ط- سەروای مقید و مطلق لە چەند بەحردا دەبێ بڕوانە ئەخشەی دوا پیتەکانی سەروا.

---

(*) منالان دەگرین کە لە دایک بوون

چی پیتێ دروستە کە ببێ بەپیتی ڕەوی؟:

١- بەکورتی: زۆربەی پیتەکانی ئەلفوبێ دروستە کە ببن بەڕەوی، بەتایبەتی پیتی دەنگی - واتە: پیتی بێ دەنگ: حەرفی صامیت - هەمزەیش بۆ ئەم مەبەستە بەپیتی صەحیح دادەنرێ، هەتا دروستە هەمزەی وەستاو، وەک هەمزەی (نەء) لە کوردیدا، ببێ بەڕەوی هۆنراوی داخراو، پیتی گیراویداریش - مشدّدیش - دەبێ بەڕەوی، بەلام لە دێڕی داخراو (مقید)دا، دائەنرێ بەیەک پیتی بێ بزوێن.

٢- ئەم پیتانە دەست نادەن بۆ ڕەوی: پیتی عیللەی زائیدە، هەروا پەیدا بوو لە تێرکردنی بزوێن، کە پێیان دەگوترێ: حوروفی مەدد، لە کوردیدا پێیان دەگوترێ: بزوێنی درێژ، کە ئەم سیانەن: (ا، و، ی) کە لە کوردیدا دەبن بەشەش ئاوا: (ا، ی، ێ، وو، وێ، ۆ). هەروا هێی ئێست و هێی تەئنیث و هێی ڕاناو و تەنوین بەهەموو جۆرەکانیەوە و ئەلفی تەئنیثی مەقصورە و ئەلفی تەثنیە و، واوی ڕاناو و، یێی ڕاناو و، تێی تەئنیثی بزوێندار و، نوونی تەئکیدی ثەقیلە و خەفیفە و، تێی ڕاناوی درێژی وەستاو و، کافی خیطاب و تێی متکلّم، ئەم پیتانەیش دەست نادەن بۆ پیتی ڕەوی. مەگەر بەپێی مەرج.

جا با بەچەند نموونەیێ، ئەم باسە ڕوون بکەینەوە:

آ- ئەلف: ئەم ئەلفانە نابن بەڕەوی:

١- ئەلفی ئیطلاق - کە لە تێرکردنی بزوێنی ڕەوی پەیدا دەبێ - کاتێ بزوێنەکەی سەر بێ، وەک (وافیر):

سَرَى فِي اللَّيْلِ لاَ يَدْرِي إلاَّ مَا  وَأوْغَلَ مَا يَدْرِي إلاَّ ظَلاَمَا

لە کوردیدا وەک دێڕەکەی سەلام کە ئێستا ڕۆیشت: (لە پاکا).

٢- ئەلفی تەثنیە، وەک (خەفیف):

لاَ أقُـولُ اسْكُنَا إلى هذه الدا
رِ غُرُوراً، وَلاَ أقُولُ: اسْتَعِداً

ئەلف لە دوایی (استَعِداً)دا، ئەلفی تەثنیەیە، دەست نادات بۆ ڕەوی، چونکە پیتەکەی پێشی ڕەوییە، ئەلفەکە وەسلە، لە کوردیدا شتی وا نییە، مەگەر کەسێ وشەیەکی موثەنناى عەرەبی بکا بەسەروا.

٣- ئەلفی تەبین، کە لە گۆکردندا ناخوێنرێتەوە، مەبەست لێی تەنیا ئەوەیە کە پیتەکەی

پێشی بزواوە نەک وەستاو، وەک (أنا).

٤- ئەلفی عیوەزی تەنوین، وەک (زیدا) لە کاتی ئێستا.

٥- ئەلفی لە کاتی دەرجا ببێ بەنوون، وەک: (لَنَسْفَعاً بِالنَّاصِيةِ).

٦- ئەلفی کە مەقلووبی نوونی تەوکیدەی خەفیفە بێ، وەک (رەجەز):

يَحْسَبُهُ الْجَاهِلُ مَا لَمْ يَعْلَمَا    شَيْخاً عَلَى كُرْسِيِّهِ مُعَمَّمَا

چونکە ئەلفی (يَعْلَمَا) گۆڕدراوی نوونی (يَعْلَمَنْ)ە، ئەم ئەلفە دەبێ بەوەصڵ.

٧- ئەلفی وەصڵ، واتە: ئەلفی پاش پیتی ڕەوی، وەک (خەفیف):

أَيَّتُهَا النَّفْسُ أَجْمِلِي جَزَعاً

٨- ئەلفی خەروج، وەک (بەسیت):

كَأَنَّمَا الفِضَّةُ البَيْضَاءُ سَائِلَةٌ

مِنَ السَّبَائِكِ تَجْرِي فِي مَجَارِيهَا

٩- ئەلفی پاش هێی ڕاناو، وەک: (لَهَا، كلها، عِندَهَا، بِهَا، شبابُهَا). شتی وا ئەگەر هەیشبێ شازە، وەک (متقارەب):

وَقَدْ يُعْجِبُ المَرْءَ طُولُ البَقَا

وَلَمَّا يَزَالُ يَخُوطُ الحَيَا

وَيَلْحَقُ أَبْنَاؤُهُ كُلُّهُمْ

وَيُدْرِكُ حَاجَتَهُ كُلَّهَا

١٠- ئەلفی کورت و ئەلفی درێژ ئەگەر ئەصڵی بوون، وە هەستیار پیتێکی تری لە پێشیانەوە نەکرد بوو بەنەگۆڕ، ئەوە دەبن بەڕەوی. ئەلفی کورت وەک (هدى، خُطى، مُصْطَفى، أبى، يَخْشى) ئەلفی درێژ وەک (عَصَا، دَعَا، برا، پەتا، خودا، تا، لا) موتەنەبی لە هۆنراوێکا ئەم وشانەی کردووە بەسەروا و ئەلفەکەیانی داناوە بەڕەوی: (العُلاَ، العِدَا، الفَتى، عَتَا، أبى). بەم جۆرە چامەیە دەگوترێ: چامەی مەقصوورە.

حاجی قادری کۆیی - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - بەپێی بڕیاری ئەم بڕگەیە، ئەلفی بزوێنی درێژی کردووە بەڕەوی کە دەڵێ (سەریع):

گوتم بەبەختی خەواڵوو بەسە ئەتو بی خودا

لە خەو هەڵستە، زەمانێ، بچینەوە ئەولا

هەروا قانیع - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - دەڵێ:

گوتم بەبەختی خەواڵوو بەسە ئەتو بی خودا

پشـــتی یەکـــمـــان گـــرت هەر وەکـــو برا

١١- بەڵام ئەگەر ئەلفی کورت و ئەلفی درێژ ئەصلی بن، یا نائەصلی، هەستیار لە پێشیانەوە پیتێکی تری دابین کردبوو، وەک (رضا، قضی) و وەک: (دعوی، شکوی. قصوی، رضوی) ئەوە سەبارەت بەم جۆرە ئەلفانە دوو ڕا هەیە:

١- ڕای بەهێز ئەوەیە کە ئەلفەکە وەصڵ بێ و، پیتە نەگۆڕەکەی پێشی ڕەوی بێ، ئەگەر دەستی دەدا بۆ ڕەوی، دەنا ئەلفەکە خەروجە و پیتەکەی پێشی وەصڵە و پیتەکەی پێش وەصڵەکە ڕەوییە.

موعەرری - بەڕەحمەت بێ - لە چامەیەکا ئەم وشانەی کردووە بەسەروا و پیتە نەگۆڕەکانی داناوە بەڕەوی: (رِضَا، قَضی، وَمْضَا، عِوَضَا، غَرَضَا). کە ئەم وشانە هەیانە ئەلفەکەی ئەصڵییە، هەیانە نائەصڵییە، هەیانە کورتە هەیانە درێژە.

ئەورەحمان بەگی بابان دەڵێ لە ستایشی بەهارا:

وەنەوشە لە شاخ، نەرگس لە دەشتا

رەقابەت دەکەن لەگەڵ بەهەشتا

لە چلەی سید ئەحمەدی خانەقادا دەڵێ (رەمەل):

عالی رەمزی فەنا و، واقفی عیلمی بەقا

حاتەمی کوردی عێراق و شێخ و شاهی خانەقا

بڕوانە شیعرەکەی نالیش کە لە پێش سەر باسی (تعریف القافیة)دا ڕۆیشت: (ئەی جیلوەدەری... تاد).

٢- ڕای دووەم ئەوەیە کە هەستیار خۆی سەرپشکە، لە کردنی ئەم جۆرە ئەلفە بەڕەوی یا بەوەصڵ.

لەسەر هەردوو ڕاکە ئەم جۆرە هۆنراوە پێی دەگوترێ: (مقصورة).

١٢- ئەلفی (ذَا) کە بەواتا (صاحب) بێ، یا ئامـاژە ناو (اسم الإشَارة) بێ، دەبێ بەڕەوی.

١٣- ئەلفی تەسهیلکراو لە هەمزەوە نابێ بەرەوی، وەک (رەجەز):

وَيَرْفَعُ الفَـاعِـلَ فِـعْلٌ أُضْـمِـرا

كَمَـثْلِ: زَيْدٌ، في جَوَابِ مَنْ قَرَا

ب - یێ: ئەم یائانە نابن بەرەوی:

١- یێی ئیـتـلاق، کـە لە تێـرکـردنی بزوێـنی رەوی لە هۆنراوی کراوەدا پەیدا دەبێ، کە بزوێنەکەی ژێر بێ. وەک (کامیل):

خَلِّ البُكَاءَ بِمَوكِبِ الشُّـهَدَاءِ

إنَّ البُكَاءَ مَطِيَّـةُ الضُّـعَـفَاءِ

بوونی شتی وا لە هۆنراوی کوردی پەتیدا ستەمە.

٢- یێی راناوی وەسـتـاو، چ بۆ کـەسی یەکـەمی تاک بێ، وە چ بۆ کـەسی دووەمی فـەرمـانی مـێـیـینەی تاک بێ و بزوێنی پێشی ژێر بێ و دوا پیـتی سـەروا بێ، وەک: (عـزائی، ندائی، ردائی، بی، ابنی، أبي، مني، عَني) وەک (اضْرِبي، كُلي، اشْـرَبي، قَرِّي). جاروبار ئەم جۆرە یێیە ئەگەر موزافوئیلەیهی بێ دەبێ بەرەوی. وەک (کامیل):

إني امرؤٌ أحْمِي ذِمَارَ إخْوَتي

إذَا يَرَوْنِي مُنْكِراً يَرْمُـونَ بِي

٣- یێی خەروج، وەک چامەکەی نالی (... بردهی، سردهی... تاد).

٤- یێی ئەصڵی، یا نائەصڵی، کە پیتی پێشی نەگۆڕ بێ، وەک (راقی، باقی، لاقی، ساقی...) وە یێی سووک کراوی هەمزە، وەک (مالی) لە (مالئ) بێ.

(تێبینی): ئەم جۆرە یێیانە دروستە ببن بەرەوی:

٥- یێی بزوێندار، کـە پیـتی پێـشی بزوێندار بێ، وەک (لِسَـانِيَـا، بَوَائِيـا، يَمَـانِيَـا، بَوَاكِيا، خَوَالِيا، هَيَا، حَيَا، جَنَيَا).

٦- خۆی وەستاو بێ و پیتی پێشی سەردار بێ، وەک (رەمەل):

سَائِقَ الأظْعَانِ يَطْوِي البِيدَ طَيْ

منعمـاً، عَرِّجْ عَلى كُثْبَانِ طَيْ

لە کوردیشا وەک (مەولەوی - دە بڕگە):

ئەم تەفرەی تەوبەی حەقیقی تا کەی

عـومـر سـۆزی کـوا؟ ئەسـۆزی دەخـەی

نالیش لە چامەیەکا دەفەرمووێ (هەزەج):

وەرە سـاقی! بەشێن و نەدب و واوەی

ئەوا فەرشی حەیاتی خۆم دەکەم طەی!

یا وەک ئەم چامەیەی تری، کە ئەمە سەردێڕەکەیەتی (هەزەج):

(بِحَـمْـدِ اللّه) دوو چاوی یارم ئۆخـەی

بەبێ مەی مەستە، بێ مەی مەستە بێ مەی

٧- خۆی بزواو و پیـتی پێشی وەسـتـاو بێ، وەک (بَغْـیَا، لأیَـا، نَأیَا، هَدْیا، شَـرْیا، رمیةْ، ظبیةْ، حِلْیَةْ، عِنَایَةْ، رِعَایة، رایة، آیَةْ...).

٨- یێی گیراویدار، وەک: (قصیّ، عُدَیّ، لؤیّ، قسِیّ)

٩- یێی نیـسـبـەی قـورس، یا سـووک، وەک (بغـدادی، کـردی، هەورامی، سنەیی، سلێمانەیی...).

ئەم هۆنراوەی قانیع - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - بەپێی ئەم بڕگەیە:

| | |
|---|---|
| ڕۆڵە! عیسایی یاخۆ مووسایی | مەچـۆ بەگژیـا هەر بەخـۆڕایی |
| هەتـــا دەتـوانی بەدڵنەوایی | بیهێنە سەر ڕێ، ڕێگەی برایی |

بەڵام لەم هۆنراوەی ترا کە دەڵێ (ڕەمەل):

| | |
|---|---|
| کوردە! کـــوڕەکەت کـە بێ کەوایـە | ژنەکەت ڕووتە و ئەڵێی دەعبـــایە |
| گەورەکەت چۆڵە و بێ گا و مانگایە | سوێندت بۆ ئەخۆم کە خەتای چایە! |

لەم چوارینەدا (ا) ڕەوییە، یێکەی پاشی پاش ڕەوییە.

١٠- یێی ئەصڵی وەستاو، کە پیتی پێشی بگۆڕێ ژێردار بێ، وەک (یکفی، یرمی، مبدی، نالی، مەحوی، ساقی).

ئەم دێڕەی سەلام جۆرێکە لەم جۆرە:

| | |
|---|---|
| دەرچووم ڕۆیشتم بۆ قەراخی دێ | بەڵکو پەلکێ گیا بدۆزمۆ لەوێ |

هەروا ئەم دێڕە کە باسی گوندێکی کوردستـان دەکا، لە کاتی هێرشی جەیش و جاشا (جاشنامەکەی نوری فارس، دە بڕگەیی):

دڕندەی بەعسی تینووی خوێنی کورد　　وەک گورگی برسی دەڕژانە ناو گونـد

بەچـاونــووقـانێ دێــی دەورەدراو　　دەبوو بەگۆمی خوێن و ئەشکی چـاو

(وەک مۆم دەسووتا دار و بەردی دێ　　وەک گزرە دەکەوت تەرمی نێر و مێ)

١١- یێی یەکەمی (فعیل) لە موعتەللولاما، دروستە ببێ بەڕەوی، وەک (ڕەجەز):

أَلَمْ تكُنْ أقْسَمْتَ بِاللهِ العَلّيِأنَّ مَطَايــاكَ لمِنْ خَيْرِ المَطِيِّ!

ج- واو: ئەم جۆرە واوانە دەست نادەن بۆ ڕەوی:

١- واوی ئیتلاق، کە ئەو واوەیە لە بزوێنی بۆری ڕەوی پەیدا دەبێ لە هۆنراوی کراوەدا، وەک (یولدُ) دەبێ بە(یولَدُو) بڕوانە: (چەند تایبەتمەندییەکی ڕەوی - ز).

٢- واوی ڕاناوی کـۆی کـەسی سـێـیـەم، وەک (ذهبوا، فـعلوا، حـیوا...) بەڵام ئەم جۆرە واوە ئەگەر پێشی سەر بێ دەبێ بەڕەوی، وەک (عَصَوْا، رَمَوْا...).

٣- واوی لکاو بەڕاناوی کـۆوە، وەک (هُمُـو، کُمُـو، عَلَیْـهِـمُـو، إلَیْکُمُو، حُـبُّـهُـمُـو، وُدُکُمُو...) وەک (ڕەمەل):

فَتَزَوَّدْ لِلْهوی أَسَفَا　　وَانْسَ یا مِسْکِینُ حُبَّهُمُو

٤- واوی خەروج (ر: الخروج) وەک (بەسیط):

کَیْفَ السَّبِیلُ ألی ضَیْفٍ یُزَاوِرُهُ　　وَالنَّوْمُ في جُمْلَةِ الْاحْبَابِ هَاجِرُهُ

ئەم جۆرە واوانە لە کوردیدا نییە، مەگەر وەک شیعرەکەی نالی، هەستیارێ شیعرێ ڕۆ بنێ لە ڕستەی تێکەڵ، لە کوردی و عەرەبی (بڕ: ٢٢ - البیت - هێڵکاری...).

(تێبینی): ئەم جۆرە واوانە دەبن بەڕەوی:

٥- واوی بزواو، کە پیتی پێشی وەستاو بێ، وەک (دلو، شأو، عضو...).

٦- واوی وەستاوی ئەصڵی کە پیتی پێشی سەری هەبێ، یا ژێر، یا بۆر، وەک مەحوی دەڵێ (هەزەج):

کە لێوی خوێنمی نۆشی، شەوی خەت گرتی دەوری ئەو

بەقــوربانی خــوێنێکم کـەوا ڕۆیی بەســەریا شــەو!

یا وەک (یغزو، یرجو، یعفو...).

نالیش - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - دەفەرمووێ (هەزەج - واوی وەستاوی پێش بۆردار):

زولفت کە لەسەر ڕوو بەخەم و تابشە ئەمڕۆ

دوودی سییەهی عوودە لەسەر عاریضی پشکۆ

لە دوا ئەم سەردێڕەوە ئەم واوانە بوون بەرەوی: (ئەستۆ، ئەبرۆ، شەوبۆ، هێرۆ، تۆ).

مەحویش دەفەرمووێ (هەزەج - واوی بزواو، کە پیتی پێشی وەستاو بێ):

کە بێ لێوی لەسەر لێوم بنێ، ڕۆحم لەسەر لێوە

کە لێوی لابەرێ، ئەڵبەتتە ڕۆحم دەردەچێ پێوە

وەفایی لە چامەیەکا هەمزەی قەڵبکراو بەواوی کردووە بەرەوی: (جادوو، ئاهوو، گێسوو، ئەرەستوو، گەوهەر و لووئلوو). (بڕوانە: نموونەکانی ریدف چوارەم).

د- هێ: ئەم جۆرە هێیانە نابن بەرەوی:

١- هێی ئێست (وەقف) وەک: (هذا غُلاَمِيَهْ) و (يَا أَبَهْ) کە ڕۆڵی ئەم جۆرە هێی ئێستە، تەنیا دەرخستنی بزوێنی پێشی خۆیەتی و بەس. پێی دەگوترێ: هێی وەقف بۆ تەبیینی حەرەکە.

٢- هێی ڕاناوی بزواو، کە پیتی پێشی بزواو بێ، وەک (کامل):

عَذَلَ العَوَاذِلُ حَولَ قَلْبِ التَائِه

وَهَوى الأحِبَّةِ مِنْهُ فِي (سَوْدَائِه)

٣- هێی ڕاناوی بزواوی تاکی مێیینەی کەسی سێیەم، کە پیتی پێشی بزواو بێ، وەک (رەجەز):

وَكُلَّمَا جَدَّتْ تَرَانِي عِنْدَهَا

كَيْفَ تَرى عَدْوَ غُلاَمٍ رَدَّهَا

٤- تێی تەنێث کە بەهێ گۆ بکرێ، کە پێی دەگوترێ هێی وەستاو، کە لە بنەڕەتدا تێی خڕی نیشانەی مێیینەیە لە ڕێزمانی عەرەبیدا. وەک (رَقَبَةْ، خَطَبَةْ، مقرَّبَةْ... حمزةْ، طلحةْ...) بەڵام تێی خڕی مێیینە ئەگەر بزواو بێ هەستیار خۆی سەرپشکە. بزوێنی کورتی (ە) کە لە جێی سەری عەرەبییە، کە لە کۆتایی پیتی ڕەویدا بێ، وەک تێی خڕی مێیینەی

بەهێ گۆپێکراویش دەست نادات بۆ ڕەوی. حاجی - بەڕەحمەت بێ - دەڵێ (ڕەمەل):

زۆر سەگم دیوە فەقەت ئەمدی ڕەقیببی هەندە سە

وەزعی نامەوزوون دەبێ، وەک خانوویی بێ هەندەسە

ئەورەحمان بەگی بابان دەڵێ (هەزەج):

بەجارێ مەستی کردم بۆ سەیێکی ئەو دەم و لێوە

مەگەر لیکی دەمی ئەو دولبەرە، شیلەی ڕەگی مێوە

(تێبینی): ئەم جۆرە هێیانە دەبن بەڕەوی:

٥- هێی بزواو، یا وەستاو، کە بەشێ بێ لە وشە، بەمەرجێ پیتی پێشی بزواو بێ، وەک (یتأوَّهُ، یَعْمَهُ، یتوجَّهُ، یُقَهْقِهُ، بەه بەه، ئەه، بەه!، ڕەه، شەه).

٦- هێی ڕاناوی تاکی کەسی سێیەم، چ بۆ نێر، وە چ بۆ مێ بێ، بەمەرجێ پیتی پێشی پیتی مەدد بێ، یا پیتی وەستاو بێ، وەک (مجریها، مجاریها، مرساها، أهْواهُ، منهُ، دَعْهُ) وەک ئەوە: (منه) و (عنه) بکا بەسەرروای دوو دێڕ.

٧- هێی بزواوی بەشی وشە، بەمەرجێ پیتی پێشی وەستاو بێ، وەک (بەسیط):

وَدَّعْتُهُ وَدُمُوعُ العَیْنِ مُذرَفَةٌ

والنفسُ باکیَةٌ وَالقَلْبُ أوَّاهُ

٨- هێی ڕاناو بەمەرجێ پیتی پێشی وەستاو بێ، وەک (کامل):

قولوا له روحي فِدَاهْ    هـذَا التَّجَنِّي مَا مَدَاهْ

(بڕ: ی - میم - ١، ٢، ٣ لەدواوە).

ه- تێ: ئەمانە نابن بەڕەوی:

١- تێی مێیینە، خڕ بێ یا درێژ، وەستاو بێ یا بزواو، بەمەرجێ پیتی پێشیان نەگۆڕ بێ، وەک (تولّت، حلّت، ذلّت، ملّت، استحلّت، اقلّت، مهلة، سهلة، قتلة، کتلة) پیتە نەگۆڕەکە ڕەوییە.

٢- تێی خڕی مێیینە، لە کاتی ئێستا، بەڵام زۆر کەم لە ناچاریدا دەکرێ بەڕەوی، بەمەرجێ بەتێ گۆی پێ بکرێ وەک (شجرة + فذکرت) بڕوانە (ناچاری/٩٩/ج،٢،١٠٢-٧).

ئەم جۆرە تێیە لە کوردیدا بەدوو جۆر بەکار دەهێنرێ:

آ- جاری وا هەیە بەدرێژ دەنووسرێ و بەتێ گوێ پێ دەکرێ وەک: (وەزارەت. ئیشارەت، نەشئەت، منەت، ڕەحمەت).

ئەم جۆرەیان بەزۆری لە کوردیدا دەبێ بەڕەوی، حەریق - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - دەفەرمووێ: (هەزەجی ئەخرەب):

ئەم خوسرەوی خوبانە کەوا دیتە نەظارەت

شیرینە ئەگەر دڵ بڕفێنێ بەئیشارەت

ب- جاری وایش هەیە بەبزوێن دەنووسرێ، ئاوا (ە) بەبزوێنیش دەخوێنرێتەوە، وەک (تەوبە، نۆبە، مەرتەبە، ئیجازە...) ئەمەیان نابێ بەڕەوی. بەڵام لەبەر ئەوەی زۆربەی نووسەر و خوێنەر و چاپکار، شارەزایی تەواویان نییە، لە ڕێزمان و لە زمانەوانی، بۆ ئاسانکاری، ئەو جۆرە چامەنەی کە بەبزوێنی (ە) کۆتاییان دێ، لە پیتی هێی دیوانە تۆمارکراوەکاندا، لە کوردیدا پۆلێن کراون، گەرچی ئەم بزوێنی (ە) گەلێ جیاوازی هەیە لە دەنگی هێ.

(تێبینی): ئەمانە دەبن بەڕەوی:

١- تێی بەشی وشە، وەک (متفلّت، مُصَلّت، کمیت).

٢- تێی خڕی مێیینە و تێی درێژی مێیینە، بەمەرجێ پیتی پێشی نەگۆڕ نەبێ، وەک لە هۆنراوێکا ئەم وشانە بێن بەسەروا: (بالشَفَة، نَمَت، لَمْ یَمُت...) لە کاتی وادا دروستە تێی بەشی وشە و تێی تەئنیث، چ خڕ، چ درێژ، بەرودوا بێن بەڕەوی. وەک: (المتفلّت، مُصَلّت، عریکتي، کمیت...) و (أحبّتي، بجملتي، کَلّت، حرقتي، لرؤیتي). هەروا ئەگەر تێی درێژی مێیینە وەستاویش بێ وەک: (أتَتْ، نَمَتْ، حَاضَتْ) بەتێی وەستاو لەم وشانەدا.

٣- تێی مێیینەی خڕ، هەروا تێی بەشی وشە، هەروا تێی مێیینەی درێژ، بەمەرجێ پیتی پێشیان وەستاو بێ، وەک ئەم وشانە بوون بەسەروا لە هۆنراوێکا: (للصلاة، المَمَات، السَّافیات...) لەم وشانەدا تێکەرەوییە، ئەلفەکە، ریدفە، ئیشباعی بزوێنی تێکە وەسلَە.

مەحوی - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - دەفەرمووێ (ڕەمەل):

دڵ لەسەرخۆ چوونی پەی دەرپەی دەلیلی یارە هات

عەقڵ و هۆش ئەی دڵ بکە حاضر، لەپێشە کارە هات

له پاش ئەم سەردێڕە لە دێڕەکانی تردا ئەم وشانە سەروان: (حەیات، وەفات، هەلآت، برات، نەهات، ثەبات، لات، الحیاة).

٤- تێی ڕاناوی فاعیل، وەک (أَكَلْتُ، شَرِبْتُ، خُلِقتَ، حُضْتِ).

و- کاف: کاف یا ئەصڵییە واتە: بەشی وشەیە، یا کافی خیطابە، واتە: ڕاناوی کەسی دووەمی تاکە، چ نێر چ مێ.

١- کافی بەشی وشە بەبێ قەید و مەرج دەبێ بەڕەوی. ئیتر چ کافەکە خۆی بزواو بێ، یا وەستاو، وە هەروا پیتی پێشی چ بزواو بێ یا وەستاو، وە چ نەگۆڕ بێ و چ بگۆڕ. وەک (مالک، هالک، بارک، شارک، ماسک، سافک) یا وەک: (شكّ، دكّ، حَكّ) یا وەک (باكٍ، شاكٍ، حاكٍ...) یا وەک (عالِك، سالِك، مالِك، حالك، هالك...). لە ئیقبالنامەدا دەفەرمووێ:

لە پێش نیوەڕۆ قەیلوولە چاکە     لە پاش نیوەڕۆ نووستن هیلاکە

٢- کافی ڕاناو چەند جۆری هەیە:

آ- پیتی پێشی پیتی مەدد بێ، واتە: بزوێنی درێژ بێ: (ا، و، ی) ئەوە پێویستە کافەکە ببێ بەڕەوی، وەک: (ذِكْرَاكِ، القاكِ، رَيَّاكِ، حَيَّاكِ) و (أسْلُوكِ، أبوكَ، اهلوكِ، فيكِ...).

ب- پیتی پێشی پیتی بێ دەنگ (حەرفی صەحیح) بێ، وە بزواوی نەگۆڕ بێ، ئەوە دروستە کافەکە ببێ بەڕەوی، یا پیتە نەگۆڕەکە ببێ بەڕەوی و کافەکە ببێ بەوەصڵ، وەک: (نَوَّلَك، شاغَلَكَ، أذهَلَكَ) و (استودَعَكَ، أطلعَكَ، مَعَكَ).

ج- پیتی پێشی بگۆڕ بێ، ئەوە پێویستە کە کافەکە ڕەوی بێ، خوای کافەکە بزواو بێ یا وەستاو، وەک: (لَملكَ ْ، بِكَ ْ، تَمَسَّكَ ْ، تحرُّك...) و (ضربِك، أدبَكَ...).

تێبینی:

١- لە یەک پارچە هۆنراودا، کافی بەشی وشە و کافی ڕاناوی کەسی دووەم دروستە کۆ ببنەوە، وەک ئەم وشانە بەرودوا لە دێڕەکاندا ببن بەسەروا (الملک، بک، تمسک، تحرک).

٢- کافی ئەصڵی و کافی خیطاب (ڕاناو) وا دەبێ بزواو دەبن و وا دەبێ وەستاو.

ز- تەنوین: نابێ بەڕەوی بەهەر شەش جۆرەکەیەوە:

تەنوین شەش جۆری هەیە: تەمکین و تەنکیر و موقابەلە و عیوەز و تەرەننوم و غالی.

ئەمانە هیچیان دەست نادەن بێن بەڕەوی، چ حاڵەتی رەفعە، یا نەصبە، یا جەررەیان بێ.

آ- تەنوینی تەمکین ئەوەیە کە دەچێتە سەر ناوی موعرەب، وەک: (زیدٌ = زیدُنْ).

ب- تەنوینی تەنکیر، ئەوەیە کە دەچێتە سەر ناوی مەبنی، بۆ ئەوەی مەعریفەی لە نەکیرەی جیا بکرێتەوە، وەک: (مَرَرْتُ بِسِیبَوْیهِ وَبِسِیوَیْهٍ آخَرَ).

ج- تەنوینی موقابەلە، وەک: (مسلماتٍ) تەنوینەکەی لە موقابەلەی نوونی (مسلمین)ەدایە.

د- تەنوینی عیوەض، سێ جۆری هەیە:

١- عیوەضی جوملە، لەجیاتی ڕستە، وەک تەنوینی (ئذٍ = أنذنْ) لە (حینئذ)دا.

٢- عیوەزی ئیسمێکی موفرەد، لەجیاتی ناوێکی تەنیا، وەک تەنوینی (کُلٌّ = کُلّن) لە (کلٌ أتَوْهُ دَاخِرِین) واتە: کلُ وَاحِدٍ.

٣- عیوەزی تاقە پیتێ، وەک تەنوینی (غَوَاشٍ، جَوَارٍ) کە تەنوینەکەیان لەبری حەرفی پیتی کۆتاییانە، کە لە سەرەتاوە ئاوابوون: (جَوَارِی، غَوَاشِی).

هـ- تەنوینی تەرەننوم - کە ئەوەیە دەچێتە سەر سەروای رەها، لەجیاتی ئەلف، بۆ تەرەننوم و دەنگ لەرینەوە، وەک (وافیر):

أقِلّی اللّوْمَ -عَاذِلَ- وَالعِتَابَنْ
وَقُولِی - إنْ أصَبْتُ - أصَابَنْ

و- تەنوینی غالی - کە ئەو تەنوینەیە دەچێتە سەر سەروای داخراو (مقید) وەک (رەجەز):

وَقَاتِمِ الأعْمَاقِ خَاوِی المختـرقْنْ
مشتبه الأعْلاَمِ لَمّاعِ الخَفَقْنْ

ح- نوونی تەوکید:

نوونی تەوکیدی خەفیفە و ثەقیلە نابن بەڕەوی، مەگەر چۆنها، وەک (رەجەز):

وَعَالِمٍ بِعِلْمِهِ لَمْ يَعْمَلَنْ مُعَذّبٌ مِنْ قَبْلِ عُبّادِ الْوَثَنْ

ط- هەمزە:

١- هەمزە، چ بزواو بێ و، چ وەستاو بێ، دەبێ بەڕەوی، وە چ بزوێنەکەی سەر بێ، یا

ژێر بێ، یا بۆر بێ، وە لە شیعری مقید و مطلقا دەبێ بەرەوی. وەک (رەجەز):

عَلَيْكَ بِالدُّعَاءِ فَالدُّعَاءُ    لِكُـلِّ دَائِنَا هُوَ الـدَّوَاءُ

٢- ئەو چامانەی کە دوا پیتی دێرەکانی ئەلفی مەمدوودە بێ، پێیان دەگوترێ: چامەی مەهمووزی موردەف. وەک (خەفیف):

آذَنَتْنَا بِبَيْنِهَا أَسْمَاءُ    رُبَّ ثَاوٍ يُمَلُّ مِنْهُ الثَّوَاءُ

ی- میم:

١- پیتی میم، ئەگەر بەشی وشە بوو، بەبێ مەرج دەبێ بەرەوی، وە چامەی میمی زۆر زۆرە، وەک قەصیدەی بوردییەی بوصیری - رەحمەتی خودای لێ بێ -.

٢- میم ئەگەر بەشێ بوو لە راناو، وەک (منکم، منهم، منکما، منهما، منکمو، منهمو، هم، کم، هما، کما...) ئەوە وا باشە کە پیتێ تر لە پێشیەوە نەگۆڕ بێ، گەرچی بەکەمی میمی بەشی راناو کراوە بەرەوی، وەک (بەسیط):

مَـولاَیَ صَلِّ وَسَلِّمْ دائِمـاً أَبَدَاً

عَلَى حَبِيبِكَ خَيْـرِ الْخَلْقِ كُلِّهِمِ

٣- میم لە (فِیـهِمْ) و (مِنْهُمْ) و (مِنْكُمْ)دا رەوییە، وە دروستە ئەم سێ وشەیە لە چامەیەکا بێن بەسەروای دێرەکانی. واتە (ی)ی (فیهم) ریدف نییە.

ک- پیتی گیراویدار: حەرفی موشەددەد دروستە ببێ بەرەوی، بەڵام لە سەروای داخراودا دادەنرێ بەیەک پیتی وەستاو. هەروەک دروستە لە دێڕێکا پیتی رەوی گیراویدار بێ و لە دێڕێکی تردا سووک بێ وەک: (بَلْ) لەگەڵ (حَلْ) یان (مِنِّی) و (عَنِی).

ل- نوونی نیشانەی راناوی کۆ: دروستە ببێ بەرەوی وەک (یأتِینَ × أَسَأْنَ).

**دوا تێبینی سەبارەت بەرەوی:**

١- وەک دەرکەوت زۆربەی پیتەکانی ئەلفوبێ دەست دەدەن بۆ رەوی:

آ- ئەو پیتانەی لە ئەلفوبێی عەرەبی، کە بەبێ مەرج دەست دەدەن بۆ رەوی ئەم پیتانەن: (ب، ث، ج، ح، خ، د، ذ، ر، ز،س،ش، ص، ض، ط، ظ، ع، غ، ف، ق، ل).

ب- ئەو پیتانەی کە لەگەڵ مەرجدا دەست دەدەن بۆ رەوی: (ت، ک، م، ن، و، ه، ی، ء، ا).

ج- ئەو پیتانەی کە تایبەتن بەزمانی کوردییەوە ئەمانەن: (پ، چ، ژ، ڤ، گ) لەگەڵ چەند حاڵەتێکی واو و یێی گوشراو، یا کراوە، حاڵەتەکانی واو و یێ ئەمانەن: (ۆ، وو، وێ، یی، ێ، وێ) وەک: ئەمڕۆ، بوو، دەبێ، مراویی، خوێ، توێ، نوێ، کوێ.

د- ئەو پیتانەی لە ئەلفوبێی عەرەبیدا بەبێ مەرج دەبن بەڕەوی، لە کوردیشدا بەبێ مەرج دەبن بەڕەوی، هەروا پیتەکانی: (پ، چ، ژ، ڤ، گ) کە تایبەتن بەزمانی کوردییەوە.

هـ- پیتەکانی: (ت، ک، م، ن، و، هـ، ی، ء، ا) ئەگەر بەشێ بن لە وشەی ڕەسەنی کوردی، بەبێ بەند و مەرج دەبن بەڕەوی، وەک: (ئاوات، جووت، پشکووت، نۆک، تووک، چرووک، بووک، مام، سام، کێم، دێم، چەم، دەم، لم، بەن، شەن، سن، چەن، من، ژن، هەو، کەو، خەو، بەهـ، رەهـ، جەهـ، نەء، برا، کەوا، باڵا، چرا).

بەڵام ئەگەر بەشێ نەبوون لە وشە ئەوە بڕیاری تایبەتی سەبارەت بەبوون و نەبوونیان بەڕەوی هەیە لە جێگەی خۆیانا دێن.

و- هەر کاتێ پیتێ بوو بەڕەوی، ئیتر ئەو پیتە خۆی و بزوێنەکەی، یا خۆی و زەنەکەی، لە سەراسەری چامەکەدا، لە جێگەی دیاریکراوی خۆیدا، دووبارە دەبێتەوە. جا دروستە ئەو پیتە لە پیتە بێ مەرجەکان بێ، یا لە پیتە مەرجدارەکان بێ، یا لە هەردوو لا بێ، بەرودوا ڕەوی دێڕەکان تێکەڵ بن لە هەردوو جۆرەکە. جا لەسەر ئەم بنیاتە دروستە:

١- پیتە ڕەوییەکانی دێڕەکانی سەرواکانی چامەیێ، گشتیان لە یەک جۆر بن، وەک ئەم وشانە: (کەف، تەرەف، کەف، دەف، صەدەف، کەلەف، شەرەف، ئەسەف، سەلەف) کە مەحوی کردوونی بەڕەوی لە چامەی ژمارەیەکی پیتی فێدا، وە پیتی فێ لە پیتە بێ مەرجەکانە.

٢- هەموو پیتەکانی ڕەوی لە هۆنراوەکاندا لە پیتە مەرجدارەکان بن، وەک (أراها، محاها، أذاها، سناها) کە پیتی هێی ڕاناو لەم شیعرانەدا بووە بەڕەوی، چونکە مەرجی بوون بەڕەوی هاتۆتە دی، کە ئەوەیە پیتی پێشی پیتی مەدد بێ، کە لێرەدا بزوێنی درێژە، کە ئەلفە.

٣- دروستە پیتەکانی ڕەوی تێکەڵ بن لە هەردوو جۆرەکە، وەک: (سمّاك، براك، ألقاك، ذكراك، بشراك). ئەمە لە کوردیشدا هەر وایە وەک ئەم سەروایانە لە چامەیەکی نالیدا: (شامات، ئافات، فات، ئاوات، هات،...).

٤- دروستە پیتی ڕەوی جاریٚ سووک بێ و جاریٚ قورس، وەک (عَنِّی) لەگەڵ (ابنی) وەک (شدُّوا) لەگەڵ (هِندُ) و (نەجدُ) وەک (جَداً × مَجْدَا).

٥- ئەو پیتانەی کە دەبن بەهاوڕەوی یەکتری و مەخرەجیان لەیەکەوە نزیکە زۆرن.

دووەم: پیتی وەصڵ کە جۆری یەکەمە لە پاشڕەوی: سیلە: وەسڵ

١- وەسڵ - یا پاشڕەوی - پیتێکە یەکسەر وا لە پاش پیتی ڕەوییەوە، یا دوا پیتی گۆپێکراوە، یا وا لە نێوانی ڕەوی و دوا پیتی دێڕەوە.

٢- تەنیا ئەم پێنج پیتە لە عەرەبیدا دەبن بەوەسڵ: (یَهْوَاكَ) بەلاّم کاف زۆر کەم.

٣- وەسڵ تایبەتە بەسەرەوای ڕەهاوە، لە هەموو جۆرە هۆنراوێکی ڕەهادا دەبێ، وەک: تاک و سێیینە و چوارین و چامە و... تاد.

٤- پیتە مەددەکانی ئیشباعی ڕەوی لە کاتی ئێستا دەکرتێن، ئاوا: (یُولَدُ) کە لە کاتی وەصلا دەبێ بە(یُولَدُو) لە کاتی ئێستا دەخوێنرێتەوە (یُولَدْ).

٥- پیتە مەددەکانی وەصڵ، واو و یا یان لە خەتا نانووسرێن، بەمەرجێ لە ئیشباع پەیدا بووبن، لەبەر ئەوە لە عەرەبیدا پێیان دەگوترێ: وەصڵی مەخفی (پاشڕەوی شاراوە).

٦- هەر شەش پیتەکەی وەسڵ دروستە وەستاو بن، بگرە پیتە مەددەکانی وەسڵ، هەمیشە دەبێ وەستاو بن، بەلاّم هێ و کاف وەستاویش دەبن و بزواویش.

٧- پاشڕەوی لە کوردیدا چەند جۆری هەیە:

آ- دەقاودەق وەک هێی عەرەبی وایە، وەک: مەشکە، پەیکە، سە (سووککراوی سەگ)، شووتی، نەوتی، هەبوو، نەبوو، برا، چرا).

ب- چەند جۆری تری هەیە تایبەتن بەزمانی کوردییەوە، بابمێنن بۆ جێگەی خۆی.

٨- مامۆستا عەزیز گەردی ئاوا پێناسەی پاشڕەوی عەرەبی دەکا:

(تیپێکە دوای ڕەوی دێ و پێیەوە دەلکێ و یەکێکە لەم چوار تیپە: (و، ا، ی، ه) و پێی دەگوترێ: (الصلة) یان: الوصل). ئێستایش - بەپشتی خودا دەست دەکەین بەباسی ئەو پیتانەی کە دەبن بەپاشڕەوی:

آ- ئەلف: ئەو ئەلفانەی کە لە باسی (چی پیتێ دروستە ببێ بەڕەوی) نەدەبوون

(پیتی طێ/ هۆنراوەکەی حەریق) و (١٢٠- سەجع/شیعرەکەی گۆران) و (٩٦- راء) و (پیتی ذال... تاد) و (٢٢- البیت-١٤- تیبینی) و (٦- ألف-٥- قوتەرت بێ... تاد).

ب- وەک گوترا ئەم چوار نەنگە ڕوو دەکەنە ڕەوی و بزوێنەکەی، دەی لە عەرەبیدا (م) جیایی بزوێن لە ناو خۆیانا زۆر ئاشکرایە، بەڵام لە کوردیدا کەمێ وردبوونەوەی دەوێ، بۆ نموونە سەلام -ڕەحمەتی خودای لێ بێ- دەڵێ:

هەموو عالەم لە چاوی پیس و چڵکن

ئەترسێت و منیش ترسم لە پاکا

کە هاوسەرواکانی تری ئەمانەن: (راکا، خاکا، کەلاکا، خاکا، هیلاکا، فیک و فاکا) ئەوەی گومانی تیادا نییە (ک) لەم هۆنراوەدا ڕەوییە (ا)ی دوای پیتی وەسڵە، ئەلفی وەصڵ لەم شوێنەدا دوو جۆرن، هەیانە زیادەی ڕێزمانی و شتی وایە، هەیانە بزوێنی کورت بووە، تێر کراوە و بووە بەبزوێنی درێژ، ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێ کە جۆری لە ئیصرافی کوردی، جیایی بزوێنی ڕەوییە بەدرێژی و کورتی (بڕوانە: پیتەکانی سەروا/ یەکەم - ز - شیعرەکەی سەلام) + (١٤٩ - الإصراف).

٥- ئیطاء (ئیتا): ئەوەیە کە وشەیەک بەهەمان شێوەی پێشووی خۆی، وە بەهەمان واتای پێشووی خۆی، بەر لە تێپەڕبوونی حەوت دێڕ، جارێکی تریش لە هۆنراودا، ببێتەوە بەسەروا، وەک (مامۆستا شێخ ئەسعەد مەحوی - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - دەفەرموێ (رەمەل):

گورگی دووپێ هێندە زۆرە، گورگی چوار پێ کەم بووە

پیاوی غەمخۆری نەماوە، بۆیە غەم بێ خەم بووە!!

عەقڵی چی؟ دانش چییە؟ بێ دانشی باوی هەیە

باری کرد شەرم و حەیا، ئەم عالەمە بێ خەم بووە

ئەوەتا لەم هۆنراوەدا، وشەی سەروا کە (بێ خەم)ە، لە دوو دێڕی بەرودوادا دووبارە بۆتەوە، بەهەمان شێوە و هەمان واتای پێشووی، بەڵام دروستە خودی وشەیێ، بەواتایێ نوێ، چەند جارێ بەبێ بەند و مەرج دووبارە بکرێتەوە، وەک وشەی (عەین) کە وشەیەکی هاوبەشە لە نێوان چەند واتایەکا، دروستە لە چامەیەکی حەوت دێڕیدا، یا لە هۆنراوێکی کەمتردا، چەند جارێ دووبارە ببێتەوە و ببێ بەسەروا، جارێ بەواتا (جاسووس = سیخوڕ) جارێ بەواتا (باصرە: چاو) جارێ بەواتا (یەنبووع = کانیاو) یا وەک وشەی

(چا) لەم هۆنراوە کوردییەدا بووە بەسەروا و دووبارەیش بۆتەوە، هەر جارەی بەواتایێ ( ):

تاڵ و شیرین پێکەوە کێ دیویە چا بێ چا نەبێ

هەروا دروستە وشەیێ بەهەمان شێوەی پێشوو، وە بەهەمان واتایش، پاش حەوت دێڕ ببێتەوە بەسەروا، وە هەروەها. بەوێنە ئەم دێڕەی نالی دانانرێ بەئیتا، چونکە دووبارەبوونەوەی (مەدینەی منووەرە) بەدوو واتای جیا جیایە:

ئەی ساکینی ریاضی مەدینەی منەووەرە

لوطفێ بکە، بفەرموو: مەدینەی منەو، وەرە

(چەند تێبینییەک):

١- هەتا دێڕەکان لە یەکەوە نزیکتر بن دووبارەبوونەوەی سەروا ناشیرینترە.

٢- هەندێ دووبارەکردنەوە، کە لە جۆری سەروای دووهەم و پاش سەروا و پاش ڕەوییە بەر ئەم نەنگی ئیتایە ناکەوێ، ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆ بابەتی ڕەوانبێژی، وەک چۆن لە سوورەتی (الرَّحْمنْ)دا، چەندین جار ئایەتی (فَبِأَيِّ آلاَءِ رَبِّكُمَا تكذّبان) دووبارە بۆتەوە و بووە بەهۆی چەندین بەهرە و جوانی.

٣- هەر جۆرە جیاوازییەک لە شێوە و واتای وشەکەدا هەبێ دانانرێ بەئیتا، وەک وشەکە لە دێڕێکا نەکیرە بێ و لە دێڕێکا مەعریفە، ئاوا: (رجل - الرجل) یا ئاوا (هو یضرب - أنت تضربُ، أنَا أضرب - نحن نضرب) چونکە مەعناکانیان جیایە و بێژەکانیش کەمێ گۆڕانیان وا تیادا، هەندێ دەڵێن: ئەمانەیش هەر ئیتان. هەروا ئەم جۆرە دووبارەبوونەوەیش ئیتا نین: (کذا - بذا - لذا، رمی بک - مضی بک، غلامی - بالغلام، برجل - لرجل... تاد) بەڵام ئەم جۆرە دادەنرێ بەئیتا: (عونوقوکە - عونتوکە، فەخیذوکە - فەخذوکە، کەتف - کەتیف).

٦- تەضمین: بڕوانە: (١٥٨ - التضمین/٣).

٧- البَدَل: بەدەلیش کە یەکێکی ترە لە نەنگەکانی سەروا پەیوەندی بەڕەوییەوە هەیە بڕوانە: (١٧ - البدل/١).

دووەم: نەنگەکانی پێش ڕەوی، پێیان دەگوترێ: سناد، واتە: فرە کوێخا، ناتەبایی، سیناد جۆری زۆرە، هەموویان دەکەونە پێش ڕەوییەوە، بەڵام جۆرێکیان دزیو و ناباش نین، وەک نۆرەکردنی واوی پێش بۆردار لەگەڵ یێی پێش ژێردار، وەک (فعول) لەگەڵ (فعیل)دا ببن بەهاوسەروا ئاوا (طَرُوب - مَشِیبُ).

جۆری ئەنگەکەی دەبێ بەچەند بەشێکەوە، وەک:

١- سینادی ریدف، ئەوەیە دێڕێ هەقی ئەوە بێ ریدفـدار بێ کەچی بێ ریدف بێ (بڕ: دەستووره سەرەکییەکانی ریدف/ ١٠).

٢- سینادی تەئسیس ئەوەیە دێڕێ مافی تەئسیس بێ، بەڵام بێ تەئسیس بێ، وەک: (یتحامل - یتجامل - یتجمَّلُ).

٣- سینادی حەذو: جیاوازی بزوێنی پێش پیتی ریدفە، بەیەکێ لەم دوو شێوەیە:

آ- لە دێڕەکاندا، جارێ بۆر بێ، جارێ سەر، واتە: خۆی مافی پیتی مەدد بێ، کەچی ریدفەکە پیتی لین بێ، وەک (عوود - عەود)دا، یا وەک (خەفیف):

عبد شَمْسٍ أبِي، فَأنْ كُنْتَ غَضْبَى

فَـامْلَئِي وَجْـهَكِ المَليحَ خُـمُـوشَـا

نَحْنُ كُنَّا سُكَّانَهَـا مِنْ قُـريشٍ

وَبِنَا سُـمِّـيَتْ قُـريشٌ قُـريْشـاً

ب- لە دێڕێکا ژێر بێ و لە دێڕێکا سەر، وەک (عِین - عَیْن) بەژێری عەینی یەکەم و سەری عەینی دووەم.

بەڵام لە کوردیدا چەند جۆرێ تری هەیە، وەک (وو - ۆ، ی - ێ) بڕوانە: (نموونەکانی ریدف/ ٣ + ٤).

٤- سینادی ئیشباع: جیاوازیی بزوێنی پیتی دەخیلە، لەسەر ئەم شێوانە:

آ- هەقی ژێر بێ و خۆی سەری بێ، وەک (الجَرَاوِل) لەگەڵ (تَطَاوَلِي)دا، بەژێری واو لە یەکەما و، بەسەری واو لە دووەما، یا وەک (مجاهِد) بەژێری هێ لەگەڵ (تباعَد) بەسەری عەین.

ب- بۆر لەگەڵ سەردا، وەک (تبادَر) بەسەری دال، لەگەڵ (تناظُر) بەبۆری ظێ.

ج- ژێر لەگەڵ بۆر، وەک (مَنَاظِر - تَخَاطُر) بەژێری ظێ لە یەکەما و بەبۆری طێ لە دووەما ئەم جۆرەیان لەبەر ئەوەی ژێر و بۆر لە یەکترەوە نزیکن، ئەنگی کەمترە، لەبەر ئەوە ڕێگەی دراوە.

مەحوی - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - لەم چامەیەدا، کە بەڕای من لە جۆری تەئسیسە، یەکێتی بزوێنی دەخیلی نەپاراستووە، کە ئەمە سەردێڕەکەیەتی (هەزەج):

ئەگەر تۆ ڕوو بەخاڵێکی لە (لەیلا) شۆخ و زێباتر
منیش ئاشفتە حاڵێکی لە(قەیس)م شێت و شەیداتر

هاوسەرواکانی تری: (چاتر، زیاتر، شاتر، ئازاتر، دونیاتر، عاطیر، بیناتر) لەم چامەیەدا ئەلف تەئسیسە، تێ دەخیلە، ڕێ ڕەوییە، سەروا داخراوە، بزوێنی دەخیل کەسرە موختەلەسەیە، یەکێتیی پیتی دەخیل ڕەچاو کراوە، کە شتی وا زۆر پەسەندە، چونکە طێی عاطیریش هەر بەتێ دەخوێنرێتەوە، وا باشە بەتێیش بنووسرێ، بەڵام بزوێنی دەخیل لە (عاطیر)دا جیایە لەوانی تر، گەرچی باشتر ئەوەیە بە(عاطر) وەک (حاکم) بەکەسرە موختەلەسە بخوێنرێتەوە، ئەو کاتە یەکێتیی بزوێنی دەخیل لە هەموویانا ڕەچاو دەکرێ و چامەکە بێ سینادی ئیشباع دەبێ.

٥- سینادی تەوجیە: جیاوازی بزوێنی پیتی پێش ڕەوییە، لە سەروای بێ ریدف و بێ تەئسیسدا، وەک (عِدْ، عُدْ، عَدْ) بەژێری عەین لە یەکەمدا بەبۆری عەین لە دووەمدا و بەسەری عەین لە سێیەمدا، بڕوانە: (بزوێنەکانی سەروا: شەشەم: تەوجیە). سینادی تەوجیە لە هۆنراوی کراوەدا بەنەنگی ناژمێررێ.

٦- جۆرێ تری سیناد ئەوەیە: هاتنی یێی قورسی پێش سەردار، لەگەڵ یێی قورسی پێش ژێردار، وەک (عَلِیّاً) لەگەڵ (کُمَیّاً)دا. ئەم جۆرە سینادە لە چەشنی (قَضَیْنَا - رَضِینا) وایە، بەسەری ضاد و بەژێری ضاد. (بڕ: دەستوورەکانی ریدف/ ٥).

سێیەم: نەنگەکانی پاش ڕەوی:

چوارەم: تەحرید: (بڕ: ٥٢ - تحرید).

(تقفیة: مُقَفًّى): بڕوانە: (٢٢ - البیت - ١٣).

(ذو قافِیَتَیْنْ): جووت سەروا: (١٣٧ - التشریع).

(تێبینی): کورتەیەکی پوختی ئاسان و ڕەوانم لە بابەت تایبەتمەندەکانی سەروای کوردییەوە گەڵاڵە کردووە، بەپشتی خودا لە پاش بەحرەکان دەگەڕێینەوە بۆ سەری.

٢٣٥- (قَلْب): قەلب: ئەوەیە پیتێ دەکرێ بەپیتێ تر، بەپێی چەند یاسایەکی تایبەتی، قەلب جۆری زۆرە، وەک قەلبی هەمزە بەئەلف، قەلبی واوی بزواو و یێی بزواو بەئەلف، قەلبی تەنوین بەئەلف... تاد.

٢٣٥- (مقیّد): سەروای مطلق و مقید لە (القافیە)دا بەدووروودرێژی ڕابوورد.

## بیست و دووهەم: پیتی کاف: حرف الكاف

ک = ٢٠

**٢٣٦- (الكِتَابَةُ العَرُوضِيَّةُ):**

(بڕ: ٧٤ - خَطُّ العروض).

**٢٣٧- (كسرة):**

واتە: ژێر، بەپێی دەستووری تایبەت هەموو بڕگەیەکی کورتی کۆتایی دێڕ و نیوە دێڕی یەکەم، لە هۆنراوی کراوەدا، ئەگەر بزوێنەکەی ژێر بێ، تێر دەکرێ هەتا یێیەکی لێ پەیدا دەبێ، گۆی پێ دەکرێ، بەڵام بەنووسین نانووسرێ (ر: جنس + إشباع).

**٢٣٨- (كسف = كشف):**

کەسف، یان کەشف، کەسف لە زمانی عەرەبیدا واتە: بڕین، کەشف واتە: هەڵماڵین. لە زانستی کێشزانیدا لابردنی پیتی بزواوی کۆتایی پێی (مفعولات)ی خاوەنی وەتەدی بڵاوە، کە پیتی حەوتەمێتی. کەسف لە جۆری عیللەیە بەکەمی، دەچێتە سەر پێی عەرووز و پێی زەرب، لە حەشوی دێڕدا روونادات، دەگوترێ: ضەربی مەکسووف و عەرووضی مەکسووفە، کەسف دەچێتە سەر دەریای سەریع و مونسەریح و بەس. (بڕ: ٤ - نەخشەی عیللەی کەمی هاوبەش/٩).

(مفعولات) لە پاش کەسف - واتە: لە پاش کەسف - دەبێ بە(مفعولا = مستفعل = - - - = مفعولن) لە پاش خەبل و کەسف دەبێ بە(مَعُلاً ـــ فَعِلُنْ = ب ب -).

**٢٣٩- (الإكفاء):**

(بڕوانە: القافیة: عیوب القافیة/١)، دەگوترێ: قافیەی مەکفووئە، واتە: سەروای ئیکفادار.

**٢٤٠- (الكفّ):**

واتە: وازهێنان، لە کێشزانیدا فڕێدانی حەوتەم پیتی وەستاوە، لە سەبەبی سووکی کۆتایی پێی حەوتی، دەچێتە سەر ئەم پێیانە: ١- (مفاعیلن ـــ مفاعیلُ = ب-- ب).

٢- (فاع لاتن ـــ فاع لات = -ب-ب). ٣- (مستفع لن ـــ مستفع لُ = --ب ب).
٤- (فاعلاتن ـــ فاعلات = -ب-ب).

کەف لەم هەشت بەحرانەدا دەبێ ١- طەویل ٢- مەدید ٣- وافیر ٤- رەمەل ٥- خەفیف ٦- موزاریع ٧- موجتەس ٨- هەزەج. کەف لە جۆری زیحاف (گۆڕان)ی تاکە، لە پێی حەشوو عەرووز و زەربدا ڕوودەدا، بەڵام لە زەربی هەزەجدا ڕوونادات. دەگوترێ: بەیتی مەکفووف، عەرووزە مەکفووفە، پێی کەفکراو، تەفعیلەی مەکفووف.

**٢٤١- (کامل):**

دەریایەکی خەلیلییە، دەریای پێنجەمە سەر بەبازنەی دووەمە.

**٢٤٢- (المکانفة):**

(بڕ: ١٨ - البرئ - چوارەم ب - ٥).

**٢٤٣- (الکنایة):**

گەلێ جار لە شیعردا بەضەمیر (ڕاناو) دەگوترێ: کینایە، وەک شاریحی معلقاتی سبعە دەڵێ: کنایە لە (غولها) و (رجامها)دا دەگەڕێتەوە بۆ (الدّیار).

**٢٤٤- (المتکاوس):**

بڕوانە (قافیە/ پیتەکانی سەروا/ جۆرەکانی سەروا بەپێی بزوێنەکانی/ پێنجەم/ متکاوس).

**٢٤٥- (الکان وکان):**

هونەرێکی شیعری گەلییە لە دەریا نوێکانا خوا یار بێ باسی دێ.

## بیست و سێیەم: پیتی لام: حرف اللام

ل = ٣٠

لامی قەڵەو و لامی لەڕ، کە بەعەرەبی پێیان دەگوترێ: لامی مفخم و مرقق، قەڵەو وەک لامی (گوڵ، دڵ، ساڵ، بێڵ، دوڵدوڵ، بولبوڵ) لامی لەڕ وەک (کەل، شەل، کول، فیل، سیل، سۆل، کەللە، گوللە) بڕوانە: (ئەنگەکانی سەروا - تێبینی - آ).

**٢٤٦- (ملحمة):**

داستان، ئەو جۆرە چامە و هۆنراوانەیە کە باسی شەڕوشۆڕ و پاڵەوانان و ئەمانە دەکا. وەک ئەلیازە و ئۆدیسە و شانامەی فیردەوسی.

**٢٤٧- (اللزومیات: لزوم ما لایلزم):**

سەروای زێدەبار، ئیعناتیشی پێ دەگوترێ، ئەوەیە شاعیر لە زەربی چامەدا، یا لە عەرووز و زەربی غەیری چامەدا، زیاد لە پێویست، دەنگێ یا چەند دەنگێ تر، لە سەروادا ڕەچاو بکا، وەک ئەم پارچە هۆنراوەی نالی - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - کە ئەمە سەردێڕەکەیەتی (هەزەج):

لە دوگمەی سوخمە دوێنێ نوێژی شێوان

بەیانی دا سفیدەی باغی سێوان

سەرواکانی تر ئەمانەن: (کێوان، پێوان، پەشێوان، لێوان)، ئەم سەروایانە گشتیان سەروای داخراون لە جۆری موتەرادیف، بەپێی زەرب و جۆری سەرواکان لەم سەروایانەدا، ئەم سێ دەنگە لەسەر هەستیار پێویستە کە لە گشتیاندا دابینیان بکا: حەذو، ئەلفی ریدف، نوونی ڕەوی، کەچی هەستیار لەم سەروایانەدا شەش دەنگی لە گشتیانا دابین کردووە: نوونی ڕەوی، ئەلفی ریدف، حەذو، واو، ێ، ژێری پێش (ێ) دەی بەمە دەگوترێ: زێدەبار، یا لزوم ما لایلزم.

لەم هۆنراوەی مەحویشدا سەروای زێدەبار هەیە:

سەروی ڕەوانە قامەتی لاوی ڕەواندزی

ئافاتی جانە غەمزەیی چاوی ڕەوان دزی

نەبوعەلای موعەرری - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - دیوانێکی گەورەی هەیە بەم ناوە: (لزوم ما لایلزم) هەمووی لەم بابەتەیە، نموونەیێ: ئیلتیزامی هەمزەی بۆردار، لەگەڵ سینی سەردار (بسیط):

يأتِي عَلَى الخَلْقِ إِصْبَاحُ وَإِمْسَاءُ
وكُلُّنَا لِصُــرُوفِ الدَّهْرِ نَسَّــاءُ

سەرواکانی تری ئەم چامەیە ئەم وشانەیە: (أحْسَاءُ - أخِسَّاءُ - خرسَاءُ - خنساءُ - إرْسَاءُ... تاد).

(التـزام): پابەندبوون، دەگوترێ: (التـزام حركـة الدخـيل) واتە: پابەندبوون بەبزوێنی پیتی دەخیلەوە.

(التزام اللين في القوافي): پابەندبوون بەپیتی لینەوە لە سەروادا، لەم شوێنانەدا ڕەچاو کراوە:

یەکەم: لە سەروای موتەرادیفدا، چونکە مەرجی ئەوەیە داخراو و ریدفدار بێ، کە لەم زەریانەدا ڕوودەدا (بڕ: سەروای موتەرادیف):

١- دووەمی مەدید. ٢- سێیەمی بەسیط. ٣- حەوتەمی کامیل. ٤- دووەمی ڕەمەل. ٥- چوارەمی ڕەمەل. ٦- یەکەمی سەریع. ٧- پێنجەمی سەریع. ٨- دووەمی مونسەریح. ٩- دووەمی موتەقارەب. ١٠- چوارەمی تەویل. ١١- پێنجەمی موتەدارەک. ١٢- نۆیەمی بەسیط.

دووەم: لە هەر زەریێکا پیتێکی بزواوی... تاد. (بڕ: چەند نموونەیێ لە هۆنراوی عەرەبی و کوردی ریدفدار - ب/ ١٨).

**٢٤٨- (إلتقاء الساكنين):**

بەگەیشتنی دوو پیتی وەستاو بەیەکتر، لە هەندێ شوێنا دروستە و لە هەندێ شوێنا دروست نییە، ئەمە لە عەرەبیدا وایە، دەنا لە کوردیدا بەیەک گەیشتنی دوو پیتی وەستاو، بگرە پتریش هەر زۆر زۆرە، یەکێ لەو شوێنانەی کە (التقاء الساكنين)ی تیادا دروستە هەموو جۆرەکانی سەروای موتەرادیفە، بڕوانە ئەوێ و بڕوانە جۆرەکانی برگەی کوردی.

**٢٤٩- (لمعت سُيُوفُنَا):**

(بڕ: ٥٤ - حرف - ١٠ - حروف التقطيع).

له هۆنراوی عەرەبیدا ئەم دە پیتە دەبن بەپیتەکانی شیکردنەوە، بەڵام لە کوردیدا ئەگەر تەقطیع بەڕێنووسی کوردی بکرێ، ئەوا (ە)یشیان دەچێتە پاڵ، چونکە بزوێن لە کوردیدا بەپیت دەنووسرێ، بۆر بە(و) ژێر بە(ی) سەر بە(ە).

**٢٥٠- (اللین):**

پیتەکانی مەدد و لین، بڕوانە: (حەرفی مەدد + حەرفی لین).

## بیست و چوارەم: پیتی میم: حرف المیم

م = ٤٠

**٢٥١- (میمیّة):**

ئەو چامەیەیە کە پیتی ڕەوییەکەی میم بێ، وەک: (میمیة زُهَیْر).

**٢٥٢- (مَدّ):**

لەم ماددەیە کە (م د د)ە، ئەم زاراوانە لە کێشدا هەیە:

١- مد المقصور، بۆ ناچاری کێش، بڕوانە: (ناچاریەکان/ ١ + ٢).

٢- بڕوانە: (حەرفی مەدد).

٣- (مدّ الصَّوْت بالقوافي): ئەوەیە لە کۆتایی سەروای کراوەدا، بزوێنی پیتی کۆتایی دێڕ، بەپێی جـۆرەکـەی، سـەرە، یا بۆرە، یا ژێرە، درێژ درێژ بکرێتـەوە و دەنگی پێ بلاوێنرێتەوە.

٤- (مەدید): ناوی دەریای دووەمە، لە بازنەی یەکەم، لە دەریا خەلیلییەکان.

٥- دەریایەکە لە دەریا نوێکان بەپێچەوانەی دەریای مەدیدەوەیە.

**٢٥٣- (المتر):**

(بڕ: التنعیم: نَعَمْ لاَ لا = مَفَاعیلن).

**٢٥٤- (الأمثلة):**

نموونە، وەک ئەو هەموو هەڵبەست و هۆنراوانەی کە لەمەوبەر بەبۆنەکانەوە هێنامانەوە. دەگوترێ: عـەرووز و زەربی مماثل، واتە: هەردوو وەک یەکن، وەک ئەوە هەردوو صـەحیح بن، یا هەردوو مەقطوف بن، یا مەخبوون... تاد.

**٢٥٥- (تحریك میم الجمع):**

(بڕ: ناچاریەکان/١٢).

**٢٥٦- (المَوّال):**

جۆرە بەحرێکی نوێیە لە دەریا نوێکانا دێت.

## بیست و پێنجەم: پیتی نوون: حرف النون

ن = ٥٠

دەگوترێ: قصیدەی نوونییە، واتە: چامەی نوون، کە ئەوەیە پیتی ڕەوییەکەی نوون بێ، وەک ئەم چامەیەی ڕەمزی مەلا مارف (هەزەج):

لە قـاپی بارەگـاهی جـاهتـا وەک بەندە وەسـتـاون:

کەیی و کیسرا، جەم و هەر قەل، نەجاشی و قەیسەر و خاقان

٢٥٧ - (نتفە):

(بڕ: ٢٢ - البیت - ٣ - جۆرەکانی بەیت).

٢٥٨ - (نثر):

پەخشان: قسەی جوانی بێ کێش و سەروا، پەخشان جۆری زۆرە، هەیەتی قسەی ئاساییە، هەیەتی پەخشانی هونەرییە، وەک مەقاماتی حەریری و زۆر لە قسەی نەستەقی پێشینان، لە کوردیدا وەک: لە دوای چووە مەچووە. نوێژکەری نووڕینی، ئیشکەری شیرینی. بڕوانە: (١٢٠ - سجع) لە عەرەبیدا وەک: مَنْ جَدَّ وَجَدْ. مَنْ قَتَلَ قُتِلْ. إذَا نَطَقَ فَكالحِمَارِ، وَإِذَا سَكَتَ فَكالجِدَارِ. مَا قَلَّ وَدَلّ.

(الناثر): پەخشەر: کەسێکە کە پەخشانی هونەری دابنێ.

(النثر الإیقاعي): پەخشانی ترپەیی: پەخشانە ترپە.

٢٥٨ - (النسبە):

نیسبە لە زمانی عەرەبیدا دەستووری تایبەتی خۆی هەیە، بەشێوەیەکی تێکڕایی: ئەوەیە: کە یێیەکی گیراویدار، بلکێ بەکۆتایی ناوەوە، نیشانەی ئەوەیە کە منسوب و منسوب إلیە، پەیوەندییەکی پتەو لە نێوانیاندا هەیە. وەک: (أبوبکر البغدادي). واتە: ئەبوبەکری بەغدادی، لە کاتی وادا مەرج نییە منسوب بەغدادی بێ، وا دەبێ کابرا خەڵکی میسرە، بەڵام ماوەیێ لە بەغا ژیاوە، لەبەر ئەوە بە(البغدادي = بەغایی) ناو دەردەکا.

جا سەبارەت بەم یێی نیسبەتە، لەعەرەبی و لەکوردیدا، بڕیاری کێشی زۆر هەیە. وەک:

١- سووککردنی، واته: یێ گیراویدارەکە بکرێ بەیەک یێی وەستاو.

٢- ببێ بەڕەوی.

٣- ببێ بەپیتی وەصلّ (بڕ: چی پیتێ دەبێ بەڕەوی - ب - یێ - ٨).

٤- بەشێوەی گشتی، یێی نیسبە لە کوردیدا سووکە، وەک: (خانی، نالی، ناری. قەرەداغی، بەرزانی، پێنجوینی، مەلا محەمەدی کوردی، سەعید نەورەسی، عەلائەدین سەجادی، مەلای هەولێری. ئەم جۆرەیان پیتی پێش یێکە لە پێشدا نەبزواو بووە، کە یێکەی پێوە لکاوە بۆی بووە بەژێر ئاوا: (محو = محوی، دهۆک = دهۆکی، کورد = کوردی).

٥- یێی نیسبە لە کوردیدا جۆری تری هەیە، وەک ئەوە پیتی پێشی بزوێنی کورتی (ە)ی هەبێ، وەک: (بانە = بانەیی، بەرزنجە = بەرزنجەیی، سنە = سنەیی، هوانە = هوانەیی، کەرەبچنە = کەرەبچنەیی، تەکیە = تەکیەیی، برایماوە = برایماوەیی... تاد) واتە: بەدوو یێ، یەکەمیان بزواو، دووەمیان وەستاو، دەق بەپێچەوانەی یێی موشەددەدی نیسبەی عەرەبییەوە (بڕ: الروی).

جا پاش ئەوەی بۆرە ئاشناییەکمان لەگەڵ ئەم یێیەدا پەیدا کرد، ئاماژە بۆ بڕیارە کێشییەکانی دەکەین. لەسەر ئەم شێوەیێ:

آ- یێی نیسبە ئەگەر لەبەر ڕاستکردنەوەی کێش سووک کرا و، بوو بەیەک یێی وەستاو، دروستە یێ وەستاوەکەیش، لەبەر ڕاستکردنەوەی کێش، یا لەبەر هەر هۆیێ تری عەرووزی بکرتێ، وەک (الثـلاثيُّ) بەیێی گیراویداری قورس، سووک بکرێ و ببێ بە(الثلاثي) بەیێی وەستاو، وە ئەم یائەیش لەبەر (التقاء الساكنين) بکرتێ. وەک (رەجەز):

وَالسَّالِمَ العَيْنِ الثُّلاثِي اسْماً أَنِلْ
إِتْبَاعَ عَيْنٍ فَاءَهُ بِمَا شُكِلْ

چونکە کێشی لەتی یەکەم بەم شێوەیە شی دەکرێتەوە، یا شیتەڵ دەکرێ:

وَسْسَالِمْ + عَيْنِثْثُلاَ + ثِسْمَنْنَلْ
--ب - + --ب- + -- ب-

ب- یێی سووک، لە عەرەبی و کوردیدا، لەبەر هۆی کێشی، دەکرتێ، بەپێی یاسای

کرتاندنی ئاسایی، مامۆستا نالی دەفەرموێ:

له نالی و شیعر و تەسویدی نەما باس

ئەوەتا (ی)ی وەستاوی کۆتایی (نالی) گەیشتووە بەواوی عەطفی وەستاو و لەبەر ئەوە کرتاوە و ئاوا شیتەڵ دەکرێ: (له نالو شعر = ب --- ب).

ج- یێی وەستاوی نیسبە لە کوردیدا، زۆر جار لەبەر ناچاری، بزوێندار دەکرێ، جاری وا هەیە ئەلفێکیشی لێ زیاد دەکرێ، ئاوا: (محوی = محویا، نالی = نالیا، نامی = نامیا، ناری = ناریا). وەک مەحوی دەفەرمووێ (هەزەج/ وافیر):

کـه نادا (مـەحـویا) دادێ بەحـاڵـێ

بەسی بێ داد و ئاه و ناڵە، با بەس.

(بڕ: ٥٤ - حرف - ١).

٢٥٩- (النشید):

نەشید واتە: سروود، دەگوترێ: نەشیدی وەطەنی، واتە: سروود = گۆرانی نیشتمانی، دەگوترێ: نەشیدی دینی = سروودی ئایینی = گۆرانی ئایینی.

٢٦٠- (نون الإنشاد):

پێشی دەگوترێ نوونی (نەشید و تەرەننوم)، وەک: پێشی دەگوترێ: نوونی صەرف، کە ئەوەیە: شاعیر لە کۆتایی سەرواداا، نوونێکی وەستاو زیاد دەکا، بۆ درێژکردنەوەی ئاواز. وەک (تەویل):

أفَـاطِمُ مَـهْلاً بَعْضَ هذَا التَّـدَلُّلنْ
وَإِنْ كُنْتِ أزْمَعْتِ صَرْمِي فَأَجْمِلِنْ

٢٦١- (البأو والنَّصب):

(بڕ: ٢٢ - البیت - ٣ - جۆرەکانی بەیت/ ٢ - بەیتی وافی).

٢٦٢- (رباعي منطق):

(بڕ: ٩٧ - الرباعی).

٢٦٣- (التناظر):

هاوشوێنی، هاوجێیی.

### ٢٦٤- (نظم): النظم: المنظوم:

هۆنراو: هۆنراوه: هەڵبەست. النظم التعليمي: هۆنراوی فێرکاری. بڕ:(١٤٠-الشعر).

الناظم: هۆنەر. بوێژ. النظام: سیستەم، وەک: نظام القافية: سیستەمی سەروا.

نظام أوزان الشعوب والامم: سیستەمی کێشی نەتەوەکان.

### ٢٦٥- (التنعيم):

کردارێکی کێشیی قیاسییە، لە پێش دانانی عەرووزدا، لە لایەن ئەحمەدی کوڕی خەلیلەوە، کێشی بەحرەکانی پێ دیاری دەکرا، ئەگەر لەنگی و لاسەنگییەک لە شیعرەکاندا ببوایە، لە ڕێگەی تەنعیمەوە دەیاندۆزییەوە و دەیانزانی. بۆیە پێی دەگوترێ: (تنعيم) چونکە (نَعَم)ی زۆر تیادا دەگوترێ.

لەسەر ئەم شێوەیە دەتوانرێ نەخشەی پێیە کێشییەکان بکێشرێ:

١- (نَعَمْ لا = فعولن = ب--).

٢- (نَعَمْ لاَ لاَ = مفاعيلن = ب---).

٣- (لاَ نَعَمْ لاَ = فاعلاتن = -ب--).

٤- (لاَ نَعَمْ = فاعلن = -ب-).

٥- (لاَ لاَ نَعَمْ = مستفعلن = --ب-).

٦- (نَعَمْ نَعَ لاَ = مفاعلتن = ب-ب ب-).

٧- (نَعَ لاَ نَعَمْ = متفاعلن = ب ب-ب-).

٨- (لاَ لاَ لاَ نَ = مفعولات = ---ب).

جا پاش ئەوەی کە لەسەر شێوەی تەنعیم ترازووی پێیە سەرەکییەکانمان زانی، دەتوانین کێشی دەریاکانیش دیاری بکەین، وەک تەویل:

نَعَمْ لاَ. نَعَمْ لاَ لاَ. نَعَمْ لاَ. نَعَمْ لاَ لاَ

نَعَمْ لاَ. نَعَمْ لاَ لاَ. نَعَمْ لاَ. نَعَمْ لاَ لاَ

فعولن. مفاعيلن. فعولن. مفاعيلن

فعولن. مفاعيلن. فعولن. مفاعيلن

وە هەروەها بەحرەکانی تریش.

**٢٦٦- (النغمة):**

ئاواز.

**٢٦٧- (النَّفَاذ):**

(بڕوانە: بزوێنەکانی سەروا: قافیە: دووەم: نەفاذ).

**٢٦٨ - (النقص):**

نەقص لە جۆری زیحافی مورەککەبە، بریتییە لە عەصب و لە کەف، لە یەک پێدا، تەنیا دەچێتە سەر دەریای وافیر، ئاوا: بەعەسب (مفاعلتن = ب-ب ب-) دەبێ بە(مفاعیلن = ب ---) بەکەفی پاش عەسبیش دەبێ بە(مفاعیل = ب--ب) بەبێ نوون، ئەوجا بەو پێیە دەگوترێ: پێی مەنقووص: تفعلە منقوصە. لە ناواخنی بەیتیشا نەقص ڕوودەدا. (بڕ: نەخشەی/ ٢ زیحافە لێکدراوەکان/ ٤ - نقص) + (العلّة).

**٢٦٩- (النفر):**

(بڕ: الذلل والنفر والحُوش) لە ژمارە (٦٠)دا) لە پیتی ذالدا.

**٢٧٠- (النقل):**

گواستنەوە، وەک دەڵێین: (متفاعلن) بەوەقص دەبێ بە(متفاعلن = --ب-) لەبەر ئەوەی لە کێشە صەرفییەکانی عەرەبیدا، کێشی (متفاعلن = --ب-) نییە، نەقڵ دەکرێ واتە دەگوێزرێتەوە بۆ سەر کێشی (مستفعلن = --ب-)... ئیتر هەروا.

**٢٧١- (النهك):**

(بڕ: ٢٢- البیت - ٣- جۆرەکانی بەیت- ٦- بەیتی مەنهووک).

**٢٧٢- (النوع):**

نەوع: جۆر: چەشن، وەک: أنواع الشعر: (بڕ: الشعر). یا وەک: (أنواع التنوین): (بڕ: القافیة: چی پیتێ دەبێ بەڕەوی -ز- تنوین). یا وەک: (أنواع القَصِیدة). چامە جۆری زۆرە، بەپێی پیتی ڕەوی لە عەرەبیدا دەبێ بەبیست و هەشت جۆرەوە. لە کوردیدا ئەم پێنج پیتەیش دەچێتە سەریان: (پ، چ، ژ، ڤ، گ) دەبن بە(٢٨ + ٥ = ٣٣ جۆر). یا وەک: (انواع القوافي).

٢٧٣- (نون): نون الإنشاد:

(- إنشاد). نون الصرف: نون الإنشاد. نون التنوين: (بڕ: القافيه: چی پیتێ دەبێ بەرەوی - ز - تنوین). نون التثنیه، نون الجمع.

المنوّن: پیتی تەنویندار، لە تەقطیعدا دادەنرێ بەدوو پیت ئاوا: (زیدٌ = زیدنْ) بەبۆری دال (زیدٍ = زیدِنْ) بەژێری دال (زیداً = زَیْدَا) بڕوانە: سەرباسی نووسینی عەرووزی.

تنوین المنون: ئەوەیە کە سەروا، منوّن و غەیرە مونەووەنی نوونێکی وەستاوی لێ زیاد بکرێ، وەک لە نوونی إنشادا ڕابورد. (بڕ: ناچاریەکان/٧).

## بیست و شەشەم: پیتی واو: حرف الواو

و = ٦

**٢٧٤- (واو):**

واو پیتێکی نەرمە، جۆری زۆرە، بەشێوەی گشتی هەموو واوێ حەرفی عیللەیە، ئەگەر خۆی وەستاو بێ و بزوێنی پێشی لە جۆری خۆی بێ، واتە: بۆر بێ، وەک: (دۆم، دوو، دوور، قصور) ئەوە پێشی دەگوترێ: پیتی مەدد، بەڵام ئەگەر خۆی وەستاو بێ و بزوێنی پێشی لە جۆری خۆی نەبێ، وەک ئەوە: سەر بێ، یا ژێر بێ، وەک: (حَوْل) و (سێو) ئەوە حەرفی لینە.

بڕیاری کێشی لە بارەی واوە، کۆمەڵێکی لە باسی سەروادا ڕۆیشت، وەک: واوی ریدف و واوی جەمع و واوی ڕاناو... تاد. واوی تەرەننوم (بڕ: ١١٠ - ترنم + حرف...).

**٢٧٥- (المتّئد):**

دەریایەکە لە دەریا نوێکان، سەر بەبازنەی چوارەمە، کە بازنەی موشتەبەهە.

**٢٧٦- (الوتد):**

بڕ: برگەی عەروضی: دووەم: وەتەد.

**٢٧٧- (الوثب):**

(بڕ: ٨٤ - التخمیع).

**٢٧٨- (التوجیة):**

(بڕ: قافیە: بزوێنەکانی سەروا: شەشەم).

**٢٧٩- (وحدة):**

یەکێتی، وەک وەحدەتی قافیە، واتە: یەکێتیی سەروا لە چامەدا، بڕوانە: (٢٢ - البیت/ جۆرەکانی بەیت - ١٢ - بیتی مُوَحَّد).

**٢٨٠- (المواربة):**

هونەرێکی تری هۆنراوە، پەیوەندی بەبەدیعەوە پترە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە پەیوەندی

بەبێژە (لفظ)ەوە هەیە، پەیوەندی بەکێشیشەوە هەیە.

مووارەبە: ئەوەیە کە شاعیر شیعری وا دابنێ، بەگۆڕینی پیتێ، یا بەگۆڕینی نوختە و سەر و بۆر، بۆ زەم و بۆ مەدح بشێ. وەک دەڵێن: جارێ ئەبو نەواس دەچێ بۆ لای هاروونە ڕەشید، کە ڕێگە دەخوازێ، ڕێگەی نادا بچێ بۆ لای، خەلیفە کەنیزەکێکی جوانی دەبێ، ناوی (خالصە) دەبێ، گەردانەیەکی گرانبەهای پێ خەڵات دەکا، جا ئەبو نەواس بەم دێڕە گلەیی لە هاروونە ڕەشید دەکا و لەسەر دەرگاکە دەینووسێ: (متقارب):

لَقَدْ ضَاعَ شِعْرِي عَلَى بَابِكُمْ    كَمَا ضَاعَ عِقْدٌ عَلَى خالصة

واتە: شیعری من لە دەرباری تۆدا بەزایە چووە، وەک چۆن ئەو گەردانەی کە خەڵاتت کردووە بەخالصە بەزایە چووە، چونکە خالصە شایانی ئەو خەڵاتە نییە. جا کاتی خەلیفە لەسەر ئەم پرکێشییە موحاسەبەی دەکا، دەڵێ: ئەوە (ضاع) نییە، بەڵکو (ضاء)ەیە، کە بەواتا: شەوق دەداتەوەیە، ئیتر واتای دێڕەکە بەم گۆڕانکارییە لەزەمەوە دەبێ بەمەدح. (بڕ: ١٤٧ - تصحیف).

٢٨١- (الوزن):

کێش. وزن الشعر: کێشی هەڵبەست: المیزان والموزون.

٢٨٢- (المتّسق):

واتە: بەحری موحدەث (بڕ: محدث).

٢٨٣- (التوشیح: الموشح):

تەوشیح و مووەششەح جۆرە هۆنراوێکی نوێباوە، لە دەریا نوێکانا - خوا یار بێ - قسەی لێ دەکرێ.

٢٨٤- (الوصل):

(بڕ: القافیة: پیتەکانی سەروا: الوصل). البیت الموصول: (بڕ: ٢٢ - البیت - ٣ - جۆرەکانی بەیت/ ٧ - بەیتی مودەووەر... تاد).

٢٨٥- (موضوع):

مەوضووع - بابەت -ی زانستی عەرووز، لە هەموو زمانێکا، شیعرە بەزمانی ئەو گەلە. واضیعی عیلمی عەرووز: دانەرەکەی خەلیلی کوڕی ئەحمەدی فەراهیدییە.

٢٨٦- **(الإيطاء):**

(بڕ: نەنگەکانی سەروا، لە (القافية)دا: الإيطاء).

٢٨٧- **(الوافر):**

ناوی دەریایەکی خەلیلییە، بەیتی مەوفوور.

٢٨٩- **(الوافي):**

(بڕ: ٢٢ - البيت - ٣ - جۆرەکانی بەیت - ٢ -).

٢٩٠- **(الوقص):**

لە جۆری زیحافی تاکە، تەنیا دەچێتە سەر (متفاعلن) لە بەحری کامیلدا، بریتییە لە لابردنی پیتی دووەمی بزواوی پێی (متفاعلن) دەبێ بە(مفاعلن) وەقص لە حەشوو لە عەرووز و لە زەربدا ڕوودەدا، وەک (کامیل):

يَذُبُّ عَنْ حَرِيمِهِ بِسَيْفِهِ　　　وَرَمْحِهِ وَنَبْلِهِ وَيَحْتَمِي

مفاعلن + مفاعلن + مفاعلن　　مفاعلن + مفاعلن + مفاعلن

ئەو پێیەی، یا ئەو بەیتەی وەقصی تیا بێ پێی دەگوترێ: موقوص.

٢٩١- **(توافق الأفكار):**

ڕێ دەکەوێ دوو هەستیار بەرێکەوت تەعبیر لە بابەتێ دەدەنەوە بەشێوەیەکی زۆر لە یەکەوە نزیک، بەمە دەگوترێ: (توافق الأفكار).

٢٩٢- **(الإيقاع):**

تریە: واتە: دانانی ئاوازی گۆرانی بەپێی شوێن و کێشی.

٢٩٣- **(الوقف):**

وەقف لە زمانا مانای وەستانە، لە زاراوی کێشدا بەدوو واتا هاتووە، یەکەم: بەواتا ئێست، ئەم بابەتەیان لە ناچاریەکاندا، لە ژمارە (١٠٢)دا، ڕابورد. دووەم: وەقف لە جۆری عیللەی کەمی هاوبەشە، بریتییە لە وەستاندنی دوا پیتی بزواوی وەتەدی بلاوی (مفعولات)ی ساغ و (مفعلات)ی مەطوی. لە مەشطوری سەریعا (مفعولات =---ن)

بەوەقف دەبێ بە(مفعولاتْ =---ْ) بەتێی وەستاو. هەروا (مفعولات) بەتێی بۆردار لە مەنهووکی مونسەریحدا بەوەقف دەبێ بە(مفعولات) بەتێی وەستاو، دەگوێزرێتەوە بۆ (مفعولان = ---ْ). لە کێشی سەریعا (مفعلات)ی مەطوی بەتێی بزواو، بەوەقف دەبێ بە(مفعلات) بەتێی وەستاو، دەگوێزرێتەوە بۆ (فاعلان = -ب-ْ) لە مەنهووکی مونسەریحا (مفعولات) بەتێی بۆردار، بەخەبن و بەوەقف دەبێ بە(مفعولات = ب--ْ) دەگوێزرێتەوە بۆ (فعولان = ب--ْ). بڕوانە: (نەخشەی/ ٤ عیللەی کەمیی هاوبەش/٨). دەگوترێ: عەرووز، یا زەرب، یا بەیت، یا پێی موقوف.

**٢٩٤- (التولید):**

(بڕ: ١٤ - بحر - ٦). (المولدون):

(تولید بحور جدیدة):

**٢٩٥- (المواليا):**

(بڕوانە: ٢٥٦ - الموّال).

## بیست و حەوتەم: پیتی هێ: حرف الهاء

ﻫ = ٥

هاء لەو ناوانەی ئەلفوبێیە کە قەصریان دروستە. هێ جۆری زۆرە، وەک هێی ئێست (وەقف) و هێی وەصڵ و هێی سەکت و هێی تەئنیث و هێی ڕاناوی تاکی کەسی سێیەم و هێی ڕاناوی تێرکراو (مشبع) بۆ ناسینی ئەم جۆرە هێیانە بڕوانە ئەم شوێنانە: (٢٣٤ - قافیە - دووەم: پیتی وەصڵ - د - هێی وەصڵ) و (نووسینی عەرووزی/٢ / ٦) + (ناچاریەکان/ ١٤، ١٥، ١٠٢/ ١٠/ ١٢).

### ٢٩٦- (هەزەج):

دەریایەکی خەلیلی زۆر باوە لە کوردیدا، بەپێچەوانەی عەرەبییەوە، چواری و شەشی و هەشتی و مەجزووء و مەشطور و مەنهووک و تامی هەیە. بڕوانە: بەحری هەزەج.

### ٢٩٧- (استهلال القصیدة):

دەستکردن بەسەردێڕی چامە.

### ٢٩٨- (الهمزة):

بۆ ئەحکام و بڕیارەکانی هەمزە بڕوانە: (١٠١ - چۆنێتیی مامەڵەکردن لەگەڵ هەمزە... تاد - لە ناچاریەکاندا). هەمزە دەبێ بەڕەوی. هەمزە تەخفیف دەکرێ و دەبێ بەڕیدف.

قەصیدەی هەمزییە: چامەی هەمزییە، واتە ڕەوییەکەی هەمزە بێ، وەک ئەم چامەیەی موتەنەببی کە سەردێڕەکەی ئەم دێڕەیە (کامل):

عَذَلَ العَوَاذِلُ حَوْلَ قَلْبِ التائِهِ    وَهَوَى الأحِبَّةِ منه في سَوْدَائِهِ

بۆ زانینی زۆرینەی بڕیارەکانی هەمزە بڕوانە ناچاریەکان: (١٠١، ١، ٢، ٩، ١٠، ٤٥، ٩٩) + (نووسینی عەرووزی/ ٢ - ئەو پیتانەی کە لە نووسینا دەکرتێن).

## بیست و هەشتەم: پیتی یێ

ی = ١٠

**٢٩٩- (یاء):**

ناوی پیتی بیست و هەشتەمە لە ئەلفوبێتی عەرەبی. حەرفی عیللەیە، بڕوانە پیتەکانی سەروا، ڕەوی، وەصڵ، خەروج، جینسی حەرەکەی یێ ژێرە، کاتێ لە کۆتایی وشەوە بێ پێی دەگوترێ یا ء متطرفە. بڕیاری کێشی لە بارەیەوە زۆر زۆر لە پێشەوە لە ناچاریەکاندا و لە (نیسبە)دا زۆریان ڕۆیشت. بڕوانە: (٢٥٨ - النسبة + التقاء الساکنین + ریدف + ٢٥٠ - اللین + ناچاریەکان - ١٢، ١٣، ٤٦، ٦٦، ٦٧) + (نووسینی عەرووزی/ ٢ - ئەو پیتانەی کە لە نووسینا دەکرتێن - ٣ - پێی وەستاو...).

**٣٠٠ - (تێبینی):**

١- مەبەستی سەرەکی لەم فەرهەنگۆکی زاراوە عەرووزییانە ئەوپەڕی ئاسانکاری و خۆش بەدەستەوە هاتنە، ئەگەر دووبارە و سێبارەیش ببنەوە قازانجی هەیە، زیانی نییە، ئێستایش بەپشتی خودا، دەست دەکەین بەبەشی جەوهەری لەم پەڕاوە.

٢- دەپێکان ئەم گۆڕانکارییانەیان بەسەردا دێ: ١- (فعولن ـــ ١- فعول: مەقبوز. ٢- فعول: مەقسوور. ٣- فعلن: ئەثلەم. ٤- فعل: ئەثرەم. ٥- فعل: مەحذوف. ٦- فع = فل: ئەبتەر).

٢- (فاعلن ـــ ١- فعلن: مەجنوون. ٢- فعلن: مەقتووع).

٣- (مستفعلن ـــ ١- مفاعلن: مەخبون. ٢- مفتعلن: مەتوی. ٣- فعلتن: مخبول. ٤- مستفعل: مكفوف. ٥- مفاعل: مشكول. ٦- مفعولن: مقطوع. ٧- فعولن: مەکبول: مەخبونی مەقطوع. ٨- مستفعلان: موذال. ٩- مفاعلان: موذالی مەخبون. ١٠- مفتعلان: موزالی مەتوی. ١١- فعلتان: موذالی مەخبونی مەتوی).

٤- (مفاعیلن ـــ ١- مفاعلن: مەقبوز. ٢- مفاعیلُ: مەکفوف. ٣- مفاعیلْ: مەقصور. ٤- فعولن: محذوف. ٥- مفعولن: ئەخرەم. ٦- فاعلن: ئەشتەر. ٧- مفعول: ئەخرەب).

٥- (فاعلاتن ـــ ١- فعلاتن: مەخبون. ٢- فاعلات: مەکفوف. ٣- فعلات: مەشكول.

٤- فاعلان: مەقصورە - مەخبونی مەقصور: فعلان. ٦- فاعلن: مەحذوف.
٧- فعلن: مەحذوفی مەخبون. ٨- فعلن: ئەبتەر. ٩- مفعولن: مشعث.
١٠- فاعلیان: موسەببەغ. ١١- فعلیان: موسەببەغی مەخبون).

٦- (مفاعلتن ـــ ١- مفاعیلن: مەعصوب. ٢- مفاعلن: مەعقول. ٣- مفاعیل: منقوص. ٤- فعولن: مەقطوف. ٥- مفتعلن: ئەعضەب. ٦- مفعولن: ئەقصەم.
٧- فاعلن: ئەجەمم. ٨- مفعول: ئەعقەص).

٧- (متفاعلن ـــ ١- مستفعلن: مضمر. ٢- مفاعلن: موقوص. ٣- مفتعلن: مخزول. ٤- فعلاتن: مقطوع. ٥- مفعولن: مقطوعی مضمر. ٦- فعلن: احذ.
٧- فعلن: احذی مضمر. ٨- متفاعلان: ساخی موزال. ٩- مستفعلان: موضمەری موذال. ١٠- مفاعلان: مەوقوصی موذال. ١١- مفتعلان: مذالی مخزول.

١٢- متفاعلاتن: ساخی مرفل. ١٣- مستفعلاتن: مضمری مرفل. ١٤- مفاعلاتن: موقوصی مرفل. ١٥- مفتعلاتن: مخزولی مرفل).

٨- (مفعولات ـــ ١- فعولات: مەخبون. ٢- فاعلات: ساخی مەتوی. ٣- فعلات: مەخبول. ٤- مفعولان: موقوف. ٥- فعولان: مخبونی موقوف. ٦- فاعلان: مطوی موقوف. ٧- مفعولن: مكسوف. ٨- فعولن: مخبونی مكسوف. ٩- فاعلن: مطوی مكسوف. ١٠- فعلن: مخبولی مكسوف. ١١- فعلن: أصلم).

٩- (مستفع لن ـــ ١- مفاعلن: مەخبون. ٢- مستفعل: مەكفوف. ٣- مفاعل: مەشكول. ٤- فعولن: مەخبونی مەقصور.

١٠- (فاع لاتن ـــ ١- فاعلات: مكفوف).

جا لە کۆتایی ئەم تێبینییەدا دەڵێم: مەرج نییە، کە ئەم پێ فەرعییانە، لە هەموو جێگەیەکا، یا لە هەموو بەحرێکا، کە پێی ئەصڵییەکانی تیا بێ، کە ئەم پێ فەرعییانە دروست بن، بەڵکو دروستبوونی ئەم پێ فەرعییانە بەپێی ڕێسایەکی زانراوە، کە لە دەریاکاندا ڕوون کراوەتەوە.

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمنِ الرَّحيم

٩/١٢/٢٠٠١ = ٢٤ ڕەمەزان/ ١٤٢٢ھ

بەپشتی خودای گەورە و سەروەر، لەم بەشەدا، پوختەیەکی بەسوودی زانستی عەرووز دەنووسین، لەسەر ئەو شێوەیەیەی کە دارێژەری ئەم زانستە: خەلیلی کوڕی ئەحمەدی فەراهیدی دایناوە. وە لە هەموو کێشێکی سەرەکی خەلیلیدا بەپێی توانا، ئاماژە بۆ ئەوە دەکەین، کە کەڵە شاعیرە دێرینەکانمان، چۆن چۆنی عەرووزیان لە چامە و هۆنراوەکانیاندا پیادە کردووە، بەئومێدی ئەوەی کە نەوەی نوێ، بەئاسانی و بەڕەوانی سوود و بەهرە لەم زانستە گرنگە وەربگرن.

## پێشەکی

### زیحاف و عیللە: گۆڕان و گۆڕین لە هەڵبەستدا:

شیعری عەرووزی کۆنی عەرەبی سەر بە(١٦) شازدە بەحرە، ئەم بەحرانە لە پێنج بازنە دروست بوون، هەر بەحرەی چەند عەرووزێک و هەر عەرووزەی چەند زەربێکی هەیە، کە دەکەنە (٣٦) سیی و شەش عەرووز و (٦٦) شەست و شەش زەرب. لە ڕاستیدا زۆر شت لە زانستی عەرووز، بەتایبەتی یاسا گرانەکانی، بۆ شاعیر ئەو سوودەی نییە، بەڵکو نەظەرییە، زیاتر پەیوەندی بەکێشزانەکانەوە هەیە، هەتا هەستیار و هۆنەرەکان.

جا هەتا هەستیار بتوانێ شیعری ڕەوانی کێش ساف دابنێ، دەبێ لە پێش پێشدا، زۆر بەباشی فێری ئەم زاراوانە ببێ:

١- پێ (تەفعیلە): چییە، وە چەند پێی هەیە، وە پێ لە چی دروست دەبێ؟ وە ئایا ئەو پێیانە بگۆڕێن یا نەگۆڕێن، وە ئەو گۆڕانکارییانە چین و ناویان چییە کە بەسەر ئەم پێیانەدا دێن؟ وە تەقطیع - واتە: شیکردنەوە: شیتەڵ: پارە پارەکردن: پارچە پارچەکردن - چۆنە و چییە و ڕۆڵی چییە لە دۆزینەوە و دیاریکردنی پێدا؟ دیارە هەر کاتێ جۆری پێ و ژمارەی و چۆنێتی و گۆڕانکارییەکانی ناوی زانران، ئیتر یەکسەر دەزانرێ ئەو هۆنراوە سەر بەچی دەریایەکە (بڕوانە: بڕگەی عەرووزی +٥- أصول التفاعيل + ٢٢ - البيت).

٢- جا کاتێ زانیمان ئەو پێیانەی کە دێڕە هەڵبەستیان لێ دروست دەبێ دە پێن، وە ئەم دە پێیانە بەهۆی دووبارەبوونەوە و بەهۆی تێکەڵ بوونی دوو جۆریانەوە و بەهۆی ئەو گۆڕانکارییانەی کە دێ بەسەر ئەم دە پێیەدا، بەهۆی ئەم فاکتەرانەوە بنچینەی

دروستبوونی بەحرەکان دروست دەبن، با ئەوەیش بزانین کە ئەو گۆڕانکارییانە دوو جۆرن: یەکەم زیحاف، بەکوردی پێی دەڵێین: گۆڕان، دووەم: عیللە، بەکوردی ناوی دەنێین: گۆڕین، بەهەردوو لایش دەڵێین: گۆڕانکاری. (بڕوانە: ١١٤ - زحاف + ١٨٥ - العلّة).

**یەکەم: زیحاف (گۆڕان) دوو جۆری هەیە:**

زیحافی موفرەد: زیحافی تاک: گۆڕانی تاک. وە زیحافی لێکدراو: گۆڕانی لێکدراو: زیحافی موزدەوەج. بنەڕەت لە زیحافدا ئەوەیە لە سەبەبدا بێ، لە وەتەددا نەبێ، لە حەشو (ناوەخن)دا بێ، لە عەرووز و زەربدا نەبێ، بگۆڕ بێ و نەگۆڕ نەبێ، بەڵام جۆرێ زیحاف هەیە دەچێتە سەر عەرووز و زەرب و لازم و نەگۆڕن، پێیان دەگوترێ: (الزحاف الجاري مجري العلّة): (بڕ: نەخشەی/٦).

آ- گۆڕان - زیحاف -ی تاک: ئەوەیە کە گۆڕان بەسەر یەک سەبەبدا لە ناو پێدا بێت، وەک (فاعلاتن) بەخەبن ببێ بە(فعلاتن = ب ب--). ئەمەیش لە دواوە خشتەی زیحافی تاکە.

(تێبینی):

١- زیحاف پەیوەندی بەتەفعیلەوە هەیە، نەوەک بەبەحرەوە، واتە: بەبوونی زیحاف لە پێیەکانی زەربی بەحرێکا، ئاسانکاری لەو زەربەدا بۆ هەستیار دروست دەبێ، مەودای تەعبیر و هۆنینەوە خۆشتر دەبێ، چونکە گوشراو گوشاد دەبێ، تەسک واڵا دەبێ، کۆت و قەیدەکان کەمتر دەبن، وە زۆرینەی کات زیحاف زەربی جیا جیا دروست ناکا، وە بەحری تایبەت دیاری ناکا، بەڵکو زیحافی وا هەیە، لە پێنج جۆرە پێدا ڕوودەدا، لە دە بەحری جیا جیادا ڕوودەدا، وەک (خەبن) بڕوانە: (نەخشەی/ ١-١).

٢- ئەم زیحاف و عیللەتانە هەموو موصطەلەح و فەرەضین، کاتێ کێشزانەکان بەپێی واقیعی کێشی بەحرەکان، بڕیاری بازنەی کێشییان بۆ دان، وایان بڕیاردا، کە پێکانی ئەو بازنانە جۆرە کێشێکی تایبەتی دیارییان هەیە، وە هەر بەحرێ پێی تایبەتی خۆی هەیە و سەر بەبازنەیەکە و ئەو پێیانە لە بازنەکاندا ساغن، بەڵام هەر گۆڕانکارییەکیان تیادا ڕوویدات، دەبێ بۆ کۆنترۆڵ کردنی بەحرەکان ناو و زاراوێکی تایبەتی بۆ دابنرێ، ئیتر لەم بۆچوونەوە ئەم هەمکە ناو و زاراو و یاسا کێشییانە سەریان هەڵدا و کەوتنە دەم خەڵک و چوونە ناو کتێبان و پەخشەوەبوون لە جیهاندا.

١- نەخشەی زیحافە تاکەکان (جدول الزحاف المفرد = البسيط)

| ژمارە | ناو | پێناسە | پێکە پێش زیحافەکە | پێکە پاش زیحافەکە | پێ نوێکە لە کێشەکەدا | ناوی ئەو بەحرەی کە لە گۆڕانەکە جووەتە سەر پێیەکانی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١- | خەبن (بڕ:خبن) | کورتکردنەوەی یەکەم سەبەبی سووکی پێ، تا یەک بڕگەی کورتی دەمێنێ ناوا (- ـــ ب). | ١- مُسْتَفْعِلُنْ<br>٢- مستفع/لُنْ<br>٣- فاعلن<br>٤- فاعلاتُنْ<br>٥- مَفْعُولاتُ | ١- مُتَفْعِلُنْ<br>٢- متفع/لُنْ<br>٣- فَعِلُنْ<br>٤- فَعِلاتُنْ<br>٥- مَعُولاتُ | ١- مَفَاعِلُنْ<br>٢- مَفَاعِلُنْ<br>٣- فَعِلُنْ<br>٤- فَعِلاتُنْ<br>٥- مَفَاعِيلُ | ١- لە رەجەز و بەسیط و کامیل و سەریع و مونسەریح دا.<br>٢- لە خەفیف و موجتەس دا.<br>٣- لە مەدید و بەسیط و موتەدارەک و رەمەلدا(×)<br>٤- لە مەدید و رەمەل و خەفیف و موجتەثدا<br>٥- مَفَاعِیلُ. لە مونسەریح و موقتەضەبدا<br>(+) بڕوانە (نەخشەی/ ٦-١٣) |
| ٢- | تەی (طەی) | بڕتییە لە فڕێدانی چوارەم پیتی پێ، یا بەرابەرەکەی لە کوردیدا، بەمەرجێ دووەمی سەبەبی سووک بێ | ١- مُسْتَفْعِلُنْ<br>٢- مفعولاتُ | ١- مُسْتَعِلُنْ<br>٢- مَفْعُولاتُ | ١- مُفْتَعِلُنْ<br>٢- فاعِلاتُ | ١- لە رەجەز و بەسیط و مونسەریح و موقتەزەب و کامیل دا.<br>٢- لە سەریع و مونسەریح و موقتەضەبدا |
| ٣- | ئیضمار (ئیزمار) | بڕتییە لە وەستاندنی دووەم پیتی بزواوی پێی (مُتَفاعِلُنْ) | ١- مُتَفَاعِلُنْ | ١- متفاعلن | ١- مستفعِلُنْ | ١- لە کامیل دا و بەس. |
| ٤- | عەسب (عەصب) | بڕتییە لە وەستاندنی پیتی پێنجەمی پێی (مُفَاعَلَتُنْ) لە وافیردا و بەس | ١- مُفَاعلَتُنْ | ١- مفاعلْتُنْ | ١- مَفَاعیلن | ١- لە وافیردا و بەس. |
| ٥- | قەبز (قبض) | فڕێدانی پیتی پێنجەمی پێیە، کە دووەمی سەبەبی سووک بێ | ١- فَعُولُنْ<br>٢- مَفَاعِیلُنْ | ١- فَعُولُ<br>٢- مَفَعِلُنْ | ١- فَعُولُ<br>٢- مَفَاعِلُنَ | ١- لە تەویل و موتەقاربدا<br>٢- لە طەویل و هەزەج و موضاریع دا |
| ٦- | عەقل | لابردنی پیتی دووەمی سەبەبی قورسی مفاعلتن لە وافیردا | ١- مُفَاعَلَتُنْ | ١- مُفَاعَتُنْ | ١- مفاعِلُنْ | ١- لە وافیردا و بەس. |
| ٧- | وەقص | لابردنی پیتی دووەمی بزواوی (متفاعلن) | ١- متفاعلن | ١- مفاعلن | ١- مَفَاعِلُنْ | ١- لە کامیل دا و بەس. |
| ٨- | کەف | لابردنی پیتی حەوتەمی پێ، بەمەرجێ دووەمی سەبەبی سووک بێ | ١- مستفع لن<br>٢- مفاعیلن<br>٣- فاعلاتن<br>٤- فاعِ/لاتن | ١- مستفع لُ<br>٢- مَفَاعِیلُ<br>٣- فَاعلاتُ<br>٤- فاعِ لاتُ | ١- مستفعلُ<br>٢- مَفَاعِیلُ<br>٣- فاعلاتُ<br>٤- فاعلاتُ | ١- لە خەفیف و موجتەثدا<br>٢- لە طەویل و هەزەج و موضاریع و وافیردا(*)<br>٣- لە رەمەل و خەفیف و موجتەس و مەدیددا<br>٤- لە موضاریع دا |

ب- گۆڕان -زیحاف-ی لێکدراو: ئەوەیە دوو زیحافی سادە پێکەوە لە یەک پێدا کۆببنەوە. زیحافی لێکدراو، یان جووت زیحاف، ئەم چوارەن: ١- خەبل. ٢- خەزل. ٣- شەکل. ٤- نەقص. بەوێنە (مستفعلن) بەخەبن دەبێ بە(مفاعلن) بەطەییش لە پاش خەبن دەبێ بە(فعلتن) کە پێی دەگوترێ مەخبوول، ئەوەتا دوو زیحافی تاکی وا تیادا: (خەبن + تەی) ئیتر لە (مستفعلن)ەوە بووە بە(فعلتن).

٢- نەخشەی زیحافە لێکدراوەکان (جدول الزحاف المركب = المزدوج)

| ژمارەی لێکدراو | ژمارەی سادەکان | ناوی سادەکان | ناوی لێکدراو | پێناسە | پێکە پێش گۆڕانەکان | پێکە پاش گۆڕانەکان | پێ نوێکە لە کێشەکەدا | ناوی بەحری پێیەکان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١- | ١<br>٢ | خەبن<br>تەی | خەبل | کۆبوونەوەی خەبن و تەی لەیەک پێ دا | ١- مُسْتَفْعِلُنْ<br>٢- مَفْعُولَاتُ | ١- متعلن<br>٢- مَعُلَاتُ | ١- فَعِلَتُنْ<br>٢- فَعِلَاتُ | ١- بەسیط و رەجەز و سەریع و مونسەریح<br>٢- مونسەریح و سەریع (بڕ: کسف. نەخشەی٤/-٧) |
| ٢- | ٣<br>٢ | ئیضماز<br>تەی | خەزل (جەزل) | کۆبوونەوەی ئیزمار و تەی | ١- متفاعِلُنْ | ١- مُتْفَعِلُنْ | ١- مُفْتَعِلُنْ | ١- لە کامیل دا و بەس. |
| ٣- | ١<br>٨ | خەبن<br>کەف | شەکل | کۆبوونەوەی خەبن و کەف لەیەک پێی حەرتیدا | ١- فاعلاتُنْ<br>٢-مستَفع/لُنْ | ١- فَعِلَاتُ<br>٢- متَفعِلُ | ١- فعلات<br>١- مَفَاعِلُ | ١- لە مەدید و رەمەل و خەفیف و موجتەس دا<br>١- خەفیف و موجتەس |
| ٤- | ٤<br>٨ | عەصب<br>کەف | نەقص | کۆبوونەوەی عەصب و کەف لەیەک پێ دا. | ١- مُفَاعَلَتُنْ | ١- مُفَاعَلْتُ | ١- مَفَاعِيلُ | ١- لە وافیردا و بەس |

**دووەم: عـیللـە: گۆڕین: عـیللـە –یا گۆڕین– دوو جۆرە:**

جۆری یەکەم: هاوبەشە لە نێوان سەبەب و وەتەددا – واتە: هەم دەچێتە سەر سەبەب و هەم دەچێتە سەر وەتەد – لەبەر ئەوە پێی دەگوترێ: عیللەی موشتەرەک، واتە: گۆڕینی هاوبەش، ئەم جـۆرە نەگـۆڕە، تەنیـا دەچێـتـە سـەر عـەرووز و زەرب، وە بەهۆی ئەو گۆڕانکارییەوە، کێشی بەحرە جیا جیاکان دروست دەبێ، بەپێی جۆری ئەو عیللەتەی کە تووشی زەرب یا عـەرووز یا هەردووکیـان دەبێ. ئەم جـۆری یەکـەمـە دوو جـۆری هەیە: عـیللەی زیاد و عـیللەی کەم. جـۆری دووەم لە عـیللە تایبەتە بەوەتەدەوە، بگۆڕە، نەگـۆڕ نییە، لەبەر ئەوە لە زیحاف دەچێ، جگە لە تەشعیثیان، ئەوانی تریان ناچنە سەر عەرووز و زەرب، بەڵکو دەچنە سەر یەکەم پێی سەرەتای دێڕ، یا یەکەم پێی سەرەتای نیوەی دووەمی دێڕ. وا دەست دەکەین بەدوو جۆری جۆری یەکەم و دەڵێین:

آ– عـیللەی زیادە هاوبەش: بریتییە لە پڕکردنی پیتێکی وەستاو، یان سەبەبێکی سووک، کە یەکسانە بەبڕگەیەکی درێژ، لە کۆتایی پێدا. ئەمەیش سێ جۆرە، وەک لە نەخشەیەدا ڕوون دەبێتەوە، عیللەی زیادە نەگۆڕە، کە بەکوردی پێی دەڵێین: گۆڕینی زیادە (بڕ: خەزم + تێبینی کۆتایی نەخشەی/ ٥ لە دواوە).

٣– نەخشەی عیللەتی زیادە

| ژ. گۆڕین | ناوی گۆڕین | پێناسەی گۆڕینەکە | ژ. پێی تووشبوو | پێ تووشبووەکە | ژ. پێ تازەکە | پێ تازەکە | بەحرەکەی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١– | تەرفیل | زیادکردنی سەبەبێکی سـووکـە، لەوەتەدی کـۆی کـۆتایی پێی زەرب و لـە پـێـی عـەرووز لەکـاتی تەحـریعـا. تەرفـیل نەگـۆڕە و تایبـەتە بە مـەجزووئی کـامـیل و مـوتەدارەکـەوە. (بڕ: ١٠٣– ترفیل). | ١– | مُتَفَاعِلُنْ | ١– | متفاعلاتُنْ | ١– مەجزوئی کامیل |
| | | | ٢– | مستفعِلن | ٢– | مستفعِلاتن | ٢– مەجزوئی کامیل |
| | | | ٣– | فاعلن | ٣– | فاعلاتن | ٣– مەجزووئی موتەدارەک |
| | | | ٤– | فَعِلُنْ | ٤– | فَعِلاتن | ٤– مەجزوئی موتەدارەک |
| | | | ٥– | مفاعَلن | ٥– | مفاعَلاتن | ٥– مەجزووئی کامیل |





| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢- | تەذییل (إذالة) | زیادکردنی یەک پیای وجستاو، لە وەتەدی کۆی کۆتایی پێی کۆتایی (زەرب یان عەرووز لەکاتی تەصریعا) تەذییل تایبەتە بەمەجزووئی بەسیط و کامیل و موتەدارەکەوە. (بڕ: ٩٥- التذییل) | ١-<br>٢-<br>٣-<br><br>٤-<br>٥-<br>٦-<br>٧- | متفاعلن<br>مستفعلن<br>مَفَاعِلُنْ<br><br>مُفْتَعِلُنْ<br>فَعِلُنْ<br>فَاعِلُنْ<br>فَعِلُنْ | ١-<br>٢-<br>٣-<br><br>٤-<br>٥-<br>٦-<br>٧- | متفاعلانْ<br>مستفعَلانْ<br>مَفَاعِلانْ<br><br>مفتعلان<br>فَعِلَتَانْ<br>فاعَلان<br>فَعِلَان | ١- مەجزوئی کامیل<br>٢- مەجزوئی کامیل و بەسیط<br>٣- مەجزووئی کامیلی مەوقووصی موزال و بەسیط<br>٤- مەجزوئی بەسیط و کامیل<br>٥- مەجزووئی بەسیط<br>٦- مەجزووئی موتەدارەک<br>٧- مەجزووئی موتەدارەک |
| ٣- | تەسبیغ | پترکردنی پیتێکی وەستاو بۆ سەبەبی سووکی کۆتایی زەرب. تەسبیغ نەگۆڕە و بەس لەرەمەل دا دەبێ (بڕ: ١١٩-اسباغ) | ١-<br>٢- | فاعلاتُنْ<br>فَعِلَاتُنْ | ١-<br>٢- | فاعلاتَانْ<br>فَعِلَاتان | ١- مەجزوئی رەمەل<br>٢- مەجزوئی مەخبوونی موسبەخی رەمەل |

ب- عیللەی کەمی هاوبەش: دوو جۆری هەیە: عیللەی سادە، عیللەی لێکدراو. عیللەی سادە - یا تاک - ئەوەیە پێیەکە تووشی یەک عیللە ببێ، وەک (مفاعیلن) لە دووەمی تەویلا تووشی حەذف ببێ و ببێ بە(مفاعی = فعولن = ب - -). عیللەی لێکدراویش ئەوەیە: پێیەکە تووشی دوو عیللە بووبێ، وەک لە موتەقارەبدا (فعولن) بەحەذف ببێ بە(فعو = ب -) بەقەطعیش ببێ بە(فع = لن = -) بەکۆبوونەوەی ئەم دوو عیللەیە لەم جوزئەدا دەگوترێ: بەتر. یا ئەوەیە پێیەکە تووشی عیللەتێک و زیحافێ ببێ، وەک (قەطف = حەذف + عەصب).

ئەمەیش لە دواوە نەخشەی عیللەی کەمی هاوبەشە، بەهەردوو جۆرەکەیەوە واتە: بەسادە و بەلێکدراویەوە:

## ٤- نەخشەی عیللەی کەمی هاوبەش

| | ناوی عیللە | پێناسەکەی | ژ | پێ | ژ | پێ پاش تووش بوون | ژ | پێ نوێکان | بەحرەکەی و تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | حەذف | عیللەی سادەیە: بریتییە لەفڕێدانی سەبەبی سووک لەکۆتایی عەرووز یا زەرب یا لەکۆتایی هەردووکیانەوە عیللەتێکی نەگۆڕە | ١-<br>٢-<br>٣-<br>٤-<br>٥- | مَفَاعیلُنْ<br>فاعِلَاتُنْ<br>فَعُولُنْ<br>فاعِلاتُن<br>مُفَاعَلَتُنْ | ١-<br>٢-<br>٣-<br>٤-<br>٥- | مَفَاعي<br>فاعِلَا<br>فَعُو<br>فاعِلْ<br>مُفَاعَلْ | ١-<br>٢-<br>٣-<br>٤-<br>٥- | فَعُولُنْ<br>فاعِلُنْ<br>فَعَلْ<br>فَعْلُنْ<br>فعولن | ١- لە طەویل و هەزەج وافیر<br>٢- لە مەدید و رەمەل و خەفیف و موجتەس دا<br>٣- لە موتەقارەبدا. (بڕ: ٥-حذف).<br>٤- لە مەدیدی مەبتووردا<br>٥- لە مەقطوفی وافیردا |
| ٢ | قەطع | لابردنی پیتی وەستاوی وەتەدی کۆی کۆتایی پێی عەرووز یا زەرب، لەگەڵ وەستاندنی پیتی بزواوی پێشی | ١-<br>٢-<br>٣-<br>٤-<br>٥- | فاعلن<br>مستفعلن<br>متفاعِلُن<br>مفاعَلن<br>فاعلاتن | ١-<br>٢-<br>٣-<br>٤-<br>٥- | فاعِلْ<br>مُسْتَفْعِلْ<br>متفاعِلْ<br>مَفَاعِلْ<br>(فاعلا-فَعْلُن) | ١-<br>٢-<br>٣-<br>٤-<br>٥- | فاعلن=--<br>مَفْعُولُن<br>فَعلاتُن<br>فعولن<br>فعلن | ١- لە بەسیط و موتەدارەک<br>٢- لە بەسیط و کامیل و رەجەز و مونسەریح دا<br>٣- لە کامیلدا. (بڕ: بەتر+قەطع+نەخشەی/٦ زیحانی عیللە ئامێز٤/)<br>٤- لە رەجەزی مەجنونی مەقطوع و مخلص بەسیطدا<br>٥- لە مەدیدی مبتوزدا |
| ٣ | قەصر | فڕێدانی پیتی وەستاوی سەبەبی سووک و وەستاندنی پیتی بزواوی لەپێی زەربدا. لە عەرووزا نەگەر بوو، بۆ تەجریعە | ١-<br>٢-<br>٣- | فَعلاتُنْ<br>مَفَاعِیلُن<br>فَعُولُنْ | ١-<br>٢-<br>٣- | فَاعِلَاتْ<br>مَفَاعِیلْ<br>فَعُولْ | ١-<br>٢-<br>٣- | فاعِلَانْ<br>فَعُولَانْ<br>فَعُولْ | ١- لە رەمەل و مەدیددا<br>٢- لە هەزەج دا.<br>٣- لە موتەقارەبدا. (بڕوانە:قەصر+نەخشەی٦/-١١) |
| ٤ | الحَذَذ | ئەوەتا وەتەدی کۆ بە تەواوی لە کۆتایی پێی (مـتـفـاعـلـن) و (مـسـتفعلن)دا لە کامیل دا لابرێ | ١-<br>٢- | متفاعلن<br>مستفعلن | ١-<br>٢- | مُتَفَا<br>مستف | ١-<br>٢- | فعلن=ب ب-<br>فَعْلُن=-- | ١- لە کامیل دا<br>٢- لە کامیل دا |
| ٥ | وەقف | وەستاندنی دوا پیتی وەتەدی بلاوی کۆتایی پێ (مَفْعُولاتُ) | ١-<br>٢-<br>٣- | مفعولاتُ<br>مَفْعُلَاتُ<br>مَعُلَاتُ | ١-<br>٢-<br>٣- | مفعُولاتْ<br>مفعلاتْ<br>مَعُلاتْ | ١-<br>٢-<br>٣- | مفعولانْ<br>فاعلانْ<br>فَعُولَانْ | ١- لە سەریع و مونسەریح دا<br>٢- لە سەریعی مەتوی مەوقووفدا<br>٣- لە مونسەریحی مەخبوونی مەوقووفدا |
| ٦ | صەلم | لابردنی وەتەدی بلاوی کۆتایی (مفعو/لاتُ) | ١- | مفعولات | ١- | مفعو | ١- | (فعلن=--) | ١- لە کێشی سەریع دا و بەس (بڕ: صلم) |



| ٧ | کەسف یا<br>کەشف | لابردنی پیتی بزواوی کۆتایی پیتی (مفعولاتُ) بە تیی بۆردار | ١-<br>٢- | مفعولاتُ<br>مَعُلاتُ | ١-<br>٢- | مفعولا<br>مَعُلاً | ١-<br>٢- | مفعولن<br>فَعلُن‌ب- | ١- لە کێشی سەریع و مونسەریح دا<br>٢- لە سەریعی مەجنولی مەکسووف دا |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٨ | قەطف: حذف / عەصب | قەتف عـیللەتێکی لێکدراوە تێکەڵە لەزەیحافی عەصب و عـیللەتی حەزف | ١- | مُفَاعَلَتُنْ | ١- | مَفَاعَلْ | ١- | فَعُولُنْ | ١- لە وافیردا و بەس. برێتییە لە عیللەیەکی سادە و زیحافێکی تاک |
| ٩ | بەتر: قەطع / حەذف | = قەتع+حەذف= لە دوو عـیللەتی سادە | ١-<br>٢- | فاعِلاتُنْ<br>فَعُولُنْ | ١-<br>٢- | (فاعلا-<br>فَاعِلْ)<br>(فَعُو-فَعْ) | ١-<br>٢- | فَعْلُنْ<br>(فَعْ=-) | ١- لە مەدیددا بە حەذف دەبێ بە (فاعلا) بەقەتعیش دەبێ بە (فعلن=--)<br>٢- لە موتەقاریبدا (بڕوانە: بەتر) |

ج- ئێستاش لە دواوە نەخشەی عیللەی تایبەت بەوەتەدەوە دەکێشین، کە بەشی دووەمە لە عیللە، کە ناودارن بەعیللەی زیحافانە، واتە: (العِلَلُ الجارِیَة مجری الزحاف) چونکە وەک عـیللە دەچنە سەر وەتەد، بەڵام وەک زیحاف بگۆڕێن، نەگۆڕ نین، وە دەچنە سەر حەشوی بەیتیش، وە نایشچنە سەر دووەمانی سەبەب:

٥- نەخشەی عیللەی تایبەت بەوەتەدەوە و بەحەشوەوە (علة جارية مجرى الزحاف)

| | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | تەشعیث | فرێدانی پیتێکی بزواوی وەتەدی کۆ لە(فاعِلاتن) و لە(فاعِلن)دا | ١<br>٢ | فاعِلاتُنْ<br>فاعِلُنْ | ١<br>٢ | فالاتن<br>فالُنْ | ١<br>٢ | مَفْعُولُنْ<br>(فَعْلُن=--) | ١<br>٢ | لە موجتەث و خەفیف و مەدید و رەمەل دا<br>لە موتەدارەک دا |
| ٢ | خەرم | (بڕ: خەرم) | ١<br>٢<br>٣ | مَفَاعِيلُنْ<br>مُفَاعَلَتُن<br>فعولن | ١<br>٢<br>٣ | فاعِيلُنْ<br>فَاعَلَتُنْ<br>عولن | ١<br>٢<br>٣ | مَفْعُولُنْ<br>مفتَعِلُنْ<br>(فعلن--) | ١<br>٢<br>٣ | لەتەویل و وافیرو هەزەج و موضاریع و موتەقارەبدا<br>لە وافیردا<br>لەموتەقارەبدا (بڕ:خەرم) |
| ٣ | ثەرم | = خەرمی + قەبض | ١ | فَعُولُنْ | ١ | عُولُ | ١ | (فَعْلُ=-ب) | ١ | لە تەویل و موتەقارەبدا (بڕ: ثرم) |
| ٤ | ثەلم | = خەرمی (فَعُولُنْ) | ١ | فَعُولُنْ | ١ | عولن | ١ | (فَعْلُنْ=--) | ١ | لەتەویل و مەتەقارەبدا (ب:ثەلم) |
| ٥ | عەضب (عەزب) | = خەرمی (مفاعلتن) | ١ | مفاعلتن | ١ | فاعلتن | ١ | (مفتعلن=-ب ب-) | ١ | لە وافیردا و بەس |
| ٦ | خەرب | = خەرمی و کەف لە(مفاعیلن)دا | ١ | مَفَاعِيلن | ١ | فاعيلُ | ١ | (مَفْعُولُ=--ن) | ١ | لە هەزەج و موضاریع دا: (خرب) |
| ٧ | شەتر | = خەرمی و قەبزی (مَفَاعِيلن) | ١ | مَفَاعِيلُنْ | ١ | فَعِلُنْ | ١ | (فاعِلُن=-ب-) | ١ | لە هەزەج و موضاریع دا.<br>لە حەشویش دادەبێ |
| ٨ | قەصم | = تێکەڵە لە خەرم و عەصب لە (مفاعلتن)دا | ١ | مفاعلتن | ١ | فاعیلن | ١ | مفعولن | ١ | لە وافیردا و بەس |
| ٩ | جەمەم | = تێکەڵە لە خەرم و عەقل لە (مفاعلتن)دا | ١ | مفاعلتن | ١ | فاعَتن | ١ | فاعِلُنْ | ١ | لە وافیردا و بەس |
| ١٠ | عەقص | = تێکەڵە لەیەک عیللەو دوو زیحاف= (خەرم+ عەصب+ کەف). لە (مفاعلتن)دا | ١ | مفاعلتن | ١ | فَاعَلْتُ | ١ | (مفعول=--ن) | ١ | لە وافیردا و بەس |

د- جۆرێ عیللەی تر هەیە پێی دەگوترێ: عیللەی عەرووزی: بریتییە لەو جۆرە گۆڕانە نەگۆڕانەی کە دەچنە سەر پێی عەرووز و زەرب، کە بریتین لە برێ زیحافی جێگری عیللە، کە بەتەنیا خۆیان دەچنە سەر عەرووز و زەرب، جاروباریش عیللەیەکیان لەگەڵدایە، ناودارن بە(زیحافی جێگری عیللە = گۆڕانی جێگری گۆڕین). بەعەرەبی ناودارن بە(زحاف جاري مجرى العلة). بەوێنە: بەحری تەویل یەک عەرووز و سێ زەربی هەیە، پێویستە عەرووزەکەی لە هەر سێ زەربەکەیدا قەبز بکرێ، ئاوا:

١- یەکەمی تەویل = مفاعلن × مفاعیلن.

٢- دووەمی تەویل = مفاعلن × مفاعلن.

٣- سێیەمی تەویل = مفاعلن × فعولن.

دەی هەموو دەزانین کە قەبز، زیحافێکی سادەی بگۆڕە، نەگۆڕ نییە، بەزۆری دەچێتە سەر سەبەبی سووکی پێی حەشو، کەچی لە هەندێ شوێنا، وەک لەم نەخشەیەدا دەردەکەوێ، دەچێتە سەر زەرب و عەرووز و نەگۆڕیش، وە رۆڵ دەبینێ لە دروستبوونی کێشەکانی دەریاکەدا، بەپێچەوانەی سروشتی خۆی، کە پەیوەندییەتی بەپێیەکانەوە، نەک بەبەحرەکانەوە.

(تێبینی): نەهک و جەزء و شەطر، لە جۆری زیحاف و عیللە نین، بەڵکو لە جۆری عەرووز و زەربی بەحرەکانن، بەڵام (خەزم) کە لە ماددەی (خ ز م)دا ڕابورد، لە جۆری عیللەی زیادەیە، کە لە پیتێکەوە هەتا شەش پیتی هەیە. بڕوانە (خەزم + ناچاریەکان/ ٤١).

## ٦- نەخشەی زیحافی عیللە ئامێز (زحافي جارية مجرى العلة = زیحافی نەگۆڕ= زحام لازم)

| ژ | ناو | پێناس | ژ | پێی ساغ | ژ | پێی تووشبوو | ژ | پێ تازەکە | ژ | ناوی بەحرەکان و تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | قەبز | بڕوانە(١-٥) واتە: نەخشەی ١ ژمارە ٥ | ١- | مَفَاعیلن | ١- | مَفَاعِلُنْ | ١- | مَفَاعِلُنْ | ١- | عەرووزوزەربی دووەمی تەویل و عەرووزی یەکەم و سێیەمی تەویل |
| ٢ | خەبن و حەذف | (١-١)+(٤-١) | ١- | فاعِلاتن | ١- | فَعِلا | ١- | (فعلن=ب ب-) | ١- | عەرووزوزەربی سێیەمی مەدید و ضەربی یەکەمی سێیەمی |
| ٣ | خەبن | (١-١) | ١- | فاعلن | ١- | فعلن | ١- | (فعلن=ب ب-) | ١- | یەکەمی بەسیط، خەبن لەعەروزوزەریا پێویستە |
| ٤ | خەبن و قەطع | (١-١)+(٤-٣) | ١- | متفعلن | ١- | متفعلن | ١- | فعولن | ١- | موخەللەعی بەسیط، خەبن و قەطع لە عەروزوزەربیدا پێویستە و نەگۆڕن |
| ٥ | عەصب | (١-٤) | ١- | مفاعلتن | ١- | مفاعلتن | ١- | مفاعیلن | ١- | مەجزوونی وافیر، عەصب لەضەربی دووەمیدا پێویستە |
| ٦ | ئیزمار و حذذ | (١-٣)+(٤-٦) | ١- | متفاعلن | ١- | متفا | ١- | (فعلن=--) | ١- | لەکامیلدا، لەضەربی سێیەمی عەرووزی یەکەم و لەضەربی دووەمی عەرووزی دووەمیدا ئیزمار و حذذ مدرجە |
| ٧ | تەی و کەسف | (١-٢)+(٤-٩) | ١- | مفعولات | ١- | مَفْعُلا | ١- | فاعلن | ١- | لەسەریعا، لە عەرووزی یەکەمی دا و لە ضەربی دووەمی عەرووزی یەکەمی دا |
| ٨ | تەی و وەقف | (١-٢)+(٤-٨) | ١- | مفعولات | ١- | مفعلاتْ | ١- | فَاعِلانْ | ١- | لەسەریعا، ضەربی دووەمی عەرووزی یەکەم و عەرووزی یەکەمی |
| ٩ | تەی | (١-٢) | ١- | مستفعلن | ١- | مستعلن | ١- | مفتعلن | ١- | لەضەربی یەکەمی عەرووزی یەکەم مونسەریحدا |
| ١٠ | خەبل و کەسف | (١-٢)+(٤-٩) | ١- | مفعولات | ١- | مَعُلا | ١- | (فَعِلُن=ب ب-) | ١- | لەسەریعدا، لەعەرووزی دووەمیدا و لەضەربەکەیدا |
| ١١ | خەبن و قەصر | (١-١)+(٤-٤) | ١- | مستفع لن | ١- | متفع لْ | ١- | فعولْن | ١- | لەضەربی دووەمی مەجزوونی خەفیف دا |
| ١٢ | تەی | (١-٢) | ١- | مستفعلن | ١- | مفتعلن | ١- | مفتعلن | ١- | لە عەروزو زەربی موقتەزەبدا |
| ١٣ | خەبن و تەرخیل | (١-١)+(٣-١) | ١- | فَاعِلُن | ١- | فعلاتن | ١- | (فعلاتن=ب ب--) | ١- | لەضەربی دووەمی مەجزوونی موتەدارەک دا |

بەشێوەیەکی گشتی، هەموو زاراوە عەرووزییەکان، بەپێی پیتەکانی ئەلفوبێ، هەریەکەیان لە شوێنی تایبەتی خۆیدا شیکراوەتەوە، بەوێنە کەسێ دەیەوێ بزانێ کە (خەبن) چییە، با لە ماددەی (خەبن)دا بۆی بگەڕێ، هەروا لە حەذف لە ماددەی (ح ذ ف)دا بۆی بگەڕێ... تاد.

ئەمەیش لە دواوە، بۆ ئاسانکاری بەڕێز لیستی ناوی گشت زیحاف و عیللەکانە، بەهەموو جۆرەکانییەوە، لەگەڵ لیستی ئەو بەحرانەی کە ئەم زیحاف و عیللانەیان وا تیادا:

**١- لیستی زیحافی تاک:**

١- خەبن ٢- تەی ٣- ئیزمار ٤- عەصب ٥- قەبز ٦- عەقل ٧- وەقص ٨- کەف.

**٢- لیستی زیحافی جووت:**

١- خەبل ٢- خەزل ٣- شەکل ٤- نەقص.

**٣- لیستی عیللەی زیادە:**

١- تەرفیل ٢- تەذییل ٣- تەسبیغ.

**٤- لیستی عیللەی کەمی:**

١- حەذف ٢- قەطف ٣- قەطع ٤- قەصر ٥- بەتر ٦- حەذەذ ٧- صەلم ٨- وەقف ٩- کەسف.

**٥- لیستی عیللەی تایبەت بەوەتەدەوە:**

١- تەشعیث ٢- خەرم ٣- ثەرم ٤- ثەلم ٥- عەصب ٦- شەتر ٧- خەرب ٨- قەصم ٩- جەمەم ١٠- عەقص.

**٦- لیستی زیحافی جێگری عیللە:**

١- قەبز ٢- خەبن ٣- عەصب ٤- ئیزمار ٥- تەی ٦- خەبل.

**٧- لیستی ئەو بەحرانەی زیحافی تاکیان وا تیادا:**

١- خەبن لە یازدە بەحردا هەیە:

١- مەدید ٢- بەسیط ٣- رەجەز ٤- رەمەل ٥- سەریع ٦- مونسەریح ٧- خەفیف ٨- موقتەضەب ٩- موجتەث ١٠- موتەدارەک ١١- کامیلی موضمەر.

= مفتعلن) دەی ئەگەر لەم دێڕەدا هەموو واوە عەطفەکان حسێبی پیتی مەددیان بۆ بکرێ، کە حەق وایە فەرقیان نەکرێ، ئەوا لەم دێڕەدا، لە چوار (مستفعلن) دووانیان مەتوی دەبێ، دووانەکەی تریان سالم و ساخ دەبن، شتی وا لە دێڕەکانی تریشدا ڕەچاو دەکرێ!

د- ئەم نیوە دێڕە ئاوا کەرت کەرت دەکرێ:

مَطْوِیَبَحْ : رابَسِیْط: لِیبَکَجَا : رکَنْظَرْ

-ب ب -: - ب -ْ: -ب ب-: - ب-

مفتعلن : فاعلان : مفتعلن : فاعلن

پێی دووەم (رابَسِیْط) لە جۆری پێی کوردییە، بریتییە لە (سەبەبێکی سووک + وەتەدێکی کۆ لە جۆری کوردی) بەمە ناگوترێ (إذا لە: تذییل) چونکە ئیذا لە ناوەڕاستەوە نابێ، سەرەڕای ئەوەیش ئیذالە عیللەیەکی نەگۆڕە، ئەگەر وابووایە دەبوو ئەم پێیە لە هەموو دێڕەکانی تریشدا موزال بووایە، کەسیش شتی وای نەگوتووە، مەگەر لە کاتی تەسمیطدا، وەک بەحرەکەیی دەڵێ (بەسیتی موسەممەط):

بارانی ڕەحـمـەت خـودام، بـارێنە تۆ بەردەوام

مستفعلن + فاعلان + مستفعلن + فاعلان

سەر خۆشەویستت تەمام، گەورەی هەموو گەل بەجەم

مستفعلن + فاعلان + مستفعلن + فاعلن

هـ- دێڕی ژمارە (٣) دەبێ ئەم جۆرە تەعبیرە: (شەمل بلاڤ... تاد) وەها بخوێنرێتەوە کە کێشەکە لەنگ نەبێ، کە یەکسان بێ بە(مفتعلن - ب ب -) لەبەر ئەوە دەبێ کەسرە موختەلەسەیێ لەسەر لامی (شەمل) دروست بکرێ. ئەمەیش وا گۆ دەکرێ: (ڤێک کەتنە - ب ب - مفتعلن = ڤیکْکَتَنَا). واتە: لە بێژەی (کەتنە)دا، بزوێنی (ت) کە تەواو ئاشکرا بکرێ تا دەبێ بە(- = سەر)ی تەواو، وە بزوێنی کورتی (ە) کە جووڵەی نوونەکەیە، درێژ بکرێتەوە و بە(آ) ئەلفی مەدد گۆی پێ بکرێ ئاوا: (ڤیککەتَنَا).

و- بۆ زانینی مامەڵەکردن لەگەڵ تێی خڕی مێیینەی کۆتایی هەندێ لە وشەکانی ناو دێڕەکاندا بڕوانە: (١٠٢ - ناچاریەکان).

ز- وشەی (دوو) لەو جۆرە وشانەیە کە جارێ بەبڕگەی کورت (ب) و جارێ بەبڕگەی درێژ (-) دەخوێنرێتەوە، لە ڕستەی (هەردوو شەڕ)دا، دەبێ بەکورت بخوێنرێتەوە ئاوا

(هَرْدُشَرْ = فاعلن - ب -). دەنا دەبێ بە(هَرْدُوْ شَرْ = مفعولن) ئەمەیش لێرەدا ناگونجێ.

٧- دێڕی پێنجەمیش (صلدِ) قەوی، ڕێک وەک (شەمل بلاڤ...) وایە، واتە: دەبێ قورسی بخرێتە سەر دالەکەی، هەتا کێشەکە بێ کێشە بێ.

(تێبینی): لە دواوە هەندێ گفتوگۆ لەسەر چامەیەکی وەفایی - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - دەکەین، چامەکە وەک دەردەکەوێ بریتییە لە دوازدە دێڕ، ڕێگەی تێدەچێ سەر بەکێشی ڕەجەزی مورەففەل بێ، هەڵیش دەگرێ سەر بەبەسیتی موخەللەع بێ! بەڵام کەم دێڕی هەیە کە بەپێی هەریەکێ لەم دوو کێشەیە بەتەواوی دەربچێ، گەرچی د. عەزیز گەردی دایناوە بە(ڕەجەزی چواری مەخبوونی مورەففەل).

جارێ پێشەکی دەبێ ئەوە بزانرێ: بڕیار بەسەر چامەیەکا نادرێ: کە مەخبوونە، یا مەتوییە، یا مەخبوولە، بەپێی چەند پێیەکی لە چەند دێڕێکیدا، کەواتە: وەک لە چامەکەدا دەردەکەوێ، ئەگەر چامەکە ڕەجەزی مورەففەلیش بێ مخبون نییە. بەڵام دێڕی ڕەجەزی مەخبونی مورەففەلی وا تیادا، وەک سەردێڕەکەی.

جێگەی بایەخ و ڕوونکردنەوەیە، ئەوەی کە پێی دەگوترێ: ڕەجەزی چواری مەخبونی مورەففەل، ڕێک موخەللەعی بەسیطە، وە ناونانی بەموخەللەعی بەسیت عەرووزییترە، هەتا ناونانی بەرەجەزی چواری مەخبونی مورەففەل، چونکە بەپێی عەرووزی خەلیلی، کێشی هەیە بەناوی موخەللەعی بەسیت، بەڵام کێشی نییە بەناوی ڕەجەزی مرفَل، هەر وەک چۆن ئەوەی کە پێی دەڵێن: هەزەجی شەشی محذوف، هەق وایە پێی بگوترێ: وافیر، لەبەر هەمان هۆی پێشوو، چونکە وافیر دەریایەکی ناسراوی کۆنە، بەڵام هەزەج لە کۆندا (واجب الجزء)ە، واتە: پێویستە چواری بێ نەک شەشی.

جا وا لێرەدا بۆ ڕاهێنان و مەشق کردن، هەتا هەستیاران هەست بەلێکچوون و لە یەکەوە نزیکیی لکەکێشەکان بکەن، چامەکەی وەفایی، وەک لە دیوانەکەیدا پەخشەوە کراوە، کە مامۆستا محمد علی قەرەداغی، کۆڵینەوەی لەسەر نووسیوە، جا وا لێرەدا ئەو چامەیە بەدوو شێوە دەنووسین:

١- وەک خۆی کە چاپ کراوە، دەیکەین بەنموونەی ڕەجەزی چواری مورەففەل و بەس، وە لەسەر دێڕەکان، سەرنجی شیاو تۆمار دەکەین بەپشتی خوا.

٢- خۆمان دەسکاری هەندێ دێڕی دەکەین، کە دەست نادەن بۆ بەسیتی موخەللەع، یا

بۆ ڕەجەزی مورەففەل، هەتا هەردوو شێوەکە ببن بەدوو نموونەی ڕێکوپێک بۆ ئەم دوو لکەکێشانە لە کوردیدا.

(چامەی ژمارە - ١٢ - لە پیتی میم ل - ٦٢. دیوانی وەفایی):

(نموونەی ڕەجەزی مورەففەل):

١- نەخۆش و مەستی دوو چاوی کاڵم
حەقم بەدەستە ئەگەر بناڵم

٢- بەغەمزەی چاوت، بەخەندەی زارت
بردیان بەغارەت خەو و خەیاڵم (؟)

٣- فەرمووت: چلۆنی؟ چ بڵێم، عەزیزم
دوور لە زوڵفی تۆ کافر بەحاڵم (؟)

٤- بەیادی چاوت چوومە خەرابات
لە ڕەهنی مەیدا خەرقە و بەرماڵم (؟)

٥- من مورغی قودسی لە لامەکان بووم
ئیلاهی ڕوحمێ! شکستە باڵم

٦- شەوێکی تاریک، ڕەهێکی باریک
هەر بەئومێدی چرای جەماڵم

٧- بەتیری نازت بڕاوە جەرگم
بەچاوی بازت نەماوە حاڵم

٨- وەک من بەچاوت یەخسیری زوڵفم
کەس وا نەگیرێ بەداوی ظاڵم!

٩- خۆش بەوودەمانە گوڵ گوڵ دەپشکوت
شەکەر دەباری پرسی لە حاڵم

١٠- صەبا دەخیلم هەرتاکو ماوم
بڵێ بەزاری، بڕۆ بەخاڵم

١١- دەمێكی بابێ، دەوای دڵم كا

بەچاوەكانی، گەلێ بێ حاڵم

١٢- (وەفایی) چی دیت لەسەر بگێڕێ

نەما لەسەر تۆ نە سەر نە ماڵم

**(ڕاستکردنەوەی کێشی دێرە لەنگەکان):**

کێشی ڕەجەزی چواریی مەخبوونی مورەففەل ئاوایە: (مفاعلاتن + مفاعلاتن × ٢) ئەگەر مەخبوون نەبێ، دروستە، لە جێی (مفاعلاتن) یەکێ لەم پێیانەی تر بێ (مستفعلاتن) یا (مفتعلاتن) یا (فعلتاتن).

١- شیعری یەکەم ڕێک وەک خۆی دەست دەدا بۆ ڕەجەزی مورەففەل و موخەللەعی بەسیت، چونکە (مفاعلاتن + مفاعلاتن × ٢) کە ڕەجەزی مورەففەلە، ڕێک دەکاتە (مفاعلن + فاعلن + فعولن × ٢) کە موخەللەعی بەسیتە، لە موخەللەعی بەسیتیشدا دروستە لە جێگەی (مفاعلن)ی مەخبون (مستفعلن)ی ساخ بێ.

٢- (بەغەمزەی چاوت، بەخەندەی زارت) لەنگە، ڕاستەکەی (بەغەمزە چاوت، بەخەندە زارت = مفاعلن + مفاعلاتن = مفاعلن + فاعلن + فعولن) بەڵام لەتی دووەمی ئەم دێرە، بەبێ دەستکاری دەست دەدا بۆ هەردوو کێشەکە: (بردْیان بەغارەت = مفاعلاتن + خەو و خەیاڵم = مفاعلاتن = ڕەجەز مورەففەل = بردیان بەغا = مفاعلن + ڕەت خەو و = فاعلن + خەیاڵم = فعولن = موخەللەعی بەسیط).

٣- دێری سێیەم لە ڕەجەزدا، لەتی دووەمی دەسکاری دەوێ ئاوا:

فەرمووت چلۆنی؟ چێلیمْ عەزیزم  لە دووری زوڵفت کافر بەحاڵم

= مستفعلاتن + مستفعلاتن  مفاعلاتن + مستفعلاتن

لە موخەللەعدا دەبێ ئاوا بێ:

فەرمووت: چلۆنی؟ دەڵێم: عەزیزم!  لە دووری زوڵفت نەبینی حاڵم

٤- بەیادی چاوت چوومە خەرابات  لە ڕەهنی مەی دام خەرقە و ماڵم

بۆ بەسیتیش ئاوا:

بەیادی چاوت چوومە خەرابات  لە ڕەهنی مەی دام، چ سەر چ ماڵم

٥- ژمارە (٥) و (٦) و (٧) بۆ هەردوو کێشەکە دەست دەدەن.

٨- وەک خۆی بۆ ڕەجەز. بۆ (موخەللەعیش) لە لەتی یەکەما (یەخسیری) بکرێ بە(ئەسیری) ئاوا: (وەک من بەچاوت ئەسیری زوڵفم).

٩- وەک خۆی بۆ ڕەجەز، ئاوایش بۆ موخەللەع:

خۆش بەودەمانەی کە گوڵ دەکا گوڵ!  شەککەر دەبارێ بپرسی حاڵم!

١٠- بۆ ڕەجەز وەک خۆی، بۆ موخەللەعیش (هەر تاکو) دەکرێ بە(هەتاکو).

١١، ١٢- بۆ هەردوو کـــێش دەست دەدەن، بـەڵام لە زەربی (١١) دەدا، بۆ هەردوو کێشەکە دەبێ نەبرە و قورسی نەخرێتە سەر (ێ)ی (بێ حاڵم) بەڵکو دەبێ تێک پەڕێنرێ و (بێ) بەبڕگـەی کـورت دابنرێ، هەتا (بێ حـاڵم) یەکـسـان بێ بە(فـعـولـن) نەک بە(مفعولن). لە موخەللەعدا چامەکە ئاوای لێ دێ.

١- نەخۆش و مـەستی دوو چاوی کـاڵم
حـەقم بەدەسـتـە ئـەگـەر بناڵم

٢- بەغـەمـزە چاوت، بەخـەندە زارت
بردیان بەغـارەت خـەو و خـەیاڵم

٣- فـەرمـووت: چلۆنی؟ دەڵێم: عـەزیزم
لـە دووری زوڵـفت نـەبـینـی حـاڵـم

٤- بەیادی چاوت چوومـە خـەرابات
لە ڕەهنی مـەی دام: چ سـەر، چ مـاڵم

٥- من مـەلی قـودسی لە لامـەکـان بووم
ئـیـلاهی ڕوحـمێ! شکـسـتـە باڵم

٦- شـەوێکی تاریک، ڕەهێکی باریک
هەر بەئومـێـدی چرای جـەمـاڵم

٧- بەتیـری نازت بڕاوە جـەرگم!!
بەچاوی بـازت نـەمـاوە حـاڵـم

٨- وەک من بەچاوت ئەسـیـری زوڵفم
کـەس وا نەگـیـرێ بەداوی ظاڵم!

٩- خۆش بەودەمانەی کە گوڵ دەکا گوڵ!
شـەککەر دەبارێ: بپـرسی حـاڵم

١٠- صـەبا دەخـیلم هەتاکـو مـاوم
بـڵێ بـەزاری، بـڕۆ بـەخـاڵـم

١١- دەمـــێکی بابێ، دەوای دڵـم کـــا

بەچاوەکـــــانی، گـــــەلێ بێ حـــــاڵم

١٢- (وەفایی) چی دیت لە دوور بگێڕێ

نەمـــا لەســـەر تۆ: نە ســـەر نە مـــاڵم

گـەرچی بەڕای من نیـوە دێڕی شـیـعـری دەیەم لە بنەڕەتدا بەم شـێـوە بووە، نەک وەک ئێستای، ئەمەی ئێستای هەڵەی نووسیار و شتی تری وایە، لە بنەڕەتدا ئاوا بووە:

سەبا دەخیلم هەتاکو ماوم    برۆ بەزاری، بڵێ بەخاڵم

چونکە واتاکەی لە شێوەی یەکەما زۆر کاڵ و کرچە. لە هەردوو چامەکەدا، چ ئەصڵەکە، چ دەستکاریکراوەکە ئێستا هەیە، کە یەکێکە لە نەنگەکانی سەروا.

بەحری طەویلیش بی، ئەی دڵ! هەر پڕە بی لە خـەم!

بەحـری مـەدید و بەسـیطیش بێنە پاڵـیـان بەجـەم

٤- (بەحری وافیر):

بڕوانە: گۆڕانکاری و دەستوورەکانی وافیر، لە لیستی سیازدەدا: چوارەم.

وافیر دەریای یەکەمە لە بازنەی دووەم، دەریای بەکارهاتووی چوارەمی خەلیلییە، لە دەریا سافەکانە، لە بازنەی خۆیدا بریتییە لەم شەش پێیە:

١- مفاعلتن ٢- مفاعلتن ٣- مفاعلتن * ٤- مفاعلتن ٥- مفاعلتن ٦- مفاعلتن

ب- ب ب-: ب- ب ب-: ب- ب ب- * ب- ب ب-: ب- ب ب-: ب- ب ب-

عەرووزنووسانی کورد دەفەرموون: (وافیر لە هۆنراوی کوردیدا هەر زۆر کەمە، بگرە هەر نییە). بەڵام ئەمە کاتێ وایە کە ئەم کێشە: (مفاعیلن مفاعیلن فعولن × ٢) بەهەزەجی مەحذووف دابنرێ، بەڵام ئەم کێشە لە ناو زانا عەرەبەکانیشدا کێشە و بەرەی لەسەرە، جەماوەری عەرووززانانی عەرەبی، ئەم کێشە بەوافیری مەقتوف دادەنێن، بگرە یەکێکە لە زەربە ناودارەکانی، وەک لە دواوە دێ، پایەبەرز مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی بیارەیش بەوافیری مەقتووفی داناوە، بەبۆچوونی بەندەیش بۆ دەوڵەمەندکردنی لکەکانی عەرووزی ئەستوونی کوردی بەوافیر دابنرێ باشتر و ڕاستترە، چونکە مەجزوئی لە هەزەجدا پێویستە، نموونەی وافیری ساخی شەشی (وافر مسدّس سالم تامّ):

چەشُدْ صَنَمَا کە سُویی کەسی بَچَشْمِ رَضَا نَمِی نِگَرِی
زُرَسْمِ جَـفَـا نَمِی گُـذَرِی طَرِیقِ وَفَـا نَمِی سُـپَـرِی

لەت لەتکردنی ئەم دێڕە فارسییە ڕێک دەکاتە شەش جار (مفاعلتن ب - ب ب -).

١- ئەم گۆڕانکارییانە دەچنە سەر وافیر:

١- عەسب ٢- عەقل ٣- نەقس ٤- خەرم ٥- عەزب ٦- قەسم ٧- عەقس ٨- جەمەم ٩- قەتف ١٠- کەف.

شیکردنەوەی ئەم گۆڕان و گۆڕینانە:

١- عەسب بریتییە لە وەستاندنی پیتی پێنجەمی بزواوی (مفاعلتن ب - ب ب -) ئەم پێیە بەعەسب دەبێ بە(مفاعل تن) دەگوێزرێتەوە بۆ (مفاعیلن). لە ناواخنی وافیردا عەسب پەسەندە، وە لە هەموو پێیەکانیدا دروستە، تەنیا لە زەربی یەکەمی عەرووزی دووەمدا نەبێ، تەنانەت لەم زەربەیشدا لە کاتی تەسریعدا عەسب دروستە، ئەگەر عەرووزی دووەم لە سەردێڕدا مەعسووب بوو، لە زەربی دووەمی عەرووزی دووەما عەسب

پێویستە، هەتا جیایی بکرێ لە نێوانی زەربی یەکەم و زەربی دووەمی عەرووزی دووەما، دیسان لەم زەربەیشدا لە کاتی تەسریعدا عەسب پێویست نییە، ئەگەر پێی عەرووزەکەی لە سەردێڕدا ساخ بوو، دروستە زەربەکەیشی بەهۆی تەصریعەوە ساخ بێ. ئەو پێیەی عەسبی وا تیادا، پێی دەگوترێ: پێی مەعسووب، هەروا دێڕ و عەرووز و زەرب، وەک دەگوترێ: عەرووزی مەعسووب، دێڕی مەعسووب... تاد. بڕ: ١٧٧ - عەصب، ١٧٩- عەضب.

٢- عەقل: لابردنی پیتی پێنجەمی بزواوی (مفاعلتن)ە، بەعەقل دەبێ بە(مفاعتن ب- ب-) دەگۆڕدرێ بە(مفاعلن) لە هەموو (مفاعلتن)ێکدا عەقل دروستە.

٣- نەقص: کۆبوونەوەی عەسب و کەفە لە پێی (مفاعلتن)دا، بەعەسب دەبێ بە(مفاعل تن)، (مفاعیلن) بەکەفیش دەبێ بە(مفاعیل ب - - ب) بەبۆری لام و بەس، لە هەموو (مفاعیلن)ێکا نەقس دروستە، بەپێی نەقسکراو دەگوترێ: مەنقوس، بەدێڕەکەیشی دەگوترێ: دێڕی مەنقوس.

٤- خەرم لە وافیردا لابردنی یەکەم پیتی (مفاعلتن) و وەجەڵ (بەدیل)ەکانیەتی، لەسەر ئەم شێوەیە: (بڕ: ١٧٩ - عەضب). (لە «٥»وە تا «٨» زانرا).

٩- قەتف = حذف + عصب لە (مفاعلتن)دا، دەبێ بە(مفاعلتن ــــ مفاعل تن ــــ مفاعل ــــ فعولن) بڕوانە: (٢٣٠ - قطف).

١٠- کەف لە وافیردا لە (عەصب و خەرم)دا ڕابورد. جا وا لە دواوە چەند نموونەیێ لە هۆنراوی عەرەبی و کوردی دەهێنینەوە، تا ببن بەسەرمەشق بۆ هەستیارانی کوردی تازە نەفەس و تازە دەستپێکردوو:

٢- وافیر دوو عەرووز و سێ زەربی هەیە:

* عەرووزی یەکەم تەواوی مەقتوفە، یەک زەربی هەیە وەک خۆی ئاوا: (فعولن × فعولن) -١- وەک:

| | |
|---|---|
| تَوافَرَتِ المَدَائِــحُ في حَبيبٍ | جَميلٍ مَدْحُهُ يُتْلَى فَيَحْلُــو |
| توافرتِلْ: مَدَائحُفِي: حَبِيبِنْ | جَميلنمد: حُهُويُتْلى: فَيَحْلُو |
| ب-ب ب-:ب-ب ب-:ب-- | ب---: ب- - -: ب-- |
| مفاعلتن: مفاعلتن: فعولن | مفاعيلن: مفاعيلن: فعولن |

ئەم خاڵانە لەم نموونەیەدا ڕەچاو دەکرێن:

١- تەواوە، واتە: تامە، مەجزووء نییە، پێی یەکەم و دووەمی ساخە، واتە صەحیح و سالمە، پێی سێیەم و شەشەمی، کە عەرووز و زەربن، قەتفکراون، پێی چوارەم و پێنجەمی مەعصووبن(*) قەتفی عەرووز و زەربی ئەم جۆرە نەگۆڕە.

٢- ئەم نموونەیە وافیری یەکەمە پێویستی بەتەسریع نییە، بەڵام تەقفیە بکرێ جوانە، وەک موعەرری - ڕەحمەتی لێ بێ - لە سەردێڕی هۆنراوێکیدا دەڵێ:

نُفُوسٌ لِلقِيَامَــة تَشْـرَئِبُّ    وَغَــيٌّ في البَطَالة مُلْتَبُّ،،،،

وَإِنَّ النَّاسَ: طِفلٌ أو كَبِيرٌ    يَشِيبُ عَلَى الغِوَايَةِ أوْ يَشِبُّ!

نموونەی ئەم وافیری یەکەمە بەکوردی وەک نامی دەفەرمووێ:

بڵێن بەو دڵبەرە (نامی) غەریبە    گەلێ موحتاجی دەرمانی طەبیبە

هەروا مامۆستا مەلا ڕەشید بەگی بابان - ڕەزای خوای گەورەی لێ بێ - لە بەرگی هەشتەمی (اقتران النيرين)دا، لە لاپەڕە/١٦٧دا دەفەرمووێ:

خوا عەفوم بکە و ڕەحمەت ببێ پێم

لە ژێری سێبەری خۆتا بکەی جێم

بڕوانە: تاجول ئوصول بەکوردی بەرگی هەشتەم لاپەڕە/١٥٩، بۆ ئاگاداری زیاتر لە بارەی ئەم هۆنراوەی مامۆستای بابانەوە.

(ڕوونکردنەوە):

دەڵێین ئەم شیعرانە وێنەی ئەم شیعرانە: دادەنرێن بەوافیر، یا بەهەزەج؟

١- إذَا لَمْ تَسْتَطِعْ شَيْئاً فَدَعْهُ    وَجَاوِزْهُ إلى مَا تَسْتَطِيــعْ

٢- مَنَازِلُ لِــفَـرْتَنى قِفَـــارُ    كَأنَّمَا رُسُومُهَــا سُطُــورُ

٣- لِسَلاَّمَـــةَ دَارُ بِـحَـفِيــرِ    كَبَاقِي الخَلَقِ السَّحْقِ قِفَـارُ

٤- فَطَعْمُ المَوْتِ في أمْرٍ حَقِيرٍ    كَطَعْمِ المَوْتِ في أمْرٍ عَظِيمٍ

---

(*) ئەم شیعرە هی نۆدێییە، ناوی بەحرەکەی وا تیادا (توافَرَتْ) هێمای ناوی بەحرەکەیە، هێمای ژمارە عەرووزی ئەم بەحرە (ب = ٢) کە پێتی کۆتایی (حبیب)ە، هێمای زەربەکانی (ج = ٣) کە پێتی یەکەمی (جمیل)ە، هێمای پێیەکانی ئەم دەریایە (و)ی وشەی (یحلو)ە، کە دەکاتە شەش. لە هەندێ نوسخەدا، نیوەی دووەمی ئەم دێڕە وایە: (جَلاَ بِجَمَالِهِ ظُلُمات جَوّ).

ئەم هۆنراوانە کە بەڕیز لەسەر ئەم کێشانەن:

١- (مفاعیلن مفاعیلن فعولن × ٢).

٢- (مفاعلن مفاعلن فعولن).

٣- (مفاعیل مفاعیل فعولن × ٢).

٤- (مفاعیلن مفاعیلن فعولن × ٢).

هەموو ئەم هۆنراوانە و وێنەی ئەمانە، بەپێی ڕای زانایانی عەرووز لە بەحری وافیرن، زەربی یەکەم لە عەرووزی یەکەم، بەهیچ شێوەیێ لە بەحری هەزەج نین، گەرچی شێخ جەلالی حەنەفی قسەی لە هەزەج بوونیان کردووە، چونکە کێشی شەشی مەقطوف لە وافیردا ئەصڵە. ئەوەندە هەیە کوردەکانی خۆمان وەک فارسەکان ئەم جۆرە کێش و قاڵبانە بەهەزەجی مەحذوف دادەنێن. لە فارسیدا وەک:

دِلاَ دَرْ عِشْقَ رَنْجَهَا کَشِیدِی    کَرَمْ کَرْدِی، وَ زَحْمَتْهَا کَشِیدِی

کە یەکسانە بە(مفاعیلن) شەش جار. وەلێ من وا بەباش دەزانم کە ئەوەی ئەو خەڵکە پێی دەڵێن: هەزەجی شەشی مەحزوف، لە ڕاستیدا وافیری تامی مەقطوفە، بەپێی ئەصڵ، ئەوەک بەپێی زاراوی نوێ.

* عەرووزی دووەم مەجزوئی ساخە، جاروبار عەصب دەکرێ، دوو زەربی هەیە:

١- زەربی یەکەمی عەرووزی دووەم ساخە وەک عەرووزەکەی: (مفاعلتن × مفاعلتن) -٢- وەک:   خَلِيلٌ لِي: سَأَهْجُرُهُ   لِذَنْبٍ لَسْتُ أَذْكُرُهُ

ب- --: ب-ب ب-   ب---: ب- ب ب-

مفاعیلن: مفاعلتن   مفاعیلن: مفاعلتن

وَلـكِنِّـي سَأَرْعَاهُ   وَأَكْتُمُهُ وَأَسْتُرُهُ

٢- زەربی دووەمی عەرووزی دووەم مەعسووبە: (مفاعلتن × مفاعیلن) یا (مفاعیلن × مفاعیلن) - ٣ - وەک:

إذَا أُسْقِي: تُغضْلَتَهُو   مَزَجْتُ بريقه رِيقِي

ب---: ب-ب ب -   مَزَجتبري: قِهي ريقي

مفاعیلن: مفاعلتن   ب-ب ب -: ب---

مفاعلتن: مفاعیلن

لە کاتی تەصریعی ئەم زەربەدا وەک:

وَبَــدْرٍ غيـر ممحـوق    مِنَ العِقْيَانِ مَخْلُوقِ

إذَا أسقيتُ فَضْلَتَهُ    مَزَجْتُ بريقه ريــقي

نموونەیەکی کوردی لە مەجزوئی مەعصووب، وەک شێخ ڕەزا دەڵێ:

عــەرەب ئینکاری فــەزلی ئێــوە ناکــەم فــازیلن ئەمما

صەلاحەددین کە دنیای گرت لەزومرەی کوردی بابان بوو

٣- هەندێ تر دەڵێن عەرووزێ تری هەیە، مەجزووئی مەقطوف یەک زەربی هەیە وەک خۆی: (فعولن × فعولن) وەک:

أشَاقَكَ طَيْفُ مَامَةْ    بِمَكَّةِ أمْ حَمَامَةْ

مفــاعلتن فعولــن    مفاعلتن فعولن

**(پاڵفتەی دەریای وافیر)**

زۆربەی جەماوەری زانایانی کێشناس دەفەرموون:

دەریای وافیر دوو عەرووز و سێ زەربی هەیە:

١- عــەرووزی یەکــەم تەواوی مــەقطووفــە، یەک زەربی هەیە وەک خــۆی، تەواوی مەقطوفە: (فعولن × فعولن) -١-

٢- عەرووزی دووەم مەجزووئی ساخە، جارە جارە عەصب دەکرێ، دوو زەربی هەیە:

١-زەربی یەکەمی ساخە وەک خۆی: (مفاعلتن ب-ب ب-×مفاعلتن ب-ب ب-)-٢-

٢- زەربی دووەمی مەعصووبە: (مفاعلتن ب - ب ب - × مفاعيلن ب ---) -٣-

وەک ئاماژەمان کرد، هەندێ دەڵێن: مەجزووئەکەی عەرووزێکی تری مەقتووفی هەیە، یەک زەربی هەیە، وەک خۆی، وەک ئەم هۆنراوانە:

١- أولئِكَ خَيْرُ قَوْمٍ    إذَا ذُكِرَ الخِيَارُ

مفاعلتن فعولن    مفاعلتن فعولن

٢- عُبَيْلَةُ أنْتِ هَمِّي    وَأنْتِ الدَّهْرَ ذِكْرِي

مفاعلتن فعولن    مفاعيلن فعولن

له شیعری یەکەمدا (مفاعلتن) ساخە، لە دووەمدا دووەمیان مەعسووبە ئەم شیعرە و وەرگەڕاوەکەی لە یەکەمی وافیرن:

وَهَانَ عَلَى سُرَاةِ بَنِي لُؤَيٍّ + حَرِيقٌ بِالْبُوَيْرَةِ مستطيرُ

واتە:

بلـێـســەی ئاگـرێ لە بوویرە بەرزە

سەرۆکی قورەیشی پێ کەوتۆتە لەرزە

کەرتکردنی:

بَلِيْسَيْآ: گِرِيْ لَبُوَيْ: رِبَرْزَا    سَرُوكِقُرَيْ: شِپِيْكَوْتُوْ: تَلَرْزَا

ب---:ب-ب ب-:ب--    ب-ب ب-:ب---:ب--

مفاعیلن: مفاعلتن: فعولن    مفاعلتن: مفاعیلن: فعولن

٥- (بەحری کامیل):

١- بڕوانە: گۆڕانکارییەکانی دەریای کامیل، لە لیستی/١٣ دەدا، پێنجەم.

دەریای دووەمە لە بازنەی دووەم، بریتییە لە شەش جار (متفاعلن ب ب - ب - ب -) دێڕی تەواوی تەواو ساخی دەکاتە: ٧ × ٦ = ٤٢ پیت، سیی (٣٠) بزواو و دوازدەی (١٢) وەستاو. بەتەواوی و بەمەجزووئی بەکار هاتووە.

لە بازنەی خۆیدا شەش پێی هەیە ئاوا:

متفاعلن + متفاعلن + متفاعلن × متفاعلن + متفاعلن + متفاعلن

ب ب-ب-+ ب ب-ب-+ ب ب-ب- × ب ب-ب-+ ب ب-ب-+ ب ب-ب-

(١) (٢) (٣) (٤) (٥) (٦)

لە کوردی و فارسیدا زۆر کەم بەکار هاتووە، شەشی و چوارینی هەیە.

٢- ئەم گۆڕانکارییانە وەردەگرێ:

١- تەی ٢- ئیزمار ٣- وەقس ٤- جەزل (خەزل) ٥- تەرفیل ٦- إذاله (تذییل) ٧- قەطع ٨- حەذەذ ٩- خەبن ١٠- خەزم

شیکردنەوەیان:

١- بەئیزمار (متفاعلن ب ب - ب -) دەبێ بە(مت فاعلن = مستفعلن - - ب -).

٢- کاتێ (متفاعلن)ی ساخ بەئیزمار دەبێ بە(مستفعلن) ئەو کاتە دروستە تەی بکرێ و ببێ بە(مستعلن = مفتعلن -ب ب-) تەی لە (مستفعلن)ی کامیلدا لە هەموویانا دروستە.

٣- وەقس (وقص) لابردنی تێی (متفاعلن)ە دەبێ بە (مفاعلن ب-ب-).

٤- جەزل کۆبوونەوەی ئیزمار و تەی لە (متفاعلن)دا، بەجەزل دەبێ بە(مفتعلن).

٥- تەرفیل بڕوانە (ترفیل) لە نەخشەی سییەمی زیحاف و عیللەتەکاندا.

٦- بۆ تەذییل بڕوانە: نەخشەی/٣ زیحاف و عیلله ماددەی (ازاله).

٧- بەقەطع (متفاعلن) دەبێ بە(متفاعل ـــ فعلاتن ب ب - -) وە (مستفعلن) دەبێ بە(مفعولن).

٨- بەحەذەذ (متفاعلن) دەبێ بە(متفا ـــ فعلن) وە (مستفعلن) دەبێ بە(مستف = فعلن--).

٩- بەخەبن (مستفعلن)ی موزمەر دەبێ بە(متفعلن ـــــ مفاعلن ب - ب -).

١٠- خەزم بڕوانە: (ناچاریەکان/٤١).

نموونەی کامیل لە فارسیدا وەک:

نه دلش زرسم جفاکهی بغلط سبویی و فارود

نه وفای او بروصد جفا زدل جفاکش هارود

شێخ مەعروفی نۆدێ - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - دەفەرمووێ:

کَمُلَتْ مَحَاسِنُ مَنْ بِلَيْلَةِ مَعْرَجِ    طَلَعَ السَّمَاءَ عَلَى البُرَاقِ كَمَا رَوَوْا

پارە پارەکردنی:

١- کَمُلَتْ مَحَا: ٢- سِنُ مَنْ بِلَيـْ: ٣- ـلَةِ مَعْرَجِي

ب ب - ب -: ب ب - ب - : ب ب - ب -

متفاعلن: متفاعلن : متفاعلن

٤- طَلَعَسْسَمَا: ٥- ءَ عَلَلْبُرَا: ٦- قِكَمَا رَوَوْ

ب ب -ب-: ب ب-ب- : ب ب - ب -

متفاعلن: متفاعلن : متفاعلن

ئەم شیعرە هەر شەش پاژ (جوزء)ەکانی ساخە، نە زیحاف و نە عیللەی تیادا نییە. ئاماژەکراوە بۆ ناوی دەریاکە بەوشەی (کَمُلَتْ = کامل) وە بۆ ژمارەی عەرووزەکانی کە سیانن بەجیمی دوا پیتی زەرب کە (معرج)یە، وە بۆ ژمارەی زەربەکانی کە نۆن، بە(ط)ی (طلع) کەوا لە سەرەتای نیوەی دووەمەوە، وە بۆ ژمارەی پاژەکانی کە شەشن بە(و)ەی کۆتایی (رَوَوْ) بڕوانە: (الأَبْجَدِيَّةَ).

٣- کامیل سێ عەرووز و نۆ زەربی هەیە:

عەرووزی یەکەم تەواوە، سێ زەربی هەیە، ئاوا:

١- عەرووزی تەواوی ساخ و زەربی تەواوی ساخ، دروستە یەکێکیان، یا هەردووکیان ئیزمار بکرێن، وە هەروەها هەموو پێیەکانی تری ناواخنی: (متفاعلن × متفاعلن) یا ئاوا (مستفعلن × مستفعلن) - ١ - وەک:

لاَ يَسْلَمُ الشَّرَفُ الرَّفِيعُ مِنَ الْأَذَى    حَتَّى يُرَاقَ عَلَى جَوَانِبِهِ الدَّمُ

لاَيَسْلَمُشْ: شَرَفُرْرَفِي: عُمِنَلأَذَى    حَتْتَايُرَا: قَعَلاَجَوَا: نِبِهِدْدَمُو

--ب-:ب ب-ب-:ب ب-ب-     --ب-:ب ب-ب-:ب ب-ب-

مستفعلن: متفاعلن: متفاعلن     مستفعلن: متفاعلن: متفاعلن

ئەم زەربە پێویستی بەتەصریع نییە، ڕەچاو دەکرێ پێی یەکەمی ئەم دێڕە ئیزمار کراوە، شتی وا لە هەموو پێیەکانی تری ئەم زەربەدا دروستە، بەمەرجێ یەک پێ بەساخی بمێنێ، لە زۆرینەی دێڕەکانی هۆنراوەکەدا، تا ئیلتیباس نەبێ بەرەجەزەوە. جاروبار دروستە لە چامەیەکدا دێڕێ، دووانی، هەموو پێیەکانی موزمەر بن، وەک ئەم هۆنراوەی معلقەکەی عەنتەرە، کە موعەللەقەکە خۆی لە کامیلە:

يَنْبَاعُ مِنْ ذِفْرى غَضُوبٍ جَسْرَةٍ     زَيَّافَةٍ مِثْلَ الفنيقِ المُكْدَمِ

کە یەکسانە بەشەش (مستفعلن). هەروا ئەم شیعرەی تری عەنتەرە:

إنّى أمرُؤٌ مِنْ خَيْرِ عَبْسٍ مَنْصِباًشَطْرِى وَأَحْمِى سَائِرِى بِالمُنصْلِ

یا وەک ئەم شیعرەی ئەحمەد شەوقی:

قُمْ في فَمِ الدُّنْيَا وَحَيِّ الأَزْهَرَا     وَانْثُرْ عَلَى سَمْعِ الزَّمَانِ الجَوْهَرَا

یا وەک ئەم دێڕەی تری شەوقی:

أَيَّامُكُمْ أَمْ عَهْدُ اِسْمَاعِيلا     أَمْ أَنْتَ فِرْعَوْنٌ يَسُوسُ النِّيلاَ

بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ئەم هۆنراوانە کامیلن و ڕەجەز نین، ئەوەیە کە ئەمانە هەریەکەیان دێڕێکن لە چامەیەکی درێژ، هەموو دێڕەکانی تریان کامیلن. کەواتە: لە ناو کۆمەڵە هۆنراوی کامیلدا، دروستە کەمە کەمە، دێڕێ یا دوو دێڕ هەبن، کە گشت پاژ و جوزء و پێیەکانی موزمەر بن، لەسەر کێشی (مستفعلن) بن، بەڵام شتی وا لە سەردێڕ (هەڵاتگە: مەتلەع)دا زۆر ناپەسەندە، لە ئەنگی ئیقعاد دەچێ، چونکە بەدیەن چامەکە، یا پارچە هۆنراوەکە لە ڕەجەز دەکا، کەچی کاتێ دێڕەکانی تری ڕەچاو دەکرێ، لە کامیلن لە ڕەجەز نین، حوکم و بڕیاریش بۆ زۆرینەی دێڕەکانی پارچەکەیە.

ئەوەی جێگەی ئێستە، ئەم دوو شیعرەی شەوقی، هەریەکی سەردێڕی چامەیەکن (بڕوانە: الإقناع/٣٢. الشوقيات/١/٢٠٩ + ١/١٧٥).

نموونەی ئەم زەربە لە کوردیدا، نامی دەفەرمووێ:

ئەو عالیمەی عیلمی ببێ بەمەقامی تۆ

موتەئەککیدم کە ئەگا بەفەیضی کەرامەتت

کەرتکردنی:

اَوْعَالِیْ: عِلْمِی ببی: بَمَقَامِتُو     مُتَأکْکدَمْ: کَأگَا بَفِیْ: ضِکَرَامَتَتْ

--ب-: --ب-: ب ب-ب-     ب ب-ب-: ب ب-ب-:ب ب-ب-

مستفعلن: مستفعلن: متفاعلن     متفاعلن: متفاعلن: متفاعلن

٢- عەرووزی تەواوی ساخ و زەربی مەقتووع، دروستە کە عەرووز و زەربی ئەم زەربە بەئیزمار بکرێن، لە کاتی تەصریعی ئەم زەربەدا عەرووزیش مەقطووع دەبێ - ٢ - ئاوا: (متفاعلن × متفاعل = ب ب - ب - × ب ب - -) یا ئاوا: (مت فاعلن × متفاعل = - - ب - × ب ب - -) یا ئاوا: (مستفعلن × مفعولن) یا ئاوا: (متفاعلن × مفعولن). لە کاتی تەسریعا ئاوا: (متفاعل × متفاعل = ب ب - - × ب ب - -) یا ئاوا (مفعولن × مفعولن). وەک:

حَالَ الزَّمَانُ فَبَدَّلَ اْلآمَـــــالاَ     وکَسَا الْمَشِیبُ مَفَارِقآ وَقْذَا لاَ

حَالَزْزَمَا: نُفَبَدْدَلَلْ: آمَـــالا     وکَسَلْمَشِیْ: بُمَفَارِقَنْ: وَقذا لاَ

--ب-: ب ب-ب-: - --     ب ب-ب-:ب ب-ب-:ب ب--

مستفعلن: متفاعلن: مفعولن     متفاعلن: متفاعلن: متفاعلة

غَنِیَتْ غَوَانِی اْلحَیِّ عَنْكَ وَرُبَّمَا     طَلَعَتْ إِلَیْكَ أَهِلَّةً وَجَمَالاَ

متفاعلن مستفعلن متفاعلــن     متفاعلن متفاعلن متفاعل (فعلاتن)

دەبینین عەرووزی شیعری یەکەم لەبەر تەصریع قەتع کراوە، زەربیش قەتعی ئاساییە، بەڵام لە دێڕەکانی دواتردا، عەرووز تەواوی ساخە، یا تەواوی موزمەرە و زەربیش قەتعکراوە. ڕەچاو دەکرێ کە پێی یەکەمی دێڕی یەکەم و پێی دووەمی دێڕی دووەم ئیزمار کراون، شتی وا ئاساییە و دروستە، بەڵام بگۆڕە نەگۆڕ نییە لەم شوێنانەدا.

٣- زەربی سێیەم: عەرووزی ساخ و زەربی ئەحەذذی ئیزمار کراو، لە کاتی تەصریعی ئەم زەربەدا، عەرووزیش حەذذای ئیزمارکراو دەبێ -٣- ئاوا: (متفاعلن ب ب - ب - × مت فا - - = فعلن) یا ئاوا: (مستفعلن × فعلن) لە کاتی تەصریعا ئاوا (فعلن × فعلن). کاتی تەصریع وەک:

یَوْمُ الْمُحِـــبِّ لِطُـولِــهِ شَهْــرُ     وَالشَّهْرُ یُحْسَبُ أَنَّهُ دَهْــرُ

- -ب -: ب ب - ب-:- -     --ب-:ب ب-ب-:- -

مستفعلن: متفاعلن: فعلــــن    مستفعلن: متفاعلن: فعلن

بِأبِي وَأُمِيً غَادَةٌ في خَـــــدِّهَا    سَحَرٌ وَبَيْنَ جُفُونِهَا سِــحْـرُ

ب ب–ب–:––ب–:– – ب–    ب ب–ب–:ب ب–ب–:––

متفاعلن: مستفعلن:مستفعلن    متفاعلن: متفاعلن: فعلـن

دەبینین هەندێ پێی ئەم دێڕانە، بەبێ دەستنیشان کردن ئیزمار کراون، عەرووزی سەردێڕ لەبەر تەسریع حەذدای ئیزمار کراوە، عەرووزی شیعرەکانی دواتر تەواون، سا یا ساخن ئاوا (متفاعلن) یا ئیزمار کراون، ئاوا: (مستفعلن) بەڵام زەرب هەمیشە ئەحەذدی ئیزمار کراوە. نموونەی کوردی بۆ ئەم زەربە لەگەڵ تەصریعدا:

له شەوا خەیاڵ و خەفەت یەخەم دەگرن

ئێشکم بەجووتە هەتا شەبەق دەگرن

عەرووزی دووهەم حەذذائە دوو زەربی هەیە:

١- زەربی یەکەم: عەرووزی حەذذاء و زەربی ئەحەذذی ئیزمار کراو – ٤ – (متفا ب ب – × مت فا – –) لە کاتی تەصریعدا عەرووزیش ئیزمار دەکرێ: (مت فا – – × مت فا – –). وەک:

عَيْنَيَّ كَيْفَ غَرَرْتُمَا قَلْبِي    وَأبَحْتُمَاهُ لَوْعَــةَ الْحُــــبِّ

يَا نَظْرَةً أزْكَتْ عَلَى كَبَدِي    نارآ قَضَيْتُ بِحَرِّهَا نَحْبِي

کرتکردن:

عَيْنَيّ كَيـ: فَغَرَرْتُمَا: قَلْبِي    وَأبَحْتُمَا: هولَوْعَتَـلْ: حُبْبِـيْ

––ب–: ب ب–ب–: ––    ب ب–ب–: – –ب–: – –

مستفعلن: متفاعلن: فعلن    متفاعلن: مستفعلن: فَعْ لُـنْ

يَانَظْرَتَنْ: أزْكَتْعَلَى: كَبَدِي    نَارَنْ قَضَيْ: تُبِحَرْرِهَا:نَحْبِيْ

––ب–: ––ب–: ب ب –    مستفعلن: ب ب–ب–: ––

مستفعلن: مستفعلن: متفا    – –ب–: متفاعلن: فَعْ لُنْ

دەبینین لە سەردێڕدا عەرووز لەبەر تەصریع کراوە بەحەذذائی موضمەر (متفاعلن ـــ مت فا ـــ فع لن = – –) بەڵام لە دێڕەکانی تری دوایەوە عەرووز و حەذذایە و بەس، بەڵام

زەرب لە هەموو دێڕەکانا ئەحەذذی موزمەرە (مت فا = فع لن - -).

٢- زەربی دووەم: عەرووزی حەذذای ناموزمەر و زەربی ئەحەذذی ناموضمەری وەکی خۆی - ٥ - ئاوا: (متفا ب ب - × متفا ب ب -). پێویستی بەتەصریع نییە، وەک:

يَا نَفْسُ خَافِي اللّهَ وَاتَّئِدي وَاسْعَيْ لِنَفْسِكَ سَعْيَ مُجْتَهِد

مَنْ كَانَ جَمْعُ المَــالِ هَمَّتَهُ لَــمْ يَخْــلُ مِنْ هَــمٍّ وَمِنْ كَمَــد

يَا طَالِبَ الدُّنْيَا لِيَجْمَعَهَـا جَمَحَتْ بِكَ الآمالُ فَاقْتَصِــدِ

کەرتکردن:

يَانَفْسُخَا : فِلْلاَهَ وَتْ: تَئِدِي وَسْعَيْلِنَفْ: سِكَسَعْيَمُجْ: تَهِدِي

--ب-: --ب-: ب ب - --ب-: ب ب -ب-:ب ب-

مستفعلن: مستفعلن: متفا مستفعلن : متفاعلن : مُتَفَـا

لەم هۆنراوانەدا هەموو عەرووز و زەربەکان لەسەر کێشی (متفا = فعلن = ب ب -)ن، واتە: ئەحەذذی ناموزمەرن. هەروا ڕەچاو دەکرێ زۆر لە پێیەکانیان موزمەرن، دێڕی یەکەم لە چوار پێی تەواو (متفاعلن) سیانیان موزمەرن (مستفعلن = مت فاعلن). دێڕی دووەم، غەیری عەرووز و زەرب، هەموو پێیەکانی موزمەرن (مستفعلن). دێڕی سێیەمیش یەک (متفاعلن)ی ناموزمەری وا تیادا، شتی وا دروستە، بەمەرجێ نیشانەیێ هەبێ کە شیعرەکە سەر بەبەحری کامیلە.

**(مەجزووناتی کامیل):**

عەرووزی سێیەم: مەجزووئی ساخە، چوار زەربی هەیە:

١- زەربی یەکەم: عەرووزی مەجزوئی ساخ و زەربی مەجزوئی مورەففەل (٦) ئاوا: (متفاعلن × متفاعلاتن) وە دروستە هەردوو لا ئیزمار بکرێن، ئاوا: (مستفعلن × مستفعلاتن). لە کاتی تەصریعدا عەرووزیش مورەففەل دەکرێ ئاوا (مستفعلاتن × مستفعلاتن) یا (متفاعلاتن × متفاعلاتن).

نموونەی تەصریعکراوی ئەم زەربە وەک ئەحمەد شەوقی دەڵێ:

سَلْ (يَلْدَزاً) ذَاتَ القُصُورِ هَلْ جَاءَهَا نَبَأُ البُدُورِ؟

لَوْ تَسْتَطِيعُ إجَابَةً؟ لَبَكَتْكَ بِالدَّمْعِ الغَزِيرِ

ذَهَبَ الجَميعُ فَلاَ القُصُو... ... رُ تُرى وَلاَ أَهْلُ القُصُورِ
فَلَكٌ يَدُورُ سَعُودُهُ وَنَحوُسُهُ بيَدِ الُمدِيرِ
سَلْيَلْدَزَنْ: ذَاتَلْقُصُو: رى هَلْ جَا ءَهَا: نَبَاْلبُدُو: رى
--ب-: --ب-: - --ب-: ب ب-ب-: -
مستفعلن: مستفعلن: تن مستفعلن: متفاعلن: تن

لەم سەردێڕەدا بۆ تەصریع عەرووز تەرفیل کراوە، بەڵام لە دێڕەکانی تری پاش سەردێڕ تەنیا زەرب تەرفیل کراوە، وەک:

لَوْ تَسْتَطِيـ: عُ إجَابَتَنْ لَبكَتْكَ بِلْ: دَمْعِلْغَزِيـ: رى
--ب-: ب ب-ب - ب ب-ب-: - - ب-: -
مستفعلن: متفاعلـن متفاعلن: مستفعلن: تن = مستفعلاتن = مُرَفَّل.

٢- زەربی دووەم: عەرووزی مەجزووئی ساخ و زەربی مەجزووئی موذال - ٧ - ئاوا: (متفاعلن × متفاعلات = ب ب-ب- × ب ب -ب-ْ) دروستە هەردووکیان ئیزمار بکرێن ئاوا: (مستفعلن × مستفعلاتْ). لە کاتی تەصریعدا عەرووزیش موزەییەل دەکرێ، وەک:

قُولوا لە روحی فِـدَاهْ هذا التجنِّی مَا مَدَاهْ
قُولُولَهُوْ: روحی فِداهاذتتجن: نیما مَدَاهْ
--ب -: - - ب -ْ - - ب -: --ب-ْ
مستفعلن:مستفعلات مستفعلن: مستفعلاتْ = مستفعلان

بڕوانە: چەند نموونەیەک لە هۆنراوی عەرەبی و کوردی ریدفدار لە قافیەدا، دەبینی لە پاش سەردێڕ، عەرووز موزال نییە.

٣- زەربی سێیەم: عەرووزی مەجزووئی ساخ و زەربی مەجزووئی ساخ وەک خۆی - ٨ -، دروستە کە یەکێکیان یان هەردووکیان ئیزمارکراو بن، ئاوا: (متفاعلن × متفاعلن) یا (مستفعلن × متفاعلن) یا (متفاعلن × مستفعلن) یا (مستفعلن × مستفعلن). ئەم زەربە پێویستی بەتەصریع نییە، لە عەرەبیشدا زۆر کەم شیعری پێ گوتراوە، نموونەکان:
(١- متفاعلن × متفاعلن) وەک:

قُلْ مَا بَدَا لَكَ وَافْعَلِ     وَاقْطَعْ حِبَالَكَ أوْصِلِ

مستفعلن متفاعلـن     مستفعلـن متفاعلن

(٢- مستفعلن × متفاعلن) وەک:

لاَ تَـأمَنِ الـدُّنْيـا     الدُّنيَّةَ أنَّهَا شَرَكُ الرَّدى

مستفعلن مستفعلن     متفاعلـن متفاعلـن

(٣- متفاعلن × مستفعلن) وەک:

إنْ لَمْ أفُزْ بِلُبَانَتِـي     ضَيَّعْتُ في الصَّيْفِ اللَّبَنْ

مستفعلن متفاعلن     مستفعلـن مستفعلـن

(٤- مستفعلن × مستفعلن) وەک:

وكَفَاكَ مَـاجَـرَّبْتَـهْ     حَسْبُ امْرِئٍ مَاجَرَّبـا

متفاعلن مستفعلن     مستفعلن مستفعلن

٤- زەربی چوارەم: عەرووزی مەجزووئی ساخ و زەربی مەجزووئی مەقطووع - ٩ - لە کاتی تەصریعا عەرووزیش قەطع دەکرێ، دروستە زەرب و عەرووزی ئەم زەربە دروستە مضمر بێ ناوا: (متفاعلن × فعلاتن) یا (فعلاتن × فعلاتن) یا (مستفعلن × فعلاتن) یا (متفاعلن × مفعولن) یا (مستفعلن × مفعولن). نموونەکان:

(١- متفاعلن × فعلاتن) وەک:

يَا مَنْ رَأى رَجُـلاً     يبيع صَلاَحَهُ بِفَسَادِ

مستفعلن متفاعلن     متفاعلن فعلاتـن

(٢- فعلاتن × فعلاتن) وەک:

وَيلي عَلى خفرات     مِثْلَ الدُّمى غَنَجَاتِ

مستفعلن فعلاتن     مستفعلـن فعلاتـن

(٣- مستفعلن × فعلاتن) وەک:

كُلُّ أمرِئٍ مَهْمَا تَحَصْ     صَنَ لِلرَّدَى سَيَمُوتُ

مستفعلن مستفعلـن     متفاعلن فعـلاتن

(٤- متفاعلن × مفعولن) وەک:

أيْنَ الَّذينَ تَسَابَقُــوا   في المَجْدِ لِلْغَايَاتِ

مستفعلن متفاعلن   مستفعلن مفعولـن

(٥- مستفعلن × مفعولن) وەک:

قَوْمٌ بِهِمْ رُوحُ الحَيَـــا   ةِ تُرَدُّ لِلأَمْـــوَاتِ

مستفعلن مستفعلن   متفاعلن مفعولن

چەند نموونەیێ لە کامیل، کە زۆر ناودار نین، گەرچی زۆر کەمن بەڵام هەن، واتە: چەند نموونەیەکی تایبەتی:

آ- دێڕی وا هەیە لە کامیلدا هەموو پێیەکانی ئیزمار کراوە، لە پێشەوە ڕابورد (بڕوانە: عەرووزی تەواوی ساخ و زەربی تەواوی ساخ).

ب- دێڕی وەقص کراو: بەیتی مەوقوص (هەموو پێیەکانی - مفاعلن - بێ) وەک:

يَذُبُّ عَنْ حَرِيمِـهِ بِسَيْفِـهِ   وَرُمْحِهِ وَنَبْلِـهِ وَيَحْتَـمِي

مفاعلن مفاعلن مفاعلن   مفاعلن مفاعلن مفاعلن

ج- دێڕی خەزل کراو: بەیتی مەخزول (مجزول = مفتعلن) وەک:

مَنْزِلَةٌ صُمٌّ صَدَاهَا وَعَفَتْ   أرسُمُهَا إنْ سُئِلَتْ لَمْ تُجِبِ

مفتعلن مفتعلن مفتعلن   مفتعلن مفتعلن مفتعلـــن

د- دێڕی مەوقوصی مورەففەل (مفاعلاتن) وەک:

وَلَقَدْ شَهِدْتُ وَفَاتَهُمْ   وَنَقَلْتُهُمْ إلَى المَقَابِرْ

متفاعلن متفاعلـــن   متفاعلن مفاعلاتن

هـ- دێڕی مەجزووئی مەجزوولی مورەففەل (مفتعلاتن) وەک:

صَفَحُوا عَنِ أبْنكَ إنَّ فِي ابْــ   نِكَ جِدَّةً حِيْنَ يُكَلِّمُ

متفاعلن متفاعلن   متفاعلن مفتعلاتن

و- دێڕی موزمەری موذال (مستفعلان):

وَإِذَا أغْتَبَطْتُ أوِ أبْتَأسْتُ حَمِدْتُ رَبَّ العَالَمِيْنْ

متفاعلـــن متفاعلـــن   متفـاعـلـن مستفعـلان

**(پاڵفتەی دەریای کامیل):**

زۆربەی زانایانی کێشناس دەفەرموون:

دەریای کامیل سێی عەرووز و نۆ زەربی هەیە:

عەرووزی یەکەم تەواوە، سێ زەربی هەیە:

١- زەربی یەکەم تەواوە، وەک عەرووزەکەی: (متفاعلن × متفاعلن = ب ب -ب- × ب ب -ب-) - ١ -

٢- زەربی دووەم مەقطوعە: (متفاعلن × فعلاتن = ب ب -ب- × ب ب --)-٢-

٣- زەربی سێیەم ئەحەذذی موزمەر: (متفاعلن × فعلن = ب ب -ب- × - - -)-٣-

عەرووزی دووەم حەذذایە، دوو زەربی هەیە:

١- زەربی یەکەم: ئەحەذذی موزمەر (فعلن × فع لن = ب ب - × - - -) -٤-

٢- عەزووزی حەذذای ناموزمەر و زەربی ئەحەذذی ناموضمەری وەک خۆی: (فعلن × فعلن = ب ب - × ب ب -) -٥-

عەرووزی سێیەم: مەجزووئی ساخە، چوار زەربی هەیە:

١- زەربی یەکەم: عەرووزی مەجزووئی ساخ و زەربی مەجزووئی مورەففەل: (متفاعلن × متفاعلاتن = ب ب -ب- × ب ب -ب- -) -٦-

٢- زەربی دووەم: عەرووزی مەجزووئی ساخ و زەربی مەجزووئی موذال: (متفاعلن × متفاعلان = ب ب -ب- × ب ب - ب -ْ) -٧-

٣- زەربی سێیەم: عەرووزی مەجزووئی ساخ و زەربی مەجزووئی ساخ وەک عەرووزەکەی: (متفاعلن × متفاعلن = ب ب -ب- × ب ب -ب-) - ٨ -

٤- زەربی چوارەم: عەرووزی مەجزووئی ساخ و زەربی مەجزووئی مەقطووع: (متفاعلن × فعلاتن = ب ب -ب- × ب ب - -) - ٩ -

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمنِ الرَّحيمِ

لێرەدا کورتەیەکی پوخت، سەبارەت بەهۆنراوی کێشی برگە تۆمار دەکەین، نەبادا بەشەکانی تری ئەم کتێبە کەم وێنەیە، لە ئەدەبی کوردیدا، دوا بکەوێ. تکایە ئەم بابەتانە ڕەچاو بکەنەوە، کە پەیوەندییەکی تەواویان بەم بەشەوە هەیە:

(بڕوانە: ناچاری ژمارە: ٣، ٤١ - تێبینی، ٦٢ - ج، ٦٥، ٨٥ - تێبینی -٣، ٩٩ - آ، ٣/١٠٢، باسی نووسینی عەرووزی، هەندێ تایبەتی ڕێنووسی کوردی، برگە، برگەی کورت، برگەی درێژ، برگەی کوردی «چەند تێبینییەک»، کێشی برگەیی، مامەڵەکردن لەگەڵ هەمزەدا).

جا پاش ئەمە بزانن کە لە هۆنراوی کێشی پەنجەییشدا زۆر لەو گۆڕانکارییە ناچاری و نا ناچارییانەی، کە لە پێشەوە ڕابووردن دروستن، بەتایبەتی ئەوانەیان کە پەیوەندییان بەزمانی کوردییەوە هەیە، ئیتر چ بۆ سافی و ڕەوانی کێش بن، وە چ بۆ ڕاستکردنەوەی کێش بن، وە یا بۆ ڕێکخستنی سەروا و شتی وا بن.

نموونەی سافکردنی کێش وەک گۆران - ڕەحمەتی لێ بێ - دەڵێ (دەیی):

کام بەرزی جوانە وەک بەرزیی باڵای    کام تیشک نەگاتە تیشکی نێو نیگای

ئەوەتا لە نیوەی دووەمی ئەم دێڕەدا، گیرییەک هەست پێ دەکرێ، جا بۆ سافی و خۆش لە زاری و لەسەر زمان سووک بوونی کێشەکە، وا باشە (ئە) لە وشەی (ئەگاتە)دا، لەسەر ئەم شێوەیە سووک بکرێ: بزوێنەکەی - کە سەرە - بگوێزرێتەوە بۆ پیتە بێ بزوێنەکەی پێش خۆی، کە کافی وشەی (تیشک)ە، ئەوجا هەمزەکە خۆی لابرێ ئاوا: (تیشک نەگاتە = -ْ ب - ب) ـــ (تیشکەگاتە = - ب - ب).

نموونەی ڕاستکردنەوەی کێش، وەک دیسان گۆران دەڵێ (حەوتی):

تینی دڵەی پڕ جۆشم    بزوێنی بیر و هۆشم

هەستیار بێژەی (بزوێنەر)ی کورت کردۆتەوە و کردوویەتی بە(بزوێن)ی، هەتا برگەکانی هەردوو لەتە دێڕەکە بەرابەر و یەکسان بن. چونکە ئەگەر بێژەی (بزوێنەر)ی سووک نەکردبایە، لەتی دووەمی دێڕەکە برگەیەکی پتر دەبوو، لەبەر ئەوە لەنگ دەبوو، وە ئاوا دەبوو:

تی نی د لەی: پڕ جۆ شم    بز وێ نە ری: بی رو هۆ شم

- - ب -: - - - -    - ب - - : - - - - -

١ ٢ ٣ ٤ : ١ ٢ ٣    ١ ٢ ٣ ٤ : ١ ٢ ٣ ٤

١ ٢ ٣ ٤ : ٥ ٦ ٧    ١ ٢ ٣ ٤ : ٥ ٦ ٧ ٨ = ٧ + ٨ = لەنگ

دێڕەکە بەپێی کێشەکەی یەکسانە بە(٧ × ٧) = ١٤، ئاوا دابەش دەکرێ:

تی نی د لەی: پڕ جۆ شم    بز وێ نی بی: رو هۆ شم

- - ب -: - - - -    - - - - -: - - -

١ ٢ ٣ ٤ : ١ ٢ ٣    ١ ٢ ٣ ٤ : ١ ٢ ٣

١ ٢ ٣ ٤ : ٥ ٦ ٧    ١ ٢ ٣ ٤ : ٥ ٦ ٧ = ٧ × ٧ = ڕاست

سەلامیش - ڕەحمەتی خودای لێ بێ - بۆ ڕاستکردنەوەی سەروا بێژەی (نایێ)ی کردووە بە(نایە) بڕوانە: (ناچاری/٩٩، ٦٥) هەروا بڕوانە ناچاری: (٨٥، ٩٠، ١٠١/ ٩ - د، ١٠٢/٣) هەروا بڕوانە: ئەم بابەتانەیش: (٦ - الف - ٥ + ٥٤ - حرف + ٧٥ - تخفیف + ٩٦ - راء + ١١٩ - إسباغ + ١٢٠ - سجع + ١٣٨ - تشطیر + ١٥٤ - الضرب + ١٨٩ - المعمًّى + ٢٤٣ - (قافیة - سەروا).

بزانن هۆنراوی ژمارەییش ئەم جۆرە بابەتانەی هەیە: دێڕ، نیوە دێڕ، سەردێڕ، شادێڕ، تاک، مەسنەوی، جووت سەروا، پارچە، غەزەل، چامە، چوارینە، پێنجینە، تەخمیس، تەشطیر، تەسمیط، تەضمین، مەتەڵ، حالی، مربّع، عاطل، مؤرّخ، مشجُّر، سیاسی، کۆمەلایەتی، ئایینی، مطلق، مقیّد، ساف و ڕەوان، ڕێک، چەوت و لەنگ، نەنگی سەروا، سەروا، پیتەکانی سەروا، عەرووز، ناواخن، زەرب، صەدر، عەجز، بەحر، بەحری سادە، بەحری تێکەڵ، هۆنراوی فێرکاری، پێ،... تاد، وە هەر بابەتێ لەمانەیش دەستووری تایبەتی خۆی هەیە، کە هەیانە دەق وەک دەستوورەکانی بەشی هۆنراوی عەرووزی وایە، هەیانە جیایە، بەهەرحاڵ ئەم کورتەیە جێگەی ئەو وردەکارییە نییە.

کێشی بڕگە ئەم کێشانەی هەیە:

(٥، ٦، ٧، ٨، ٩، ١٠، ١١، ١٢، ١٣، ١٤، ١٥، ١٦، - ١٩). بەکێشی بڕگەیی دەیشگوترێ: بەحری بڕگەیی، وەک: بەحری دە بڕگەیی، دەریای هەشت پەنجەیی، کێشی حەوت بڕگەیی، بەحری حەوت پەنجەیی... تاد.

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە، کە ئەم پرسیارە بکەین بەدەروازەیە، بۆچوونە ناو بابەتەکە:

(هۆنراو چییه؟!).

هۆنراو بریتییه له گوتاری هه‌ڵبژارده، که خاوه‌نی واتای جوان و کێشی ڕه‌وان و سه‌روای شایان بێت. جا گوتار له ڕسته دروست ده‌بێ، ڕسته‌یش له وشه و بێژه دروست ده‌بێ، وشه‌یش له پیت و بزوێن دروست ده‌بێ، پیتیش بزواو و وه‌ستاوی هه‌یه، بێ ده‌نگ و ده‌نگداری هه‌یه، بزوێنیش کورت و درێژی هه‌یه، بزوێن و پیته بزوێنی هه‌یه، بڕوانه: باسی بڕگه‌ی کوردی. کاتێ ئه‌مانه‌مان زانی ده‌زانین شیعر چییه.

له ڕاستیدا شیعر، له سه‌ددا نه‌وه‌د و نۆی به‌هره‌یه، زۆرینه‌ی هه‌ستیاره گه‌وره‌کان به‌سروشت هه‌ستیارن، به‌ره به‌ره لێویان ده‌بێ به‌مه‌قه‌ست، به‌ڵام ئه‌وه واتای وا نییه که هه‌ستیار پێویستی به‌زانستی کێشناسی نییه، به‌ڵکو هه‌ستیار به‌هۆی زانست و هونه‌ری کێشزانییه‌وه، ده‌توانێ په‌ره و گه‌شه به‌مه‌له‌که‌ی شیعر گوتن بدات و هۆنراوی باشتر ببێژێ، هه‌روه‌ک چۆن له ڕێگه‌ی شاره‌زابوونی ته‌واو، له موفره‌دات و بێژه‌کانی زمان و، له ڕێگه‌ی به‌کارهێنانی تشبیه و إستعاره و کنایه و حقیقه‌ت و مجاز و عیلمی به‌دیع و عیلمی مه‌عانه‌وه ده‌توانێ هۆنراوی به‌رزتر و جوانتر و ناسکتر بڵێ.

جا وا ئێستا به‌یارمه‌تی خودای مه‌زن، ده‌ست ده‌که‌ین به‌مه‌به‌ست له‌م بابه‌ته، وه ڕیز له کێشه په‌نجه‌ییه‌کان ده‌گرین، له به‌حری یه‌که‌مه‌وه ده‌ست پێ ده‌که‌ین، که ده‌ریای پێنج بڕگه‌یه (گه‌رچی هه‌ندێ کێشی سێ بڕگه‌یی و چوار بڕگه‌ییشیان داناوه):

١- کێشی (پێنج بڕگه‌یی -٥/ب) زۆر که‌مه، زۆرتر له زێنی ئه‌و چامانه‌دا هه‌یه، که به‌کێشی ڕه‌نگاوڕه‌نگ هۆنراونه‌ته‌وه (بڕ: ٥٢ - تحريد).

جارێ پێناسه‌ی کێش ده‌که‌ین:

(کێش: بریتییه له دابه‌شکردنی چه‌ند بڕگه‌یه‌کی یه‌کسان، یا جیاواز، له کورت و درێژیدا، به‌سه‌ر چه‌ند پێیه‌کی چوونیه‌ک، یا جیاوازدا، له چه‌ندی و چۆنێتی بڕگه‌کانیاندا، که له نێوانی پێیه‌کاندا، یا له پاشیانه‌وه، پشوودانێ، یا له‌نگه‌رێ هه‌بێ، که له‌سه‌ر یاسایه‌کی ناسراو، به‌و بڕگه و پێیانه، دێڕه هۆنراوێکی ڕه‌وانی وا دروست ببێ، که بیسه‌ر یه‌کسه‌ر هه‌ست بکا که ئه‌وه هۆنراوه، په‌خشان نییه).

بۆ نموونه‌ی پێنج بڕگه، ئه‌م هۆنراوه‌ی گۆران - ڕه‌حمه‌تی خودای لێ بێ - ده‌هێنینه‌وه، که ده‌وری یازده دێڕه، له پاشا شی ده‌که‌ینه‌وه، ده‌ڵێ:

ئـا ئـەم عێراقــە دوڕگەی واق واقە!
سەری سابــاقــە بنی وڕاقە!
هەم جێی نیفاقە هەم بێ تفاقە!
پایەی وەک فاقە بۆ واقە واقە!
کام گەورەی تاقە کەری دوو لاقە!

(بڕوانە: دیوانی گۆران/ ١٩٨٠ ل - ٣٩٥).

ئەم هۆنراوانە جوانترین نموونەن بۆ کێشی (٥ × ٢) گەرچی جۆرە تەسمیطێکی وایان وا تیـادا، کـە بۆنی دە بڕگـەیی تەسـمـیـتکراویان لێ بێ، بەڵام ڕاسـتـتـر ئەوەیە کـە پێنج پەنجەییین، نەوەک دەیی، بۆنی ئەوەشیـان بەباشی لێ دێ کە مەشتوری پێنج بڕگەیی بن، یا منهوکی پازدە بڕگەیی بن (بڕ: ٢٢ - البیت - ٤ + ٦).

ئێستا بەپێی بڕگەکان ئەم دێڕەیان پێ پێ و دابەش دەکەین:

کام گەو رەی تا قە کە ری دوو لا قە

ـْ - - - ب ب - ب - - - ب

١ ٢ ٣ ٤ ٥ ١ ٢ ٣ ٤ ٥ = ٥ × ٥ = ١٠ = ڕاست

دەبینین دێڕەکە بریتـیـیە لە دوو پێ، هەر پێـیەک لە پێنج بڕگە پێک هاتووە، بڕگـەکان وەک یەک نین، هەیانە کورتە، هەیانە درێژە، وەستـان و پشـوو لە پاش پێی یەکەم یەکسەر دێ. ئەمەیش نموونەیەکی تری ئەم کێشەیە، کە گۆران دەڵێ:

ئەی بەرخۆڵەکە! نەرم و نـۆڵـەکـە!
سپی و خـرپنی وەک کولووی لۆکە!

ئەم شـیـعـرانەی گـۆران چوار چوارینەن، لە جـۆری چوارینەی خـەسـاو (بڕ: دیوانی گۆران/ ١٩٨٠ ل - ٤٢٦). وەک لەسەر باسی (کێشی بڕگەیی)دا، ڕوونمان کردەوە: دەبوو پێنج بڕگـەیی ناوی دە بڕگەیی بووایە، شەش بڕگەیی ناوی دوازدە بڕگەیی بووایە، حەوت بڕگـەیی ناوی چواردە بڕگەیی بووایە... هەروا کێشـە بڕگـەییـیـەکـانی تریش... بەڵام مـادام بەحەوت بڕگەیی و هەشت بڕگەیی و... تاد، ناوبانگیـان دەرکردووە، پێـویست ناکا ناوەکـان بگۆڕین.

٢- کێشی شەش برگە (٦/ب) ئەم جۆرە کێشەیش کەمە، زۆرتر لە ناو کێشی ڕەنگاوڕەنگا هەیە، گۆرانی ڕەحمەتی لە هەڵبەستی ئاواتی دووریدا، کە ئەمە کۆپلەیەکێتی:

ئەی خاطیراتی عومری گوزەشتەم، دەخیلی تۆم
خنکاوی بەحری دووری، نەکەی عەشقی ڕەنجەڕۆم
جیلوەت لە چاوم ون نەبێ
هەرگیز لای تۆ نووستن نەبێ
چەشنی ئاوێنە
دائیم بنوێنە:
عەشقی قەدیمی یار
تا وەختی ئیحتیضار

گۆران لەم هەڵبەستەدا - کە پێنج پارچەی ئاوایە، کە ئەمەی نووسیمان دوا پارچەیانە - چوار بابەتە کێشی بەکار هێناوە، هەر پارچەیەی چوار دێڕە، هەر دێڕەی لەسەر کێشێکە، مامۆستا مەعروف خەزنەدار، سەبارەت بەم چوار بابەتە کێشە ئاوای بۆ دەچێ: دێڕی یەکەم چواردە هیجاییە، دووەم هەشت هیجاییە، سێیەم پێنج هیجاییە، چوارەم شەش هیجاییە. نرخشناسی بەجۆرێ تر دەڵێ (ل - ١٢٩) مامۆستا عبدالرزاق بیمار بەجۆرێ تر دەڵێ (ل - ٢٤). بەهەرحاڵ نموونە هێنانەوە، بەنموونەی هەڵە، بەمەرجێ بابەتەکە ڕوون بکاتەوە دروستە، لەسەر ئەم بنیاتە، ئەم هەڵبەستە فرە ڕەنگەی گۆران دەست دەدا بۆ کێشی (٨ - ب + ٥ - ب + ٦ - ب).

٣- کێشی حەوت برگەیی (٧/ب) بریتییە لە دوو پێ، زۆرینەی کات یەکەمیان چوار برگەیە و دووەمیان سێ برگەیە (٤ + ٣) وا دەبێ بەپێچەوانەوەیە (٣ + ٤). وا دەبێ پێیەکان ئاوا دەبن: (٢، ١ + ٢، ٢ = ٣ + ٤) یا (٢، ٢ + ٣ = ٤ + ٣) یا بەشێوەی تریش، بەڵام ئەم جۆرە وردەکارییە با بمێنێ بۆ کاتی باسی کێشی دەیی.

کامەران موکری - بەڕەحمەت بێ - لە هۆنراوی (گۆرانی من)دا - دیوانەکەی لاپەڕە/ ٧٥ دەڵێ (٧/ب):

| | |
|---|---|
| لێوی خەفەت لێ نیشتووم | یا ڕووی ژاکاوی زەرد بووم |
| وەک گەڵای زەرد، دیاری بێ | مووچەم هەر دارکاری بێ |
| ڕێگەم بەداو تەنراو بێ | دڵم کپ و گوشراو بێ |

دەبێ ئەو ڕاستییەمان هەمیشە لە بەرچاو بێ، کە دابەشکردنی دێڕ بەسەر ژمارەی پێیەکانی ناویدا، دەبێ بەپێی ژمارەی جێگە پشوو و جێگە لەنگەرەکانی ناو دێڕەکە بێ. جا دۆزینەوە و دیاریکردنی ئەم شوێنانە، لە ناو دێڕ و لەتە دێڕەکانا، هەروا کارێکی ئاسان نییە، بەڵکو پێویستی بەڕیزکردنی بڕگەکانە، لە ناو پێیەکانیاندا، بەشێوەیەکی لێزانانە، دەنا شیعرەکە لەنگ دەبێ، ئەم هۆنراوە لە جۆری جووت سەروایە.

نموونەیێ تر، پیرەمێرد - بەڕەحمەت بێ - دەڵێ:

نەسرینە گوڵ، نەسرینە   چووزەرەی یاسەمینە

خنجیلە، خوێن شیرینە   کەیفی لە هەڵپەڕینە!

ئەم هۆنراوە چوارینی تەواوە، ڕوباعی خالیصە، ئاوا دەکێشرێ:

نەس ری نە گوڵ: نەس ری نە   چوو زە رەی یا: سە می نە

- - ب -: - - ب - - ب - -: ب - ب

١ ٢ ٣ ٤: ١ ٢ ٣ ١ ٢ ٣ ٤: ١ ٢ ٣

١ ٢ ٣ ٤: ٥ ٦ ٧ ١ ٢ ٣ ٤: ٥ ٦ ٧ = ٧ × ٧ = ١٤

دیسان گۆران لە هۆنراوی (هاوڕێم بێ کەس)دا، کە هۆنراوێکی جووت سەروایە، دەڵێ (٧/ب):

ئەی فریشتەی شیعری جوان   کۆستی کەوتووی هەردووکمان

بۆ ئەم جارە بێ کەسە   کە وتمان بێ کەس، بەسە

(أ. ب. هەوری) دەڵێ (٧/ب):

جەژنی دار و درەختە   کۆتایی ڕۆژی سەختە

ڕاپەڕە ئیمرۆ جەختە   نەمام بنێژە، وەختە

٤- کێشی هەشت بڕگەیی (٨/ب) چەند تایبەتمەندییەکی ئەم کێشە:

آ- کێشی هەشت بڕگەیی زۆر باوە، بەتایبەتی لە گۆرانی و فۆلکلۆری کوردیدا، بگرە ئەوەندەی کێشی دەیی برەو و باوی هەیە، دوور نییە کە هەشت بڕگەیی لە دە بڕگەیی کۆنتر بێ.

ب- دێڕی هەڵبەستی ئەم کێشە لەسەر دوو پێی چوار بڕگەیی × ٢ دەڕوا، ئاوا: (٤ + ٤ × ٤ + ٤) = ٨ + ٨ = ١٦ = ٨ بە ٨.

ج- زۆرتر هۆنراوی هەشتی، لە گۆرانیدا سێ نیوە دێرە، وەستان لە ناوەڕاستی هەردوو لەتە دێڕ و لە ناوەڕاستی دێڕ و لە کۆتایی دێڕدا هەیە. وەک (٨/ب):

چاوت ڕەشە. بەخومارەوە    مەمکت سێوە. بەدارەوە

خودا داویە. مەیشارەوە

دوا دێڕی ئەم بەرگە با ئەم دێڕە شیعرە بێ کە دەڵێ (ڕەمەل):

ئەی وەطەن مەفتوونی تۆم و شێوەتم بیرکەوتەوە

کاتی دیلیی و ئەسارەت پێ بەتەوق و کۆتەوە

تەواو

## پێرست